٧٣

ئاداری / ١٩٨٩ سالی حەوتەم

# کاروان

گۆڤاریکی رۆشنبیری‌ی مانگانەیە ئەمیندارێتی‌ی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوان بە زمانی کوردی‌و عەرەبی دەری دەکا





# کاروان

گۆڤارێکی رۆشنبیریی مانگانەیە ئەمینداریتیی گشتیی رۆشنبیریی‌و لاوان بە زمانی کوردی‌و عەرەبی دەری دەکا

سەرنوسەر
محمد أمین محمد احمد

جێگری سەرنووسەر
حسین رشوانی

٧٣
ئاداری / ١٩٨٩
ساڵی حەوتەم

لەم ژمارەیەدا

| بابەت | نووسەر | لاپەڕە |
| --- | --- | --- |
| ❋ وتەی ژمارە: | | |
| ● لە سایەی سەرکەوتن و ئاشتی دا ... | سەرنووسەر | ٤ |
| ● لەگەڵ رووداوەکانی چوارەمین کۆنگرەی ئەمینداریتی رۆشنبیری‌و لاوان دا ... | هیوا | ٧ |
| ● پیرەمێردو ئاهەنگەکانی جەژنی نەورۆز لە سلێمانی دا ... | گۆران حەریری | ١٠ |
| ● نوێبوونەوەی ساڵی کوردی‌و جەژنی نەورۆز | مستەفا سالح کەریم | ١٦ |
| ● ئەمرۆ ... | عمر شێخ الله دەشتەکی. | ٢٧ |
| ● ئەی وەتەن .. | لەتیف بەرزنجی. | ٢٩ |
| ● نەفرۆزە لاوۆ .. | ساکار بەرزنجی. | ٣١ |
| | دەیکا مێرخاسی. | ٣٢ |
| ★ رەخنەو لێکۆڵینەوە: | کەریم مستەفا شارەزا، د. نافع ئاکرەیی. | ٣٣ |
| ★ دیوانی کاروان: | حەسیب قەرەداغی، جلال مدحت خۆشناو، أمین حیدر بوتانی، مهاباد قەرەداغی، حازم هاجان، نەوزاد بەندی، بەیان کانەبی عەولا، صباح یحیی، م. ر. کوردۆ.. | ٥٠ |
| ★ جیهانی چیرۆک: | گەزیزە، صلاح عمر، جەزا عەلی ئەمین، أنور محمد قەرەداغی، خەسرەو جاف.. | ٥٨ |
| ★ لێکۆڵینەوەی شانۆیی: | حیدر عبدالرحمن. | ٧٣ |
| ★ زانیاری: | عزالدین نجم الدین بابان، د. عادل حسین | ٨٦ |
| ★ شانۆگەری ی ژمارە: «بەشی دووەم و کۆتایی».. | وە: سعید یەحیا | ٩٢ |
| ★ بابەتی هەڵبژاردەی کاروان: | کەمال رؤوف محەمەد. | ١٠٨ |
| ★ راپۆرتێکی رۆشنبیری: ـ کتێبە چاپکراوەکانی ساڵی ١٩٨٨ «بەشی یەکەم» | عەزیز رەشید حەریری. | ١١٦ |
| ★ کاروانی رۆشنبیری لە کوردستاندا: | دژوار | ١٢٤ |

ئەدرەس
هەولێر: ئەمینداریتیی گشتی رۆشنبیری و لاوان
گۆڤاری «کاروان»: ٢٠٨٨٢

لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغدا ژمارە «٤٨٣»ی ساڵی «١٩٨٢»ی دراوەتێ

نرخی «٥٠٠» فلسە



# ئاهەنگەکانی جەژنی نەورۆز لە مێژووی شاری سلێمانی داو دەوری پیرەمێرد لەم جەژنە نەتەوایەتی‌یەدا

نووسینی: مسطفی صالح کریم

**ئەوکاتەی زستان کاڵی خۆی دەپێچێتەوەو دەیەوێ ماڵ ئاوایی لە سروشت بکات، کە دەبینێ بەفری چیاکان دەبنە چۆراوگەو بە بریسك و هۆر بەوێنەی شیری بریقەدار بەناو دۆڵ و شیوا سەربەرەوخوار سلاو لەدەشت و هەردو لە کانیو سەرچاوەدەکەن، نێرگس دەم بۆ دەست و پەنجەی منالانی کوردستان دەکاتەوە... ئالەم دەمەدا گەلی کورد لەتەك پێشوازی بەهاردا بەعەشقەوە دەست لەملی (نەورۆز) دەکات. ئەو نەورۆزەی «ئاگرێکی وەهای خستە جەرگەوە، کە لاوانمان «بەعەشقەوە ئەچوون بەبەرەو پیری مەرگەوە»!**

لەدوا ئێوارەی وەرزی زستان دا کە جەماوەری کورد خۆی بۆ ئاهەنگی نەورۆز ئامادە دەکات، بەرێزەوە یادی ئەو کەڵە شاعیرەش دەکاتەوە کە تالەژیان دابوو بایەخێکی یەکجار گرنگی بەم جەژنە نەتەوەییەدا، وە گشت ساڵێك لە گردی مامەیارە کە بوو بەجێ خەوی یەکجاریشی، ئالەو شوێنە دڵگیرەدا ئاهەنگی میللی بۆ نەورۆز ساز دەکرد.

بۆیە پشتاو پشت لەتەك ناوی نەورۆزدا خێرا «پیرەمێرد» دێتەوە یاد.

ئەم شاعیرە مەزنە لەتەك نەورۆزدا سەرگورشتەی زۆری هەیە، وادیارە کە خۆشەویستی ئەوو نەورۆز دەگەرێتەوە بۆ سەردەمی منالیی شاعیر.

ئەوەتا دەڵێ: «مندالْ بووم لای مەلا حسێنە گۆجە ئەم خوێند، کە ئەگەیشتینە دەمی بەهار، مامۆستا ئەیگووت: بچن نەورۆزانە بێنن، ئێمەیش بەسەر دایکمانا ئەگریاین، سا دایك و باوکمان هەرچی‌یان لەدەست بهاتایەو هەرچی یان لەبارا بوایە ئەیان داینێ، ئەمان هێنا، ئەویش بەشی خۆی لێ هەڵ دەگرت، ئەمجا دەچووین لەمزگەوتی شێخ ئەورەحمانی شێخ ئەبوبەکری شێخەولا سوورەی دۆڵەتوویی خەتی خۆش بوو، نەورۆز نامەی بۆ ئەنووسینەوە.»[1]

ئەمجا وەك خۆی باسی دەکات ئەورۆژە مامۆستاکانیان مۆڵەتیان ئەدان و حوجرەیان بەجێ‌دەهێشت و بە گۆرانی نەورۆزنامە بە کووچەو کۆلانی شاری سلێمانیدا دەگەران و لەوەودوا دەچوونە قەراغ شار، ئەورۆژەیان بە ئاهەنگ و گۆرانیو خۆشیو شادی‌یەوە لەو دەشتانە بەسەر دەبرد.

بەلام سەیر لەوەدایە کە منالانی ئەودەمەی سەدەی نۆزدەیەم بەچاکی لەنەورۆز نەگەیشتوون، هەر ئەوەندەیان زانیوە کەدەبێ نەورۆزانە بۆ مامۆستاکەیان ببەن و ئەو رۆژەش ئازادن بۆخۆیان دەتوانن تا ئێوارە ئاهەنگ بگێرن، لەم رووەوە (پیرەمێرد)

دەمیگێڕێتەوە دەڵێ:
«نـەمن ، نە ئەو منـاڵانـەی هاو تەمەنم بوون نەمان ئەزانی (نـەورۆز) چیـیە؟ تا ڕۆژێ حەسـەنـە فەنی مامم بۆی لێك دامەوە» .

کاتێ کە پیرەمێرد لە دیاری غوربەت گەڕایەوە، بیری لەوە کردەوە کە ئەم جەژنـە نەتەوەیی‌یە بیووژێنێتەوەو بیکات بە جەژنێکی میللی. لێرەدا دەڵێ: «کە هاتمەوە ئێرە جارێکیان هەروا لەخۆمەوە نەورۆزم هاتـەوە بیر کە ئەمـە (عـەنعـەنە)و پیشەیێکی باوو باپـیرمـانـە، ئێـوارەییێکی شەوی نەورۆز هەندێ دارم کڕیو کورگـەلی زانستیشم هەڵگـرت و چوومـە گردی یارە، ئاگـری نەورۆزم کردەوە، بۆ بەیانی سەیرانم کردو لەو دەشتە بە دەهۆڵ و زورنـا هەڵپـەڕین، نان و چێشت و چایـەکی زۆریشم تیـا بەشیەوە» [٢]

★★★

خوێنـەرانی ئازیـز دەشێ ئەوە بزانن کە (پـیرەمێرد) لە ژیانی خۆیدا جارەها وتوویەتی: زانستی ئەم چاوەو ڕۆژ نامەکەشم ئەو چاوەکەی ترمە، جگە لەم دوانە جگەرگۆشەیێکی ئازیزیشی هەبـوو کە نەورۆزە.. ئەوەنـدە بەتـەنـگ ئەم جەژنەوە بوو تا بەباوکی نەورۆز دادەنرا. ئیتر تا ئەوساتەی کە لاوانی روناکبیر پێ‌گەیشتن و دڵنیابوو لەوەی کە ئەم جەژنە چۆتە خوێنیانەوە.. بەدڵێکی شادەوە مەشخەڵەکەی دایە دەستیان، تا ئەورۆژە ـ جگـە لەو ساڵانـەی کە بەدکـاران ئاگرەکەیان دەکوژاندەوە ـ هەموو ساڵێ بەتەنیاو بەگیانی لاوێکی تازە نەمامەوە سەیران و ئاهەنگی قەشەنگی ساز دەکرد.

★★★

لەساڵی ١٩٣٥/ دا پیرەمێرد لە ڕۆژنامەکەیدا بانگی نەورۆزی بەگوێی میللەت دا هەڵ دا، بیری خستنەوە کە ئەم ڕۆژە جەژنی باوو باپـیرانـمـانــە، با هەمـوان تێ‌ی دا بەش داربـن، لەونووسینەیدا وتوویەتی: «وا چلەپاك بووەوە، ڕوو لەبەهارین و خاوەر بەدەمنگی هوزار خاوکەرمان بۆ دەڵێ، زەوی‌و گوڵ و دارو درەخـت زیـنـدوو ئەبـێـتـەوە، دڵی شاعـیری تازەو کۆنیش ئەبـووژێنێتـەوە، کۆنـەکانمان داناوە بەدەمارە تووتن، بزانین تازەکانمان بۆ نەورۆز دێنە هێلکە.» [٣]

پیرەمێرد نیازی وایە خوا یاربێ، شەوی هەینی بیست ویەکی ئازار بەیـادی گیانی باوك و باپیر لەسەر گردی یارە ئاگرێکی نەورۆزیی بکاتەوە، وەك (ئەسپریزم) [٤] ئەورۆحە بڵندانە بانگ کا، هەر لەئێـوارەیشـەوە دوازدە سەمـاوەر لەسـەر (کارێزی شەریف ـ مەڵبـەندی جوانان) دەم دەکرێ، هەر کەسێکیش نەورۆز نامەیێك بنووسێ، چاو مێوژو گوێزو حەڵوای گەزۆی دەدرێتێ» [٥]

★★★

لەهەموو سەردەمێك دا نەیار هەبوون و هەن، لەوساڵانەدا کە پیرەمێرد دەیویست نەورۆز بکات بەجەژنێکی نەتەوەیی‌و میللەت بەشـداریی ئاهەنگەکانی بکات، بەدخواه هەمەجۆر بەیت و بالۆرەو بەنـدو باویان دوای نەورۆز خست، هەر یەکەو جۆرە قەوانێکیان لێ‌دەدا.

بۆیە لەساڵی دواییدا ـ واتە ١٩٣٦ ـ پیرەمێرد لەوە دەدوێ کە نەورۆز هی خۆمانەو لەسەر ئارەزووی هیچ لایەك نی‌یە، ئاگری نەورۆزیشمان بەسیاسەتی هیچ لایێك جۆش ناخوات، لەتەك ئەو وشانەش دا ویستوویەتی لە جەماوەری بگەیێنێ کە نەورۆز جەژنی هەموو کوردێکە، ئاهەنگەکانیشی بۆ هەموانە، پێویست بەوەناکات بەتایبەتی خەڵك بانگ بکەین، هەموان بانگ کراون.

بەم شێوەیە دەبینین پیرەمێرد دەنووسێ: «جەژن و بەهار، گوڵ و گوڵزار. خوا بۆ ئەم ساڵیش گەیاندینیەوە نەورۆز، نەورۆزی ئەم ساڵـان نورون عەلانوورە، ساڵان ئەیانوت: نەورۆز بەهەوای لای سەرروومانە، ئەم ساڵ با پێمان بڵێن بەهەوای خۆمانە. خۆ ئەگـەر ڕاستـتـان ئەوێ نەورۆزی باوو باپیرمانەو پیرەمێردانە کاری بەهیـچ بارێکـەوە نی‌یـەو هیـچ سیـاسـەتێ بەئاگری نەورۆزی ئێمـەدا جۆش ناخـوا، تەنها ڕەوییەو عەنعەنەیێکی کۆنی خۆمانە، ئەمجا خوا یاربێ شەوی بیست و یەکی مارت لەسـەرگـردی سۆفیـیارە ئاگری نەورۆزمان دیارە، بەڕۆژیش دەهـۆڵ و زورنـاو هەڵپەرکێ‌و بەژمارەی ساڵ کە دوازدە مانگە دوازدە سەمـاوەر لەجۆش داو خۆیشمان لەخرۆش دا دەبین. ئەمە جەژنی هەموولایەکەو بانگ کردنی پێ‌ناوێ. دووڕۆژیش تەعتیلی دەوائیرە، لە دووریشەوە هەرچی خۆی بەخۆمان بزانێ دێت» . [٦]

دوای ئەوەی کە پیرەمێرد ئەو وتارەی بڵاوکردەوەو خەڵکەکەی بۆ (نەورۆز) ئاگادارکرد، بەڵێنی خۆی بردەسەر، لەنەورۆزا ئاگری خۆی کردەوەو بە دڵی خۆیشی ئاهەنگی سازکرد. بۆ ئەوەی لە دووتوێی لاپەرەکانی مێژوویشدا بمێنێتەوە، لە رۆژنامەی (ژیان)دا ریپۆرتاژێکی دەربارەی ئەو ئاهەنگانەی ئەو ساڵە نووسیوە کە تێیدا فەرموویەتی:

ئێوارەی جومعە کە بۆ شەممەو دەچوو، رۆڵەی زانستی بە گۆرانی نەورۆزەوە روویان کردە (یارە) کە (دیار)ی لێوە دیارە[7]

لە تەپڵە سەری گردەکە بە دەوری (یارە)دا ئەهرامێکی داری سووتەنییان هەڵچنی، تاشەوێ، ئەو دەمەی رۆژ پێی نایە کەلووی بەرخەوە[8].

بەجارێ گڕی ئاگر لە دیاری یارەدا دیاری ئەدا.

بەیانی زوو ئاوازەی دەهۆڵ و زورناو نەغمەی شادیی نەوجوانانی زانست لە کووچەو بازاری شاردا دەنگی دایەوە، بەجارێ رووماان کردە کۆی ئاتەشگاو کارێزی شەریف، ویزەی سەماوەر پەیدابوو، باو بارانیش لە سەرداکردیانە گیزەو گورە، کەوتینە بەربەرەکانیی. کورگەڵ نەجووڵان تا ئەوشکا. ئیمانم هێناو باوەرم کرد لەبەر عەزم و رەزمی لاوانی زانستیدا هەور، باوباران خۆیان نەکرت!

تا ئێوارە پۆل پۆل و تیپ تیپ هاتن، ئەودەشتە بە گوڵی گیان داری نەورۆزو شادمانیی‌و ئازادیی کچان و خوشکانی دڵسۆز بووبووە بەهەشتێکی فەیرۆزو رۆژێکی بەهە رۆژ.

خواردەمەنیش (ماتشتهي الأنفس) کەوتبوە (بروز). دووریز لە دەنگ خۆشەکانی زانستی وەك دوودەستە بولبولانی وەتەن دوو نەشیدی نەورۆزیان بەرامبەری یەك ئەخوێندەوە،چوار دەستەیش لەژێر قوماندەی چوار سەرپەرشتیکەر کە هەر یەکەیان بازووبەندی زانستییان لەقۆڵ دابوو، لەچوار لاوە بۆ بەپیرەوە چوون و خۆش ئامەدیو میوان داری خزمەتیان ئەکرد. پیرەمێردیش بە داری خۆی کە بۆ نەورۆزی کڕیبوو ئاگریان تێبەردابوو هەڵپەرکێ‌و سەرچۆپیو ئەم سەرەو سەری سەرگردەکەی بەرکەوتبوو. بەوەیش وازیان لێنەهێنا ئەیانگووت لەنەورۆزا ئەبێ حەوت خواردەمەنی (میم) ببێ.[9] بە زۆر (ماسی)و (مریشك)و (میوە)و (ماست)و (مێوژ) بە خورماو (ملح - خۆی - بۆ هێلکەو (مەسکەت) بۆ منداڵانیان پێ پەیداکردو نان و پەنیرو گوێن و گورچیلەیشیان خوارد!

دوای تیرییی، چوار تەلەبەی شاعیری زانستی غەفوور زمینەددین و بەنگینەو هیواو مەجید مناڵ چوار مەنزوومەی میلی جوانیان خوێندەوە. خواپێمان رەوابیبێ لە شاگرد نانەواو کەوش درووو، کورە بەردکێش بە سایەی زانستییەوە ئەم ئاداب و تەمکین و شاعیریی‌و حیسسی میللەت پەروەرییان بۆ پەیدابووە، جەژن و سەیرانێکی وا بە دەبدەبەیان بێ قرەو گورە بەجێ هێنا.»[10]

★★★

وەك لەپێشەوە ئاماژەمان بۆکرد، گەلێ بوختان بەنەورۆز دەکرا، جگە لەوەی کە ناحەزان زۆریان لەبار دڵ گران بوو، پیرەمێردێکی بەساڵا چوو بتوانێ ئەم هەموو خەڵکە لەخۆی کۆ بکاتەوەو ئاهەنگی نەورۆزیان بۆ سازبکات، بەوپێیە توانییان لای موتەسەریف کەمەجید یەعقوبی بوو نەورۆزو ئاهەنگەکانی بەشێوەیێکی تر لەقەڵەم بدەن، ئەویش لەساڵی ١٩٣٨دا ئاهەنگی جەژنی نەورۆزی قەدەغەکرد[11].

هەروەهاش نەورۆزی ساڵی ١٩٣٩ بەدەردی ساڵی پارچوو، لەساڵی ١٩٤٠دا کەمەجید یەعقووبی لە سلێمانی نەمابوو، وەحاجی رەمەزان پاشابووبوو بەموتە سەریف، پیرەمێرد بەتەمابوو کەئەم ساڵ گردی یارە ئاهەنگەکانی ساڵانی پێشوو بەخۆیەوە ببینێ، بەڵام ماوەی نەدرایە کەجەژنی نەورۆز روخساری جوانی خۆی بنوێنێ. پیرەمێرد نەیهێشت ئەمەی بەسەردا تێپەربێ، لەرۆژنامەکەیدا ئەم دوو دێرە شیعرەی گرتە موتە سەریف.

**موحەرەم ماتەم سەفەر دەعوابوو**
**هەر رەمەزان بوو جەژنی لەدوابوو**

بەمانا ئەگەر ئەم موتەسەریفە کەناوێ رەمەزانە بروات، لای ئێمە لە خۆشیانا دەبێ بەجەژن.

بەدەم هەناسەی ساردەوە شاعیری جەرگ هەڵقرچاو کەرێگای گردی یارەو کارێزی وەستا شەریفی لێقەدەغەکرا ئەم چەند دێرە شیعرەی بڵاوکردەوە.[12]

یاخوا ئەو کەسەی کە ئەم دوو ساڵە
لێم کەوتە گیزە وەك زەردەواڵە
نەیهێشت ئاگری (یارە) بگرێ
چەقۆی ئاهی من جەرگی هەڵدڕێ

★★★

لەنەورۆزی ساڵی ۱۹٤۱دا ڕێگای ئاگرکردنەوەدرا، بەڵام ماوەی سەیران و کۆبوونەوەو ئاهەنگیان نەدا، بۆیە دەبینین پیرەمێرد ویستـویـەتی بە شیعر ئەو بۆشاییـیە پڕ بکاتەوە، با شیعری نەورۆز بەسـەر ئەو دەنگـانـەدا زاڵ بێ کە دیـانەوێ کڵپەو بڵێسەی ئاگری نەورۆز بکوژێننەوە. لە ڕۆژنامەکەیدا نووسی:

«شـوکر شارەکەی ئێمە بە ئاگری نەورۆز سۆزێکی بەهاریو چیلوەیێکی ئەدەبی تیـا پەیدابووە هارەهاری شیعرو ئەدەبی تازە پەیـدابـووە. کچـە کوردێکی فریشتـەی ئاسمان بە دوو شیعـری پڕ جۆش و خرۆشی نەورۆزیـەوە سەرمـەستیـیەکی میللیو حیسسی خستـەوە ناومـان. (نـاهیدە سەلام) کارتێکی زرنـگـاوی وەك خۆی بە دوو شیـعـری شیرینـی دوو باڵی پەریـیانەوە بەسەر ئەوجی وەتەنەکەیان خستۆتە جەولان. خۆ هێجگـار (گـۆران)، بەڵێ (گـۆران) ئوستـادی زمـانـەکەمان بەهاریـیەکی نەورۆزی نووسیوەو لە (ژین)دا دێتە بەر چاوتان و بەگۆرانی (گۆران) ئەچینە سەیران..»[13]

لەسـاڵی ۱۹٤۲دا دیارە کە هەندێ گۆران لەبارو دۆخا ڕووی دابێ بەهـۆی ئەوەی کە شێـخ مستـەفـای قەرەداخی بۆتـە موتەسەریفی سلێمانی.

پیرەمێردی تامەزرۆی سەیران و جەژنی نەورۆز، پێش وادە بە دوو ڕۆژ لە (ژین)دا مژدەی سەیـران و ئاهـەنـگ دەدات، جارێـکـیتـریش ئەوە بەگـوێـی ناحـەزانـا دەداتـەوە کە نەورۆزەکـەمان هی خۆمانەو بەهەوای هیچ لایێك گڕی خۆش نابێ، خۆمان خاوەنی ئەم جەژنە نەتەوەییەین، لەم بارەیەوە نووسیویە:

«بۆ ئەوەی باوەڕمان پێ بکەن کە تائێستا سەیرانی نەورۆزمان بە هیچ هەوایەکی هیچ لاوە نەکردووە، وا شەوی یەك شەممە لە گردی یارە ئاگری نەورۆز ئەکرێتەوە، ڕۆژی هەینیش سەیرانە، جنسی لەتیف کە ئەم ساڵ لە بەفرا کەسیرە بوون، با، بای باڵی خۆیـان بدەن، بەسایەی ئەوانیشەوە جینسی خەشن ئەتوانن بێن، بەڵام ڕەشبەڵەك نییە»[14].

لەمـەوە دەردەکـەوێ کە جارێکیتـر پیرەمـێرد خواستی ئەو خەڵکەی هێناوەتە دیو زەردو سوور کارێزی وەستا شەریفیان ڕازاندۆتەوەو لەتەك نەورۆزی کوردا دەست لەملانیان کردووە.

★★★★

بۆ ساڵی دواییش واتـە ۱۹٤۳ بەگـەرمی پێشـوازیی نەورۆز کراوە، ئەو ڕۆژە گردی مامە یارەی قارەمان و سەرکارێزەکەی وەستا شەریف بۆ تەمەڵبەندی نەوجوانانی کورد. لەم بارەیەوە (پیرەمێرد) گلەیی لەوە دەکات کە هەوایان لێگۆڕاوەو ئەو ڕۆژەی کە ئاگری نەورۆزی تێدا کراوەتەوە ساردو سەر مابووە، دەڵێ:

«ئەو ڕۆژە بایەکی هەڵکردبوو لەو دەشتە، گای ئەفراند، لەبەر ئەوە سەیرانمان خستە ڕۆژێکی هەینی»[15].

ئەمجا باسی سەیرانەکە دەکات کە لە ڕۆژێکی خۆشی هەینیدا ساز کراوەو دەڵێ: «تیپی کیژە کوردەکان کە وەك گوڵ و گوڵاڵە ڕازابوونەوە.

گوڵ و گوڵاڵەی سەحرایان بەست کردو کارێزی شەریف بوو بە مەڵبـەنـدی جوانـان، پیـاوان کەوتبـوونە ژووری کارێزەکەو دەستـەی جینسی لەتیف لە تەوقـەسـەری گردی یارە شێـخ حەفسەی نائیب ڕەئیسی کۆمەڵەی جینسی لەتیف[16] تەختگای خۆیڕازاندبوەوە. بە هەر چوار تەرەفی گردەکە شاژنان حەڵقەیان دابوو»[17].

★★★

لەسـاڵی ۱۹٤٤ دا بۆ بیرخستنـەوە پیرەمێرد لەوە دەدوێ کە چەند بە تەنگ نەورۆزەوە بووەو چۆن کردوویەتی بە جەژنێکی میـللی، بەڵام ناحـەزان بە گڕی ئاگـری نەورۆز لەشـیـان داهێـــزراوە، بۆیـە پەلەقـاژێیـان کردووە کە ئەو ئاهـەنگـە جەمـاوەرییە کوێر ببێتەوە، لەم ڕووەوە پیرەمێرد نووسیویەتی:

«سـەر گوزەشتی من و نەورۆز دیـوانچـەیێکە، ئەبێ ئەوەی ئاییندە لە بیریان بێو لەبەریان بێ بۆ ئەوەی لە پەیجۆرو ڕاو ڕەسمی باوو باپـیری خۆیـان و پیشـەی ئێڵەکەیان نەبەزن و بەکێش بن.

لەمەوبەر نووسیبوومان کە بۆ ئەم نەورۆزە چی‌یان بەسەر هێناین کە خوێی چێشتە، جارێ با ئەوە بمێنێ. ئەم جارە خۆشەوەکەرەی دوای تاڵەوەکەرە ئەنووسین. ئەم ساڵ داخی هەموو ساڵێکمان رشت، جارێ لەپێشەوە لەسەر گردی یارە سەر لەئێوارە دار هەڵچنراو کە تاریك داهات بە دەهۆڵ و زورنا ئەهلی ئەم شارە چوون ئاگریان تێبەردا، نێڵەی ئاگرو ناڵەی دەهۆڵ بەرز بووەوە تا درەنگێ لەو سەرگردە هەڵپەرکێ بوو»[18]

پیرەمێرد هەر لەوتارەکەدا باسی سەیرانەکە دەکات و دەڵێ:

«بۆ رۆژی جومعەیش بۆ جاری سەیران بە شارا گەراین و روومان کردە کارێزی شەریف»

پاشان دەڵێ: «پیرەمێرد ئەو دەشتەی پرکردبوو لە گوێزەبانەو خواردەمەنی، ١٦٠٠ نان بە ژمارەو شەش مەنجەڵ یا پراخ و چوار مەنجەڵ پلاوو دۆکوڵیوو قەزاتمەی عمومیو گوێزەبانەیش مێوژو گوێزو خورماو نوقڵێکی زۆر. هەر وەها چوار پەردەپلاوو چوار سینی پاقلاوەو پەنیرو خورماو هێلکەی کوڵاوو تەرەپیاز.[12] سەماوەریش تائێوارە چای ئەدا»[19]

★ ★ ★

نەورۆزی ساڵی ١٩٤٥ لەبەر ئەوەی رووداوێکی ئەدەبیی گرنگی تێدا رووی‌دا، لەمێژووی ئاهەنگەکانی نەورۆزدا لەبیرناچێتەوەو هەمیشە بە شانازی‌یەوە باس دەکرێت. وەك ساڵانی رابوردوو رۆژنامەی ژین[20] بۆمان دەگێرێتەوە کە لە رۆژی نەورۆزدا ئاگر کراوەتەوەو کورگەلی کورد بە دەهۆڵ و زورناوە دەستیان بە هەڵپەرکێ کردووە، پاشان هاتوونەتە قەڵەندەرخانەکەی پیرەمێرد، لەوێ دۆکوڵیوی نەورۆزیان خواردووەو چای خەستیان بەسەردا نۆش کردووە، بەهیوای ئەوەی کە هەفتەی دوایی لەرۆژێکی خۆش دا سەیرانەگشتی‌یەکەش بکەن.

بەڵام باران و سەرماو رەشەبای سلێمانی دەرفەتی‌نەدوان، بۆیە سەیران و ئاهەنگی نەورۆزی ئەوساڵە کەوتۆتە رۆژی چوارشەممەی ٤/٤/١٩٤٥. لەو رۆژەدا خێوەت لەسەر کارێزی وەستا شەریف و بەر گردەکەی مامەیارە هەڵ دراوەو دەشت و هەردی ئەو ناوە بە ئاڵ و والآ رازاوەتەوە. دایەرەی مەعاریفیش ـ پەروەردەی ئێستا ـ بە هەمە جۆر چالاکیی قوتابیانی کوران و کچان بەش داری‌یان کردووە. ئەو سەردەمە خوالێخۆشبوو «مارف جیاووك» موتەسەریفی سلێمانی‌بوو، لەبەر ئەوەی هاورێی غەریبی‌و دۆستی دێرینی پیرەمێردبوو، بەڵێنی‌دابوو یەکە خۆی لەو ئاهەنگ و سەیرانەدا بەش دار دەبێ. بەڵام وەك لەرێك خستنی رووداوەکانی ئەو چەند رۆژەدا دەردەکەوێ بە هیچ جۆرێ چاوەروان نەکراوەکە (ئەدمۆنز) لەو نەورۆزەدا ئامادەبێت.

ئەو دەمە کە ئەدمۆنز راوێژکاری وەزارەتی ناوخۆبوو، لە کاروباری وڵات دا دەستێکی باڵای هەبوو، بەتایبەتی لە ناوچەی کوردستان دا.

بەپێی فەرمانی دەوڵەتی بەریتانیا ئەدمۆنز ئیشی لەعیراقدا تەواوبووبوو دەبوایە بەرەو ئینگلستان بگەرێتەوە، بەناوی ماڵ ئاوایی‌یەوە بۆ سلێمانی هاتبوو. ئەو بەیانی‌یە لەتەك موتەسەریف دا گەشتێ بە گوێژەو ئەزمەردا دەکەن، لە گەرانەوەیان دا (جیاوك) وەك میوانێك خوڵقی دەکات کە بچن بۆ شوێنی سەیرانەکە. لە گەرمەی ئاهەنك و گۆرانی‌و سروودو هەڵپەرکێ‌و شیعر خوێندنەوەدا فایەق بێکەس لە مێزەکەی ئەدمۆنز نزیك دەبێتەوەو دەست بەخوێندنەوەی شیعرە بەناوبانگەکەی دەکات:

**بیست و حەوت ساڵە من رەنجبەری تۆم**
**بەنان و ئاوو جل و بەرگی خۆم**
**خزمەتم کردن لە ئێران و رۆم**
**لەپێناوی تۆ شکاوە ئەستۆم**
**کەچی هێشتا هەر دیل و رەنجەرۆم**
**گوناهم چی‌بوو بەم دەردەت بردم**
**بۆچی بە ناهەق وا سووکت کردم**

دەربارەی ئەم رروداوە ئەدیبێکی ناسراوکهاورێی نزیکی بێکەس بوو، لەدانیشتنێك دا گێرایەوە وتی: «بێکەس ماوەیێك بوو ئەو شیعرەی نووسیبوو، چەند جارێك بۆ ئێمەی خوێندبوەوە، ئەوەبوو ئەو ساڵە بەهۆی ساردو سەرماو بارانەوە ئاهەنگی نەورۆز دواخرا، تا کەوتە سەرەتای مانگی نیسان، ئێمەیش لەو ئاهەنگەدا بەش داربووین، کاتێ کە موتەسەریف هات و بینیمان ئەدمۆنزی لەتەك دایە رووم کردە بێکەس و پێم

وت: فایەق فرسەتە، ئێستا کاتی ئەوەیە شیعرەکەت بەرامبەر یەکێ لەوانە بخوێنیتەوە کە (٢٧) ساڵە ئەمان ڕەتێننەوە.
بێکەس لەسەر قسەکەی من و هان دانی هاورێیانی‌ترمان لەمێزەکەی ئەدمۆنز چووە پێشەوەو شیعرەکەی خوێندەوە.» [٢١]

ئەمجا بێنەوە سەر باسی سەیران و ئاهەنگەکە. پیرەمێرد ئەڵێ:
«ئـەو کچـە وردانـە جلی پەریـانەیان لەبەرابوو، بە ئاوازەو سروودێکی فریشتەیی‌یەوە سترانی کوردی‌یان ئەخوێندو کورە بچکۆلەکانیش وەك لاوکی قەرو گوڵەزەرد بۆیان ئەسەندنەوە، ئەمـە نەغمەیێکی ڕۆحانی بوو ئەچەسپیە دڵەوە، دوای ئەوە دەستـەیێکی تری کچـە کوردان هەر یەکە لەبەرگ و پۆشینی شوێنێك دا خۆیان ڕازاندبوەوە، یەکێ جلی کچە بەغدایی، یەکێ کەرکـووکی، کۆیی، هەولێری، جەزیـرو بۆتـانی، بادینـانی، کەنیشکە جاف‌و هەمەوەندی، هەرچی شێوەی کوردستانی‌یە بەو ڕەنگەنمایشێکیان دەکردو دیسانەوە بەو دەستوورە هەڵپەرکێ‌و نەریتی هەموو تیرەیەکیان پێ نیشان داین. هەزاران ئافەرین بۆ ئەو مامـۆستایانەی کە ئەم فیکرەیان کردوەتەوەو ئەم تەرتیب و ئینتیـزامـەیـان نوانـد. باوەر بفەرموون چونکو تا ئێستا ئەم هونـەرەم لەهیـچ شوێنێکی کوردستـانـا نەدیـوە، وەك تازە سەرلەنوێ هاتبمەوە جیهانەوە ئەمەندەم لەلا خۆش بوو.
یاخوا لاوە هونەرمەندەکان (صالح ئەفەندی) [٢٢] و ڕەفیقەکانی بەرخوردار بن،مودیری مەعاریفیش [٢٣] بەختیارەکە ئەم دەستە مامۆستایانەی پێگەیاندووە.
ئینجا شیعرو نەشائیدی ئەدەبی [٢٤] و مۆسیقەی مەکتەب هاتە مەیـدان. گۆرانی کوردی بە عودو کەمـانەوە زەوقێکی ڕۆحی بەخشی، دوای ئەم قووت و قووەتی ڕۆحە هاتینە سەر ئیشتیهای نەفسانی... تا.. د» [٢٥]
بەو جۆرە ئەو ساڵەش (نەورۆز) بەو شێوەیە بەرێ کرا.

★★★

وەك بۆمان دەرکەوت پیرەمێرد بە تەنیاو بەگیانی لاوێکی خوێن گەرمـەوە هەمـوو ساڵێ ئەم سەیـران و ئاهەنگە قەشەنگانەی دەگـێڕا، تا ساڵی ١٩٤٦ کە گڕی نەورۆز لە دڵی جەمـاوەری کوردستـانـا کڵپـەی کردو، ئاگـری نەورۆز لە ئاسۆی بڵندی وڵاتەوە مژدەی بەیانێکی نوێی دەدا، گڕی ئەوەندە بەتین بوو سەرتـاپـای کوردستانی ڕوناك دەکردەوە. شەوقی مەشخەڵی نەورۆز لە (مەهاباد)ەوە هیوایەکی سەوزی لە دڵی لاوانا ئەچاند.
ئەو ساڵە قوتـابیان و لاوان و ڕوناکبیرانی شاری سلێمانی بە سۆزو عەشقـەوە بەرێزو پێزانینەوە چوونە لای بابە گەورەی نەورۆز، پیرە مێردی شاعـیرو وتیـان: خاڵە حاجی، کاتی ئەوە هاتوە کە هەندێ لەو ئەرکەی سەرشانت سووك بکەین، دەبێ ئێمـەش پێـویستی نیشتمانی خۆمان بەجێ بهێنین، تۆ فێرت کردین کەچـۆن پێشـوازیی جەژنی نەورۆز بکەین، ئەم ساڵ دەمـانـەوێ خۆمان لەم بوارە بدەین، فەرمووتە شریف بهێنەو تاقی‌کردنەوەکەمان ببینە بزانە لە ئاستی ئەوە داین کە قوتابی ئێوە بین یان هێشتا ماومانە.
پیرەمـێردی مەزن بەم هەواڵە زۆر شادمـان بوو، بەختیاربوو بەوەی کە ئیتـر نەورۆز لەوە دەرچـوو ناحەزان بتوانن پلاری تێبگرن، ئەوا خۆشەویستی ئەو جەژنە لە دڵی قوتابیان و لاوان و کاسبکارانا چەکەرەی کردووەو ڕوناکبیران دەیانەوێ ئاهەنگی تایبەتی بۆ سازبکەن .
لەڕۆژی نەورۆزدا لە هۆڵی سانـەوی کورانـا کە بەجـەمالۆن سـەری گیرابوو ئاهەنگێکی قەشەنگ سازکرا، قوتابیان بە بەرگی کوردی‌یـەوە پێشـوازیی میـوانـەکـانیـان دەکرد، باسووق و سنجووق لە سەبەتەی شووڵ دا پێشکەش دەکرا، شەربەتی مێوژ لەجامولکەدا دەخورایەوە، نێرگس بە بەرۆکی میوانەکان دا دەکرا. لەو ئاهەنگەدا جگە لە سروودو گۆرانی، فایەق بێکەس بە شیعـری (بەهار نامەوێ جوانیت ببینم)، أ.ب. هەوری بە شیعری (ئەی‌کورد)، بەختیار زێوەر بە پارچە شیعرێکی ناسك بەشداربیان کرد. کامەران و عومەر کەریم عەزیز چەند تەرجیع بەندێکی (حەمدی)یان خوێندەوە. عیزەددین مستەفا ڕەسوڵ ـ کە ئەودەمـە پێکەوە لەپۆلی یەکەمی ناوەندیی بووین ـ کورتە وتارێك و شیعرێکی شێخ سەلامی خوێندەوە.
شیاوی باسە ئەوانەی سەرپەرشتی ئەو ئاهەنگەیان دەکرد ـ خوا لێـیـان خۆش بێ ـ مامـۆستایان غەفوور ڕەشید داراغاو موحەرەم محمد ئەمین و کامەران و عومەر کەریم عەزیز بوون.

لەکۆتـایی ئاهەنگەکەدا، داوا لە «پیرەمێرد»ی نەمر کرا کە بە وتـەیـەکی شیرینی کۆتـایی بەئـاهـەنگـەکە بهێنێ، وا دیارە عیـززەدین مستـەفـا کە بچـووکتـرین قوتـابی قوتـابخانەی سانەوی‌بوو، بەو وتارەی سەرنجی پیرە مێردی راکێشا بێ، بۆیە خاڵە حاجی لە سەرەتادا وتی: «من نەم ئەویست قسە بکەم. ویستم ئەم جارە قسە بدەمە دەست لاوان، بەلاَم خوێن گەرمی ئەم منـاڵە هێنـامیە قسە، ئیتر مادام من بە چاوی خۆم دیم منـاڵێکی بچـووکی کورد بەم کوڵ و دڵە هاواری کوردستـان ئەکات، ئیتر با من بمرم، باپیرەمێرد بمرێ، چونکە هەر لاوان نین منالاّنیش هاواری میللەتیانە» [٢٦].

ئەمجـا پیرە مێرد وتی: «ئێستـەش ئازاری زەبـری تورکیـا لەمـوورەغەی پشتما دێت و دەچێ لەسەر ئێوەی کورد، پیرو کەنەفت بووم و ئێستە شەکەتم و لەش داهێنرراوی هەورازە رێی شیعـرو رۆژنـامـەو نەورۆز بۆ ئێـوەی کورد. بەلاّم ئەو فرمێسکانەی ئەرژێتە سەر رووی پیرم فرمێسکی شادمانی‌یە، چونکـە من ئەتـرسام کە مردم مەشخەڵی نەورۆز بکوژێتەوە. کەچـی ئەو مەشخـەڵە پیرۆزە سوپـاس بۆ خوا، لە دەستی لەرزۆکی منەوە، درایە دەست ئێوەی بازوو پۆلاّ، لەمنی پیرەوە پێشکەش کرا بە ئێوەی لاو، چەند شادم بەوەی دڵنیابووم کەوا نەورۆزی جگەرگۆشەم دوای من بێ باوك و بێ باوان نابێ» [٢٧].

ئەمجا پیرەمێرد بەم شیعرە کۆتایی بە وتەکەی هێنا.

**بەسەر شاخی ئەراراتا بەلاوك پیرەمێرد سەرکەوت**
**ئەڵێ: شوێنم کەون کورگەل، شەوی سەرکەوتنە ئەم شەو.**

کە ئاهەنگ کۆتایی هات و خۆر ماڵ ئاوایی لە کەل کرد، قوتابیانی سانـەوی گشتمـان لەمنـاڵەوە تاگەورە بەپێی راسپاردەیەکی لەوەوبـەر شاپێلیتـەمـان هێنابوو، شاپێلیتەکان بەتەنەکە نەوتا دەکران، بە جارێ سەدان مەشخەڵ ئامادەکرا بۆ نمایشێك کە شاری بە جارێ کرد بە چراخـان. سروودو هیتـاف قوتـابیان مژدەی خەباتی نوێ‌و پێگەیشتنی دەستەیە تێکۆشەری نوێی بە گوێی جەماوەردا دەدا. ئەم نمایشە چەند سەعاتێکی خایاند، ئەمجا لەبەر دەمی قوتابخانەدا بلاّوەی لێکرا. شیاوی باسەکە ماموستای خوا لێخۆشبوو وەدیع فتح الله ئەو دەمە بەرێوەبەری قوتـابخـانـەکـەبـوو، بەدرێـژایی ماوەی ئەو نمـایشە لەتەك قوتابیەکانیابوو، بەجێی نەهێشتن نەوەك تووشی گێژگرفتێ ببن.

★★★

هەفتـەیـەك پێش نەورۆزی ئەو ساڵە، پیرەمـێرد لە رۆژنامەی (ژین)دا وتـارێکی نووسیبـوو تێ‌یدا وتبووی: «وا ئەم پێنج شەمموەمان لەگەڵ زستان بردە سەر، ئەو پێنج شەمموەکەی‌تر سەر لەبەیانی رۆژی ساڵی تازەیە، کە نەورۆزی پێ ئەڵێین، ئێمە وەکـوو هەمـوو ساڵێ بە یادگـاری باوك و باپـیرو پیشـەی کوردەواری جەژنمان کردووە، ئەم ساڵیش لەسەر گردی یارەی سەر نیگاو گۆری پیرەمێرد، رێی بەختیاری ساڵی ئایندە رووناك ئەکـەینەوەو سەیرانەکەشی ئەخەینە رۆژی جومعەیێکی خۆشی بێ‌باران. جیاوك [٢٨] پار رەونەقێکی دابوو بە سەیرانەکە، ئەم ساڵ تەنها بە سیفەتی جیاوکی چاوەرێی ئەکەین و سەرپەرشتی ئەم سەیرانە کوردەواری‌یە بکات، بێ ئەو ناخۆشە، جیاوك تا بە موتەسەریفی لێرە بوو نانی کەسی نەخوارد، ئەم جارە کەخۆمانە دێت، خۆم و خۆی بەیەکەوە رائەبوێرین» [٢٩].

هەر لەم وتـارەی‌دا پیرەمـێرد دەڵێ: «لە کفـری‌یـەوە بە ناوی نەریمانەوە [٣٠] نامەیێك و بەندی ژینمان بۆ هات، ئای چەندم پێخـۆش بوو ئەم لاوانە ئەمەندە تاسەی غەزەتەی خۆیانیان لەلایە، نەریمان ئەڵێ: ژینم خوێندەوە خۆم وا ئەزانی وام لەم شایی‌یـەی ناو سلێمـانی. ئەم جارە بێتـەوە شیعـرەکـانی ئەنووسین» [٣١]

★★★

دوای ئەو ئاهەنگە رەنگینەی کە لە سانەوی سلێمانی سازکرا، پیرەمێرد سەیرانە ئاسایی‌یەکەی خۆی وەك جاران لەگردی یارە کرد، کورو کاڵ کۆبـوونـەوە تێر هەڵپـەرکێ‌و زەمـاوەنـدکـرا، نەورۆزی ئەوساڵە حەقە وەسێن بوو، بووە دوو نەورۆز. پاشان پیرەمێرد لە وتارێك دا باسی ئەو ئاهەنگانە دەکات، گەلێ شانازی بەوەوە دەکات کە رۆڵە دڵ سۆزەکانی‌و قوتابیانی جگەر گۆشەی کارێکی وایان کرد کە ئەم جەژنە بنج بەست بێ‌و هەتا هەتایە لە دڵی کورد ابێ.

لەو نووسینـەی‌دا پیرەمـێرد وتـوویە :«ئەم ساڵیش بە خۆشی،

دۆستیی سەری هەموو قەومی کورد ئاگری خۆمان تیا کردەوەو
بە شەوقی ئەو ئاگـرە رێی ساڵی ئایینـدەمـان رونـاك بوەوە.
بەختیـاریـیـە بۆ من کە پاش ٢٦ ساڵ چەرمـەسـەریو ئاگر
کوژاندنەوەو رێ لێبەستنی بەدکاران گەیاندمە رۆژێك کە بێ
ترس و پرس لە هەموو لایەکەوە رۆشنایی میللەتەکەم بینرا.[32]
یاخوا بەرخورداربن لاوان و خوێندەوارانی نیشتمان و رۆڵەی
نەبەردی مەکتەب گەلێ لەمنیان تێپەراند، ئەو شەوو رۆژە بە
عەزم و رەزم و ئاهەنگەوە لەمەکتەب دا حەفلەیەکی بە ئەدەب و
ئاداب و لەسەر گردی یارە بە دەهۆڵ و زورناوە لە دەوری ئاگری
نەورۆز هەڵپەرکێ و جونبـوشێکی نایابیان کرد، خۆ هێجگار
جووتە بولبولی گوڵزاری کوردستان رەشۆل و مەحموود[33] یاخوا
لە چاوی بەد بەدووربن، بەهـەمـوو بەنـدو گۆرانیو بەستەو
قەتارو خاوکەرو لاوکی کوردی ئاهەنگیان گێرا، سوێند ئەخۆم لە
هیچ شوێن و قەومێك و دیارێك، بەڵکو لە فریشتەی عالەمی بالا
بەسۆزترو بە نەشئەترو بەتەئسیرتر وێنەیان نەبوەو نایشبێ.
دیتە ئەوەڵ بانگی بەیان بوو، ئەمەندە بەزەمزەمەو جۆش و
خرۆش بوو لە خۆشیانا منی هێنایە گریان. ئیتر چاوم لەدوای
خۆمەوە نەماوە. ئەو جەژنە وا بنچ بەست بوو، ئەو ئاگرە وا
گری سەند ناروخێو ناکوژێتەوە[34]

* * *

هەر چەندە ئێمە لەم باسەدا تەنیا ئاهەنگەکانی شاری سلێمانی
دەدوێن بەڵام جێی خۆیەتی کە ئاماژە بۆ ئەو ئاهەنگانە بکەین
کە لەم ساڵەدا واتـە ١٩٤٦ لە شارەکانی تری کوردستان دا
سازکـراوە. وا دەردەکـەوێ کە گری نەورۆز لە گردی یارەوە
تیشکی گەیاندە هەڵەبجەو هەولێرو کۆیەو کفری.
پیرەمێرد سەبارەت بەو ئاهەنگانە دەڵێ: «لە هەڵەبجە یەکەم جارە
ئاگری نەورۆز کراوەتەوە وا ئەویشمان نووسی»[35].
بە درێـژی باسی ئاهەنگی نەورۆزی هەڵەبجەی نووسیوە. لە
شوێنێکی تری هەمـان ژمـارەدا ئەڵێ: «لە هەولێرەوە بەنـاوی
مستـەفـامە مەجیدەوە[36] مەقالەیێکی دوورو درێژو پڕ تام و
لەزەتمان وەرگرت ئەڵێ:
- یەکەم جەژنی نەورۆز لە هەولێرا زۆر بەزەمزەمەو خۆشیبوو، تا
ئێستا هیچ موتەسەریفێك ئەمەی بەکورد رەوا نەدیوە، وا ئەم
ساڵ موتە سەریفی ئەوێ رێیداو ن. هەموو لاوان و عەشایەر
بە سەرپەرشتی عاصم حەیدەری[37] جەژنێکی راستەقینەیان
کردووە خوالێیان پیرۆز کا[38].
لە ژمـارەیێکی تری رۆژنامەی ژین دا پیرەمێرد باسی ئاهەنگی
نەورۆزی ئەوساڵە دەکات لە شاری کۆیەو دەڵێ:
«لەکـۆیـەوە حیسـامـەددین نازەنینی تەفسیلاتی ئاهەنگێکی
نەورۆزی بۆ نووسیوین، جەدوەلێکی ناردووە کە چەند شاعیر
شیعری تیا خوێندۆتەوەو چەند دەستەی گۆرانی بێژ ئاهەنگیان
گەرم کردووە، لە لایـەکـەوە بە دەهـۆڵ و زورنـاو هەڵپەرکێو
لەلایەکی ترەوە بەشمشاڵ و بلوێرو بەیت و باڵۆرەی باپیران و
لاوکی کوردی»[39] نەورۆزی ساڵی ١٩٤٦ دوا یادگاری پیرەمێرد
بوو بۆ نەوەی داهاتوو، چونکە وەك لەمەو دوا روونی دەکەینەوە
ئیتر تاکۆچی دوایی کرد بۆی نەرەخسا کە ئاهەنگی نەورۆز وەك
جاران سازبکـات. بە هەر حاڵ ئەم ئەدیبـە مەزنـە لەشـاری
سلێمانیدا ماوەی چارەکە سەدەیەك بەشیعرو بەنووسین و بە
رۆژنامەو بە پێگەیاندنی قوتابیانی زانستیو بەگەشە پێدان بە
جەژنی نەورۆز سوارچاکێکی بێ وێنە بوو لە گشت بوارەکان دا.

* * *

ساڵی ١٩٤٧ خەم و پەژارە وەك مۆتـەکـە چۆکیبەسەرسنگی
خەڵکـیدا دابـوو، هەورو تەمی مەینـەتی بەری ئاسمـانی
کوردستانی گرتبوو، ماتەمینی لە کوردستانی ئێرانەوە دەکشاو
هەواڵی کۆستی گەلی رادەگەیاند، ئاواتی میللەت زیندە بەچاڵ
کرا، سەدان رۆڵەی کورد لە ئێرانـا بەنـدی زیـنـدان بووە
پیرەمێردی جگەر سووتاو هەفتەیەك پێش نەورۆز لە (ژین)
نووسی[40]:
«مەولەوی، شیعرێکی هەیە ئەڵێ:

**دڵتەنگی و بەهار بێ شەوقیو نەو گوڵ**
**مەلوو لیو گوڵزار بێ زەوقیو بولبول»**

ئەمجـا ئەڵێ: «هـەمـوو ساڵێ لە دەمـەو بەهـارا وەك بولبـول
نەشیـدەی نەورۆزم ئەخـوێنـدو تەدارەکی سەر گردی یارەو

سەیرانی کاریزی شەریف و ١٥٠٠ نان، هەر نانێکی پێنج یا پراخ، ١٢ سەمـاوەر، ١٢ بریانیو گوێزەبانەی مەولوودم ڕێك ئەخـسـت، وا ئەم ساڵ ئاگـری نەورۆز کەوتـە جەرگ و دەروونمەوە، فەتوام دا نەورۆز نەبێ[11] لە هەمووی بە ئێش تر دڵ شکستی ئەم منـدالانەی کەبە هەر کۆڵانێك دا ڕائەبوورم شوێنم ئەکەوتن: [حاجی تۆفیق کەی سەیرانەکەمان بۆ ئەکەی ؟] دەمجوابی ئەو ڕۆڵە شیرینانە چۆن بدەمەوە؟ خوای ئەو بێ گوناهانە دڵان خۆش کا».

کۆتایی و تارەکەشی بە شیعرێکی [وەلی دێوانە] دەهێنێ کە دەڵێ:

**یاران نەوبەهار، یاران نەوبەهار**
**ئەم ساڵ وەبەختم بێ فەر، نەوبەهار**
**زەوقی زیندەگیم بوو بەژاری مار**
**دنیا جەدیدەم چوڵ و تەنگ و تار**

هەتا دەڵێ:

**سەد خۆزگەم بە ساڵ نەوهار پار**
**لەگەڵ گەل و خوێش سەیران گوڵزار**
**بەهاری ئەم ساڵ جەستەم پەشێوە**
**کەس و کارەکەم نایێ لە ڕێوە**

بەو خەمبـاریو ڕەشپـۆشیـەوە، تازێ باری جێی نەورۆزی گرتەوە، جەماوەری گەل بە پیر بانگەوازەکەی پیرەمێردەوە چوون و ئاهەنگ و سەیرانی سالانی ڕابوردوو بۆ نەورۆزی ئەو ساڵە نەگێرا.

بەلام بەرەیەك لە لاوانی ئازادیخوازی خوێن گەرم بەو بۆنەیەوە کۆبوونەوە یەکیان لەسەر گردی مامەیارە پێك هێنا، بەلام لەبەر بارودۆخی کۆماری کوردستان و دڵتەنگی خەڵکەکەو فتواکەی پیرەمـێرد ئەو کۆبـوونـەوە بچـووکـە ناو نەنرا ئاهەنگ، تەنیا کۆبـوونەوەیەك بۆ هەست دەربرین و چەند و تارو شیعرێکی تێدا خوێندرایەوە، لەوانەی بەش داری خوێندنەوەی شیعرو وتـار بوون، خوالێ خۆشبـوو مامۆستاعومەر عارف، شاعیری ناسراو مامۆستا مەلا هۆشیار مامۆستا شەوکەت غەفووربابان کە ئەو دەمە لە پۆلی سێی ناوەندیبوو، مامۆستا د. عیززەدین مستەفا کە قوتابی پۆلی دووەمی ناوەندی بوو.

دوای ئەوەی کە کۆبـوونەوەکە مەبەستی خۆی بەدەستەوەدا، ئەمجا لە شێوەی خۆپیشان دانێك دا هاتنەوە ناو شارو لە نزیك بیناکەی میرزا تۆفیق قەزازەوە بلاوەیان لێکرد،[12].

★ ★ ★

بەلام ساڵی ١٩٤٨ ڕەنگێکی سوور لە ئاسـۆی بڵنـد- کورد، مژدەی بەیانێکی نوێی بۆ گەلی دوورو نزیك دەبرد. نەورۆزی ئەوساڵە کەوتە دوای ڕاپەڕینەکەی کانوون و ڕوخاندنی پەیمانی پۆرتسمـاوث، لەبـەر ئەوە گەورەتـرین ئاهەنگ سازکرا، چەند ڕۆژێکی خایـانـدو لەچـەنـد شوێنێکی شاریش دا گێرا، لە بەغداو کوت و بەدرەو مەحـاویـل و شارەکانی کوردستانەوە نوێنەرانیان بۆ بەشداری ئەو ئاهەنگانە هاتبوون.

پیرەمێردیش بۆ ئەو نەورۆزە سروودە بەناوبانگەکەی بلاوکردەوە

ئەم ڕۆژی ساڵی تازەیە نەورۆزە هاتەوە
جەژنێکی کۆنی کوردە بەخۆشیو بە هاتەوە

ئەو شیعـرەیکـە هەتـا هەتـایـە هەر بەنەمریی دەمێنێتەوەو هەمیشە ملوانکەی زێرینی گەردنی نەورۆزە.

شیاوی باسە کەبرای شاعیر مامۆستا حەمە ساڵح دیلان ئاوازی بۆ داناو لەو نەورۆزەدا بەدەنگی خۆی پێشکەشی کرد.[13]

★ ★ ★

جارێـکی تریش پەڵەهــەوری چڵکن ڕووی ئاسمـانی پۆشی، دەستکـەوتەکانی ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ١٩٤٨ پێ شێل کرا، بەنـدیخانەکان گەروویان بۆ ئازادی خوازان داپچڕی، عورفی باڵی ڕەشی ترسێنەری بەسەر وڵات دا کێشا، لەبەرئەوە نەورۆزی ساڵی ١٩٤٩ بوو بەژێر دەست و پێی حوکمی ئاگرو ئاسنەوە. پیرەمێردوای ئەو خۆشیو شادیەی ساڵی ڕابوردوو دوای ئەوەی کەهیـوا سەر لە نوێ لە دڵیـا چەکەرەی کردبوو... وا جارێکی تریش ئاگری نەورۆزی لێ کوژایەوە. لە ڕۆژنـامـەی (ژین)دا بۆ نەورۆزی بێ نێرگسی ئەو ساڵە ئەم

شیعرەی بلاوکردەوەکە پرۆتستۆی شاعیرێکی خاوەن هەڵوێستە بەرامبەر بە رژێم[1]

**کاری ناچاری‌یە! بێزار لەشەوی ئەم شارەم**
**چەند رۆژێکە بە تۆراوی لە گردی یارەم**
**گردی یارە وەکو ئاتەشکەدەی نەورۆز بوو**
**وا کوژاندیانەوە، سووتاوی ئەو (نار)ەم**
**کەسی‌نی‌یە هامدەمی ناڵەی شەوی بێداریم بێ**
**باری زۆر قورس بووە، دەربەستی دڵی بێچارەم**

ئەو بارە نالەبارەدا ساڵی ١٩٤٩ بێ نەورۆز بوو، نەك هەر لە سلێمانی لە هیچ شوێنێکی کوردستان دا ئاهەنگ و سەیرانی نەورۆز نەکرا.

ساڵی دواییش هەر بە شێوەی ئەم ساڵ بوو، پیرە مێردی مەزنیش بە داخ و حەسرەتەوە لە ١٩/٦/١٩٥٠ ماڵ ئاوایی لە ئەدەب و ئەقەڵەم و لە رۆژنامەی (ژین)و لە نەورۆزکردو بووە میوانی مامە یارە.

★ ★ ★

بەڵام هەرچۆنێ بوو ئیتر نەورۆز چووە دەمارو هۆش و خوێنی میللەتەوە، هەر ساڵێ بوارێ برەخسایە ئاهەنگ و سەیرانی بۆ ساز دەکرا کە ئەوبوارەش نەدەبوو بەنهێنی کۆبوونەوەی نەورۆزە نوقڵ بەشینەوە دەکرا. تەنانەت لەقۆناغی پەنجاکاندا ساڵێکیان لیژنەدار براو لە سەر سنگی گۆیژە بە بەشێوەیەك دانرا کە دوو وشەی دیار بن (نەورۆز) و (کوردستان) بۆ لای ئێوارە لاوان نەوتیان بە دارەکان داکردو دایان گیرساند. بۆ شەوێ هەموو خەڵکی شار ئەو دوو وشەیەیان بە گڕی ئاگر دەخوێندەوە.

حاڵ بەم شێوەیە بوو تا شۆڕشی چوارەی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ کە قۆناغێکی نوێ لە مێژووی ئاهەنگەکانی نەورۆزا دەست پێ دەکات.

من لەم باسەدا توانیم تا ئێرەی بهێنم، بەڵکو یەکێکی‌تر بتوانێ قۆناغی دووەم و سێیەمیشی بخاتە بەر چاو، بە هەر حاڵ لەم باسەدا دوو شتم مەبەست بوو:

یەکەم ـ دەوری پیرە مێرد لە ئاهەنگی نەورۆزدا.

دووەم ـ نووسینەوەی مێژووی ئەو سەیران و ئاهەنگانەی لە شاری سلێمانی دا کراون لە سی‌یەکەوە تا ساڵی ١٩٥٨ هیوام وایە توانیبێتم بە ئەمانەتەوە مێژووی نەورۆزو سەیران و ئاهەنگ و کۆبوونەوەکانیم لە شاری سلێمانی‌دا بە روونی پیشان دابێ[45]

**سلێمانی: سەرەتای کانوونی دووەمی ١٩٨٩**

**سەرچاوەو پەراوێز**

١ـ رۆژنامەی [ژین]، ژ، ٧٣٧، رۆژی ٢٨/٣/١٩٤٤

٢ـ هەمان سەرچاوە

٣ـ مەبەستی لە هاتنە هێلکە، شیعر وتنە، ئەو پلارەی خۆی کردووە بە راوکەو دەیەوێ بۆ نەورۆز بێنە هێلکە، واتە سەرو شیعر بەو بۆنەیەوە بنووسن.

٤ـ ئەسپریزم : مەبەست لە عالەمی ئەرواحە

٥ـ رۆژنامەی (ژیان)، ژ، ٤٣٣، لە ٢/٣/١٩٣٥

٦ـ رۆژنامەی (ژیان). ژ ٤٧١، لە ١٤/٣/١٩٣٦

٧ـ یارە : مەبەست لە گردی مامە یارەیە، کە لەوەودوا لەسەر وەسێتی خۆی پیرەمێرد لەوێ نێژرا

دیار : وڵات

٨ـ کەلووی بەرخ : برج الحمل

٩ـ مەبەست لەوەیە، یەکەم بیتی ئەو خواردەمەنیانەنە بە (م) دەست پێ بکات.

١٠ـ رۆژمامەی (ژیان) ژ، ٤٧٣، لە ٢٨/٣/١٩٣٦

١١ـ لەم بارەیەوە لە ژمارە (٧٣٧)ی (ژین)لە ٢٨/٣/١٩٤٤دا پیرەمێرد دەڵێ:

«چوونە لای موتەسەریفی ئەو ساکە مەجید یەعقووبی بوو شکاتیان کرد، چەرمە سەرییەکی زۆریان داین و قوتابیانی زانستی حەپسکران و غەزمتەکەیان داخستم کەس نەی ئەوێرا بێ بە لاما.»

١٢ـ ژین، ژ، ٦٠٠، ساڵی ١٩٤٠

١٣ـ ژین، ژ، ٦٢٢، ٢٠/٣/١٩٤١

ـ ئەو شیعرەی مامۆستا گۆران کە پیرەمێرد ئاماژەی بۆکردووە سەرەتاکەی بەم دوودێرە دەست پێ دەکات:

به سوورێکی تر ئەستێرەی نیسان گر
قەومی کۆنی خستەوە جەژنی ئاگر

کام قەومی کۆن؟ کام جەژنی بەرزو پیرۆز
قەومی مادی! جەژنی بڵندی نەورۆز.

١٤ـ ژین، ژ. ٦٦٢، ١٩٤٢/٣/١٩

١٥ـ ژین، ژ. ٧٠٥، ١٩٤٣/٤/٢٩

(١٦) مەبەست لە حەپسەخانی نەقیبەکە ئاهەنگ و سەیرانی ئافرەتان بە چاوڕێژی ئەو بووە، وەك پیرەمێرد دەڵێ: تەختگای تایبەتیخۆی هەبووە. شیاوی باسەکە پیرەمێرد بۆ هان دان و پشتگیریی ئافرەتان کۆمەڵی ئافرەتانی دامەزراندووە، خۆی سەرۆکی کۆمەڵە بووەو خوالێ خۆشبوو حەپسەخانی نەقیبیش جێگری سەرۆك بووە.

١٧ـ ژین، ژ. ٧٠٥، ١٩٤٣/٤/٢٩

١٨ـ ژین ، ژ. ٧٣٨، ١٩٤٤/٤/٦

١٩ـ هەمان سەر چاوەی پێشوو

٢٠ـ ژین، ژ. ٧٧٩، ١٩٤٥/٣/٢٢

٢١ـ وا دەردەکەوێ کەمارف جیاوك لە دڵ دا ئەو هەڵوێستەی بێ کەسی بە دڵ بووبێ بە بەڵگەی ئەوەی هیچ بەرپرسیارییەکی بەرەو ڕوو نەکرایەوە.

٢٢ـ مەبەستی لە مامۆستا صالح علیە خوا لێی خۆش بێ کە ئەو کاتە مامۆستای وەرزش بوو لە قوتابخانەی سانەوی سلێمانی

٢٣ـ بەڕێوەبەری پەروەردەی سلێمانی ئەو سەردەمە خوالێ خۆشبوو مامۆستا مصطفی مظهر بوو.

٢٤ـ شیعرەکەی فایەق بێکەسیش دەچێتە نێو ئەو شیعرو نەشائیدە نەمی یەوە کە پیرەمێرد ئاماژەی بۆ کردووە.

٢٥ـ ژین، ژ. ٧٨١، ١٩٤٥/٤/٥

٢٦ـ د. عزالدین مصطفی رسول، گۆڤاری (بەیان) ژمارە (١٢٠)، حوزەیرانی ١٩٨٦ (نەورۆزو چەند یادگارێك)، لاپەرە/٦٦

٢٧ـ کمیان. گۆڤاری (کاروان) ژمارە (٣٠)، ئازاری ١٩٨٥ (نەورۆزو هەموێست). لاپەرە (٢٦). ئەم نووسینە بە قەڵەمی شاعیری هەڵکەوتووی کورد (کامەران موکری) بوو کە بە ناوی (کامیار)ەوە بڵاوی کردبوەوە.

٢٨ـ جیاوك مەبەست لە خوالێ خۆشبوو مامۆستا مارف جیاوکە، کە وەك زانیمان لەنەورۆزی ساڵی ١٩٤٥دا بەش داربوو، بەڵام بۆ نەورۆزی ١٩٤٦ ئەو لە موتەسەریفێتی سلێمانی گوێزرابوەوە، بەڵام پیرەمێرد وەك دۆستێکی ئازیز بانگی کردووە

٢٩ـ ڕۆژنامەی (ژین) ژ. ٨٢٢، ١٩٤٦/٣/١٤

٣٠ـ نەریمان : مەبەست لە ئەدەیب و نووسەر مامۆستا مستەفا نەریمانە، کە ئێستا سکرتێری نووسینی گۆڤاری ڕەنگینە. ئەو کاتە لە کفرییەوە نامەی بۆ پیرەمێرد ناردووەو پیرۆزبایی نەورۆزی لێ کردووە، هەروەها شیعرێکیشی بەو بۆنەیەوە ناردووە کە پیرەمێرد بەڵێنی بڵاوکردنەوەی داوە.

٣١ـ ڕۆژنامەی ژین، ژ. ٨٢٢، ١٩٤٦/٣/١٤

٣٢ـ پیرەمێرد مەبەستی لەوە یەکە لەو ساڵەدا لە شارەکانی تری کوردستان، لە هەولێرو هەڵەبجەو کفری ئاهەنگی نەورۆز گێڕراوە.

٣٣ـ ڕەشۆل : خوالێی خۆشی بێ یەکێ بوو لە دەنگ خۆشە ناسراوەکانی کوردستان جگە لە دەنگ خۆشی بەقسە خۆشیش ناسرابوو.

مەحموود : مەبەست لەکاك مەحموود محەمەد قادرە، یەکێکە لە دەنگ خۆشە بەناوبانگەکانمان، لەچلەکان و پەنجاکانا گەلێك گۆرانی بۆ ئێزگەی کوردی تۆمار کردبوو. کاك مەحموود ئەوساڵە لەتەك ئێمەدا قوتابی پۆلی یەکەمی ناوەندی بوو.

٣٤ـ ڕۆژنامەی (ژین)، ژمارە، ٨٢٣، لە ١٩٤٦/٣/٢٨

٣٥ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو.

٣٦ـ مامۆستا مستەفامەجید، کوری مەجید ئەفەندی عەزیز ئاغایە، ئەو سەردەمە لە هەولێرفەرمانبەری تاپۆ بوو، لەوەودوا بوو بە بەڕێوەبەری تاپۆی سلێمانی ئەمجا هی کەرادە لە بەغدا، پاشان کرا بە پشکنەری دادپەروەری، دوایی بەڕاوێژکار، ئێستا خانەنشینە.
یەکێکە لە ڕوناکبیرە شارەزاکان بە تایبەتی لە بواری ئیشەکەیدا، چەند بەهەرەمێکی بەنرخی چاپ کراوی هەیە.

٣٧ـ عاصم حەیدەری : یەکێ بوو لە ڕوناکبیرە تێکۆشەرکانی هەولێر، بەجوانەمەرگی سەری نایەوە ـ خوالێی خۆش بێ ـ.

٣٨ـ ژین، ژ. ٨٢٣، ١٩٤٦/٣/٢٨

٣٩ـ ژین، ژ. ٨٢٤، ١٩٤٦/٤/١١

٤٠ـ ژین، ژ. ٨٦٣، ١٩٤٧/٣/١٣

٤١ـ پیرەمێرد ئەو فتوایەی بەکارتێك بڵاوکردەوە کە تیایا نووسیبووی:
«ئاگری نەورۆز من هەڵم گیرساندو ساڵان لەگردی مامەیارەبوو، ئەم ساڵ وا لە جەرگمایە! گوڵاڵە سوورەی نەورۆزو گەزیزە لە خوێنی ئازیزە، فتوام دا هەتا تەمی ماتەم نەرەوێتەوە نەورۆز نییە».

٤٢ـ بڕوانە : د. عیززەدین مستەفا ڕەسوڵ، بەیان، ژ ١٢٠، حوزەیرانی ١٩٨٦، ل ٦٧

٤٣ـ بڕوانە (بەیان) ژ. ١٢٠، حوزەیرانی ١٩٨٦، (دوا یادگاری پیرەمێری نەمر): مستەفا ساڵح کەریم

٤٤ـ ژین، ژ. ٩٥٨، ١٩٤٩/٣/١٧

٤٥ـ هەندێ لە ناوەرۆکی ئەم باسەم بە جیا جیا لە ڕۆژنامەی (هاوکاری)و پاشکۆی (عیراق) و گۆڤاری (ڕەنگین) لە مەوبەر بڵاوکردۆتەوە. بەڵام لێرەدا باسەکە زنجیرەییەکی یەك لە دوای یەکە بەیێ زیاد کردن و پشت بە سەرچاوەی زیاترەوە بەستن .

●

# نوێ بوونەوەی سالی کوردیو جەژنی نەورۆز

عمر شيخ الله علي

ـەوە دێرینەکانی سەر گۆیئەم زەوی‌ی مرۆڤ نشینە . هەریەکەیان ـی‌ی نەریتی کۆنی خۆیان چەند جەژنێکی تایبەتی‌یان هەبووەو هەیە . ـ حەژنی ئایینیو نیشتمانیو سەربەخۆیی ...

ـە کوردستانە ئێسكو پرووسكو شوێنەواری مرۆڤی سەردەمی ـی‌ی لێ دۆزراوەتەوە .

ـەوەی کورد لەوەتی ژیانی تەنیایی ناو ئەشکەوتەکانی واز لێ‌هێناوە ـ بۆ پێ‌دەشتەکان هاتۆتە خوارەوە خۆی بە ژیانی کشتوکاڵەوە حەـ ـتکردووە. ئەم ژیانە نۆی‌یە گۆڕانێکی تەواوی بەسەر هەستو ـی‌ـ هێناوە .

ـە ـیەکەوە ژیانە دەرفەتێکی لەباری بۆ رەخساندووە بیر لە زۆر شتی ـ ـ ـەری بکاتەوە .

ـۆقە ژیرو بەتواناکانیان . لە ئەنجامی لێ ووردبوونەوەیەکی قووڵەوە ـ ـە راستەوخۆ پەیکەری مەبەستەکانیان بپێکن . چاك خراپ ـ بیروباوەری نەریت ی جیاجیایان هێناوەتەکایەوە پشتاوپشت ـ ـەوەکە هاتۆتەخوارەوە لەوەتی کورد هۆگری ئایینی نوێ‌ی ئیسلام ـ (١٨ – ٢١) کۆچی لە سەردەمی خەلیفەی دووەم عومەری کوڕی ـ خ .ل) کۆمەڵێ دابو نەریتی نەتەوایەتی پێشووی بەلاوەناوە : ـ ـێکیشیان وەکو چیا بتەوەکانی رۆژگار نەی‌توانیوە کاریان‌لێ‌بکات . ـ جەژنی نەورۆز . دووری‌یە دابونەریتیەکی کۆمەلایەتی زۆری ـ . هەندێکیشیان هەروەك خۆیان ماونەتەوە .

ـ ـەکەشی ئاوخاكو وسرووشتی کوردستان‌بووە . مانەوەو بەردەوامی ـ سال بەسال نوێ دەبێتەوە . ئەم نوێ بوونەوەش بەردەوامی ـەوەی داوە .

خوێندەواری هێژا ئەگەر ئاسۆی‌بیر وەکو پەپوولەبەرهەڵبدەیت بەدوای راستیەکدا بگەرێت کرۆکی بەرەکەی لەم خاکەپیرۆزە چوزەی دەرکردبێ . ئەنجامەکەی‌بیرکردنەوەی هەستی کوردبێ لەئاوخاکی‌خۆی گەشەی ساندبێو پێ‌گەیشتبێو نووسرابێتەوە . کەئەوەمان چنگ نەکەوت بەدوای کەلەپووری نەتەوایەتیماندا دەگەرێین بەلکوشتێکی بە نرخی لێ هەڵدەکرێنین لەگەڵ راستیو باوەری کوردەکە یەك دەگرتەوە .

وارە وارە بژارەی کاکڵی مەبەستەکەمان لەپەندو حیساباتی کوردیەوە دەست پێ‌کرد بۆ گەیشتنە ئەنجامو لە یەکتر گەیشتن چەند گوتەو پەندی شیاوی ژیانی کوردەواری دەکەین بەبەڵگە بەڵکو بتوانین راستیەکی لێ بەدەست بهێنین ئەم چوار وەرزەی سال بەپێ‌ی سرووشتو ئاوخاکی کوردستان . هەر وەرزە کاری گەری خۆی هەیەو ژیانێکی نوێ پەیدا دەکات کورد دەڵێ : وەخت شەرمێ لەوەختێ ناکا .

بەپێ‌ی حیساباتی سێ مانگ سێ مانگەی سالی ئاسایی هەروەرزە سێ مانگ دەخایێنێ ئەوەندە هەیە دوو وەرزی هاوینو زستانکار لە سەر بەهارو پایز دەکەن واتە درێژە بەخۆیان دەدەن . لەتەمەنی بەهارو پایزکەم دەکەنەوە .

کورد دەڵێ : هەتا دەڵێ‌ی بەهار هاوین دیت . وەیادەڵێن :

بەهار بۆ ئەوەندە تەمەنت کورتە ؟ خواغەزەب لەدراوسێ‌ی خراپ بگری . ئەگەر بارانی پەلە زووکەوت سەرمازوو هات ئەوا لە تەمەنی پایز کورت دەبێتەوە . ئەگەر زستانەکە سەرەوەشین بوو . خۆ ئەگەر زستانەکە دواوەشین‌بوو . دیسان ماوەی چەند رۆژێك لەبەهاری دەخاتە ئامێزی خۆشی

ئەگەر لەتەمەنی زستان ووردبینەوە دووری‌یە مانگێك پتر لەسێ مانگە نخایێنێ ئەم درێژەی زستانە کارێکی زۆردەکاتە سەردەرامەتی کوردو کاو ئالیكو پاوانی مەروئاژەلەکانیانەوە .

دیارە درێژەدان نەبوونیو قاتو قووتیو گۆڕان بەسەر ژیانی مرۆڤو ئاژەلو خشۆکەکانیشیان دادێنێ .

هەڵسو کەوتی بەرایی وەکو ئەمرۆ نەبووە دەسەلات داران بتوانن لە هەر کوێ‌یەك بێ بەترومبێلی درێژماوەی هەفتەیەك پێویستی بگاتە دەست .

جاران بەحەچە حەچی کەرێ دزو جەردەیی‌و-رووت کردن ماوەی ئەوەی نەدەدا خەڵك ئەگەرلێ‌ی برا بچێت لەوشوێنانەی دەورو بەری پێویستی خۆی‌ئاژەلەکانی بێنێت . کەنەی توانی گرانیو قاتو قووتی پەیدابووە . قیتارو ترێلەش نەبووە بەچەند رۆژێك لە چوار قوڕنەی دنیایێ شتی پێویستی بگاتەدەست . بۆیەکە گەیشتوونە کۆتایی سالی ووتویانە

خدرو لاس سال خلاس دوادوو هەفتەی سالی کوردیە کۆتایی پێ هاتنی سالی کۆنو نوێ بوونەوەی سالی تازەی کوردیە .

مەترسی ژیان کارێکی گەورە دەکاتە سەر ژیانی مرۆڤی کوردەوە کورد

دەڵێ :

هات چلەی زستانێ داك كیژی خوّی فروّت لوّنانێ .

تا خوّی لە مەترسی نەبوونی‌و برانی ئەم وەرزە ، خوّی‌پێ رزگار بكات .

وەیا كورد لەپەندێكی تردەڵێ :

رەشەمەرەشكی رووا بەتاڵ دەكا جەوارو كەندووا ، بەشەردێنی بووك‌و خەسووا .

ئەم پەندە برانو نەمانی ئازووقە پیشان دەدات .

وەیا لەپەندێكی تر دەڵێ :

جوّتیار ژنێ لە رەشەمەی تەراقەدا ، لەئادارێ مارەی دەكاتەوە ژیان ئەوەندە لە جووتیاری كورد خوّ وێك دینێتەوە ، هاوبەشی ژیانی پێ بەخێونەكری‌و بەرێوە نەچێ ، هیچ بەدی ناكات چ بكات ، ناچار مایەی خوّشی كەژنەكەیەتی بەناچاری دەستی لێ بكاتەوە چ تەنگیەك لەمە پر مەترسی تر دەبێ .

لاس دواهەفتەی زستانە چوار روّژ بەر زستان دەكەوێت سێ روّژی بەر بەهار دەكەوێت ، ئەم سێ روّژەپیّ‌ی دەڵێن جوّرك هاوێژ كە دەكاتە (۱۸ - ۱۹ - ۲۰) ی ئادارێ مەبەست لە جوّرك هاوێژ ئەوەیەكە ئەم سێ روّژەپیّ‌ی دەڵێن جوّرك هاوێژ ئەوەیەكە ئەوانەی دەچوون بوّ دەرەوەو سەردانی خزمان لەرێگا جوّركی كاو ئالێكیان نە دەبرد لە گەڵ خوّیانە ، وولاغ تێر دەخوات . كە دواروّژی چلە نەما (٤٥) چركە روّژ درێژدە بێتەوە لەم روّژەوە دەبێتە بازە بەران واتە شەو وروّژ (٥ر۱ - ۲) چركە زیاد دەكات . پەنگری یەكەم دەكەوێت ، دووەم پەنگر لە (۱۸)ی ئادارێ دەكەوێت ، سێ‌یەمیان لەسەری ئادارو نیسانی دەكەوێت .

سەیركە لە جوّرك هاوێژ كە لە (۱۸)ی ئادارەوەیە چەند پەند ووتراوون :

(۱۸) لە ئادارێ مەلكەزەن دینەخوارێ دەنگ دەكەن لەبوارێ .

(۱۸) لە ئادارێ بەفر بكەوی هەتا گێ‌ی دارێ ، نامێنێ هەتا ئێوارێ .

(۱۸) لە ئادارێ مەی‌گرە بە بوارێ .

خوێندەواری بەرێز بەحیسابی كێلەشین - كوێستان - نەوروّز ، زستانو بەهار لێك نەبوونەوە تانەگاتە (۲۱)ی‌مانگی ئاداری كەهیچ مەترسیەك نەمێنی

لەم دەشتی گەرمیانە بەپێ‌ی حیساب گرانی گەرمێن دەی‌كەن‌بە بەهار جاروایە ساڵەكە هوّش دەبێ زووبەهارێكی خوّش دێت ، جارێكیان خێڵی بندیانو مەرزان لەم دەشتی هەولێرە دەچنە دەشتی كاولە قەراجی هەواریان نوێ دەكەنەوە ، پەنیرو ماست‌و لوّر كراشەی دەكرد . ساڵیان لێ دەگوّری دەیكاتە بەفرو زریان مەرو ماڵاتەكانیان قڕ دەبێ دەمیان ووشك دەبێ .

ئەم رووداوە بووە بەپەند دەڵێن :

بەبندیانو بەمەرزان هەریان كردە هیشكەنان .

لەئێوارەی (۲۱)ی ئادار دنیا دەگوّرێ ئەوی گیان لەبەروبوونەوەرە دێنەدەرەوە ، زستانو بەهار لێك دەبێتەوە ، مەترسی ژیان نامێنێ ، ساڵی نوێ دەست پێ‌دەكات .

ئەم جەژنی نەوروّزە ، جەژنێكی نەتەوایەتی كوردە ، گشت ساڵێك كورد یادی دەكاتەوە ، ئەم جەژنە بەندە بەنەتەوەی كورد ، تاكوردمابێ ئەویش هەر دەمێنی‌و لەبرەودا دەبێ .

هەر چەنداوەكی دەسەلات داران وفەرمانرەوایانی‌نەتەوەكانی كوردیان لەگەڵ دەژین‌و دەسەلاتیان بەسەردا زاڵە ، ناوە ناوە بەرهەڵستی ئەم جەژنە پیروّزەیان كردووە ، بەلام ئەنجامی هەر مایە پووچی‌و بێ نرخیان بوّماوەتەوە .

بەڵێ هەموو ساڵێك سەر لە نوێ بەهارێكی نوێ ، ژیانێكی نوێ دەژیێتەوە گشت‌بوونەرێكی بەم لاو بەولادا پەردەی لێ‌دەكەن ژیانێكی تازە سەرلەبەر دەگرنەبەر ، ساڵێكی نوێ دەخرێتە سەر ساڵەكانی پێشوو .

ئەنجام

۱ ئەم جەژنی نەوروّزە پەیوەندی بە ئاوخاكەوە هەیە میللەتەكەی لە ئاكامی تاقی كردنەوەی مێژوویێكی دووروو درێژ هێناویەتە كایەوە .

۲ - بێجگە لە گەلی كورد ، گشت گیان لە بەران وخشوّكەكانی ئەم كوردستانە دێنە دەرەوەو دەبوّژێنەوەو خوّشی سەرلەنوێ هەموو لا دەگرتەوە .

۳ - كورد دەڵێ :

خدزو لاس ، ساڵ خلاس . بەئاشكرا كوّتایی هاتنی زستانو هاتنی ساڵی نوێ نیشان دەدات .

٤ - هەرەوەزو كوّشش كردن لەمەترسی‌یەكی گەورە كەزستانی سەختەو خەڵك بەكوّمەڵ لەبرسان دەمرنو ئاژەلەكانیان قڕدەكات ، بەهاری نوی رزگاریان دەكات .

٥ - باڵندە گەرمەسێرەكان دەگەرێنەوە .

پەراوێز

* وشەیەكی لێكدراوە بە واتای روّژی نوێ - روّژێكی نوێ لە ساڵی نوێ بووەوە دێت ، ئەم ووشەیە(نەو) لەفوّلكلوّر بە كارهاتووەو دێت‌وەك :

باران كام باران فەسلی نەو بەهار كەمار (لێ) دەچووبوّخوار .

بووەبە - نوێ ، نوو ،نی هەر بەیەك برگە ماوەتەوە .

ووشەی . روّز - بووەبە- روّژ ، خوّر ، هور - زمانیش بەریاسای گوّران دەكەوێت .





# ئەمڕۆ

● لطیف بەرزنجی ●

**ئەم پارچە هەڵبەستە لەگەڵ چەپکە گوڵی ڕەنگینی کەژو کێوە سەختەکانی کوردستان پێشکەشی هەموو کوردێکی نیشتمان پەروەری دەکەم، بەبۆنەی جەژنی نەورۆزەوە، ئومێدەوارم هەموو لایەك بەخۆشیو شادی بەیەك بگەینەوە..**

ئەمڕۆ گەلی کورد ڕۆڵانی کاوە
لەپاڵ سەنگەری سەختی ئەو پیاوە
وا لە مەیدانی شۆڕە سوارانا
لە کەژو کێوی دەشت و گەرمیانا
لە شوێن هەواری پاڵەوانانا
لەلوتکەی بەرزو، هەردەو تەلانا
لەجێی ئاوایی‌و، شاری ڕووخاوا
کەلاوە کۆن و، کەپری سووتاوا
لەناو باژێڕو، لادێی جارانا
دارو دەوەن و، لە باخەکانا
لەگوێ ڕووبارو، چەمو چنارا
لەکانی‌و تاڤگەی دۆڵو بنارا
لەگۆڕستانی جوانە مەرگانا
لەبێشەو لانەی بێچووە شێرانا
ڕمی عەگیدو، گورزی گرانا
خەنجەری دەبان، تیرو کەوانا

●★●★●

لەسەرئێسقانی کەللەی جەنگاوەر
ناڵ و بزماری سوپای تێکۆشەر
لەناو لەشکری دلێرو ژیرا
لەڕێی ڕزگاری کۆت و زنجیرا

●★●★●

بۆ سەربەخۆیی گەلی چەوساوە
هەزاران ڕۆڵە قوربانی داوە
ئەو خوێنە گەشەی لەوێ ڕژاوە
مژدەی سەربەستی بۆ کورد هێناوە
لەجێی ئەو خوێنی ڕۆڵە کوژراوە
شۆڕشی کاوە دیسان ژیاوە

●★●★●

چاڵە خەڵووزی بەرووی سووتاوە
ژیلەمۆی کورەی ئەوسا گەشاوە
ئاگری «نەورۆز» هەڵگیرسایەوە
لەکوردستانا شەوقی دایەوە
بەفرو سەهۆڵی کێو توایەوە
نیشتیمانی کورد وا رازایەوە
گوڵاڵە سوورەی لێ روایەوە
کۆچەر لەکوێستان هەڵیدایەوە

●★●★●

سەوزی پۆشیوە کەژو کێوانی
مێرگی رەنگینی، بەهاری جوانی
زرمەی رەش بەڵەک، شایی شێخانی
چریکەی مەل و، دەنگی گۆرانی
بەیادی جەژنی «نەورۆز»ی کاوە
ئەو رۆژەی قەڵای زۆردار رووخاوە
ئاهەنگ نەگێرێ گەلی کوڵ نەدەر
کوردی ئاوارە، هەژار دەربەدەر
لەگەڵ «نەورۆز» ئاشتی بێتەوە
شەر با نەمێنێ و، سەر بنێتەوە
کارەساتی وا نەبینرێتەوە
خوێنی لاوەکان با نەرژێتەوە
گیراو، لێقەوماو بگەرێتەوە
دەروازەی خۆشی بۆ نەکرێتەوە؟
جگەر سووتاوان یادکرێتەوە
رەش پۆش و داماو رۆژی بێتەوە
وڵات ئاوابێ و، نەشێوێتەوە
تەپڵەکەی شادی لێ بدرێتەوە
کورگەل با بەزمێ بگێرێتەوە
ئاگرێکی تر هەڵگیرسێتەوە
ئازارو «نەورۆز» تێکەڵ بێتەوە
زەماوەن دەستی پێ بکرێتەوە
زورناو دەهۆڵێ بکوترێتەوە

هەورەکەی ماتەم برەوێتەوە
ئەو کەژو کێوە هێمن بێتەوە
خەمی چەن ساڵە لە بیر چێتەوە
کۆتری ئاشتی بنیشێتەوە
کەو لە شاخەکان بخوێنێتەوە
راوچی کەل و پەل بگوازێتەوە
هیچ داوی تازە دانەنێتەوە
مەل ئاسوودەبێ، راو نەکرێتەوە
هێلانەکانیش تێک نەچێتەوە.

●★●★●

جووتیار با دیسان بجووڵێتەوە
باخی بێ خاوەن زیندوو بێتەوە
کشت و کاڵ دەستی پێ بکرێتەوە
بەیار . نەمێنێ و، بکێڵرێتەوە

●★●★●

لەجێی ئەو تۆپەی ئەتەقێتەوە
بەیداخی شادی بشەکێتەوە.

●★●★●

**خوێنەری ئازیز:**

ئەم هەڵبەستەم کە بە بۆنەی بیرەوەری جەژنی نەورۆزەوەیە، پێشکەشی دەکەم بەو کوردە ئاوارەو دەربەدەرانەی کوردستانی ئێران کە لە پێناوی خەباتی شۆرشگێرانەیاندا شارو دێهاتەکانیان رووخاوە، وێران کراوە؛ لە ئاشتی و بەختەوەری بێبەش بوون.

هیواخوازم دوای کۆتایی هاتنی شەر، ئاشتی و سەربەستی و هێمنی هەموو سووچێکی وڵات بگرێتەوە، دیل و گیراو لێقەوماوەکان بگەرێتەوە باوەشی خێزانەکانیان و، شارو دێهاتەکانیان زیاتر رازاوەو ئاوەدان بێت و، دۆستایەتی و برایەتی و ئاشتی و خۆشەویستی باڵی بەسەر هەموو نیشتمان پەروەرێکی بەوەفاو دڵسۆزدا بکێشێ.

○

# ئەی وەتەن

ساکار بەرزنجی

چەنـد هەژارو دەربەدەربم هەر ئەتـۆی تاجی سەرم [1]
تـا ماوم لەژیـانـا هەر بۆ تۆ کڕنـوش بەرم
ی وەتـەن دڵسـۆزی تۆمـە وا مەزانـ، خامـۆشم
ێنـاوی شادی تۆیـە من بەبێ مەی سەرخـۆشم
خاو ی سەرو سامـان نیم لە کاتـی پێـویـستیـە
قی منـە مەشقی شیعـرو ئاواتی سەربـەستی‌یە
تێهـەڵدان و دەربـەدەری لەگـەڵ من سوودی نی‌یـە
ئاشـتـی‌خـوازە گەلی کوردم بزانـن عشقی چی‌یـە ؟
چەنـد کەسـادو بەنـدەدەست بم لەخەبات باکم نی‌یە

چونکـە کوردم لە «ئـێرانـا» پێم ئەڵێن مافت چی‌یـە؟
بۆ خەبـاتـی کوردو عەرەب ئاواتـم بەختـیـاری‌یـە
ئاشـکـرایـە برایـەتی ئەی‌ڕەقیب بەڵگـەی چی‌یـە!
سەربـەرزی‌یـە کە دەبینم لاوی کورد پێشکـەوتی‌یـە
شادومـانـم گەر ببیـنـم نیشـتـمـان لە خۆشی‌یـە
لێم بیـورن کەس و کارم پێم مەڵێن نووسـین چی‌یـە؟
مەشخەڵی دەست لاوی کوردە ئاسۆی وا ڕۆن کردی‌یە
هەر خەبـاتی سەخت و توونـدە ئەنجـامی ئازادی‌یـە
بەرهـەم خوێنی شەهیـدانـە چاوەڕوانی شادی‌یـە.

# دیوانی کاروانی ساڵی شەشەم خوێندەوە

**کەریم مستەفا شارەزا**

«دیـوانی کاروان»ی ساڵی شەشەمم خوێندەوە، کە لە ژمارەکانی [٦٠، ٦١، ٦٢، ٦٣، ٦٤، ٦٥، ٦٦، ٦٧، ٦٨،]دا بەرچـاو دەکەون و، لەئەنجامی خوێندنەوەو لێوردبوونەوە لە هۆنراوەکانیان دا، هەندێ سەرنج و تێبینی‌ی گشتیم لەلا گەڵاڵە بوون و، لێرەودوا بەپێی ژمارەی گۆڤارەکە دەیان خەمەڕوو.

لە سەرەتــادا دەبێ ئەوە بڵێم کە دەربــڕینی سەرنــج و تێبینی بەرامبەر بەم هەموو هۆنراوانە، کارێکی ئەوەندە سووك و ئاسان نی‌یەو، بەم چەند لاپەڕەیەو بەم کارە خێرایەو هەڵسەنگاندنە گورجەم کردارێکی ڕەخنــەیی تێرو تەســەڵ ئەنجــام نادرێ، تەنهــا مەگــەر بتــوانم هێڵە سەرەکــی‌یــەکــانی دەستنیشــان بکــەم و، بەپێ‌ی توانست و ماوەی نووسینەکەم هەڵسەنگاندنێکی خێرای هۆنراوەکان ئەنجام بدەم.

بۆ ئەوەی پێـوانــەیـەکی دیـاری‌کـراو، بۆ ئەم هەڵســەنگاندن و نرخــاندنەی هۆنراوەکان دەستنیشان بکەم، وا چاکە ئەم پێشەکی‌یە لە بارەی پێکهاتنی شیعرەوە بخەمەڕوو، تاکو خوێنەری بەڕێزو شیعردۆ به شێـوەیــەکی سووك و ئاســان بزانن شیعر چی‌یەو ڕەگەزو کەر سەرەکی‌یەکانی چین و شاعیران لە شیعردانانی ئەمڕۆیان دا ڕەچا هەل و مەرجێکی شیعر بکەن؟ لە وەڵامی ئەم پرسیارانەدا دەڵێم:ـ

شیعـر چڵێکی سەوزو ناسکی ئەدەبەو ئەدەبیش لقێکی گ گوڵی هونــەرەجـوانــەکانە. کەواتە پێش هەموو شتێك، شیعر هونا جوانــەو، دەبێ لە وتــەو دەربــڕینی ئاسایی هونەریی‌ترو جوانتر لەکاتی خوێندنەوەی یاگوێ‌لێگرتنی‌دا هەست بەو جوانی‌یەی بکا ئەو جوانی‌یــەش پێـوانــەیـەکی دیـاری‌کـراوی نی‌یە، بەڵکو شا هونــەرمــەنـدیی‌و بەهرەی خۆی لە ناو شیعرەکەی‌دا دەخولقێنێ شاعیرە بە پێوانەیەکی تایبەتی خۆی ئەو کارە هونەریی‌یە ئەنجام دە

ئەمڕۆ شیعر لە قاڵبی ئەو چەمکە دەرچووە کە دەگوترا، ووت بەکێشی سەروادارەو، مانــاییکی جوان دەبــەخشێو لەســۆزو ه شاعیرەوە هەڵدەقوڵێو کاردەکاتە سەر هەست و سۆزی خوێنەرو

بەڵکو شیعر گەلێك لەمە قووڵترو ناسکترەو، دەربرینێکی جوان و ناسك و پڕ سۆزو جۆشش و خورپەی دڵی شاعیرەو زادەی ئەندێشەی قووڵیەتی، دوای ژان و هەژانێکی کاریگەر لە لاشعوورەوە سەرهەڵدەدات و بە مێشك و هۆشیدا دێ‌و، بە ڕەمـزی ووشــەو ڕستــەو دەربــڕینی جوان و پڕمانا هەڵدەڕژێ‌و لەچەند دێڕێکی ئاوازەداری سرووشت بەخش خۆی دەنوێنێ.

لە لای هەموو شارەزاییێکی شیعری کۆن و نوێش ئاشکراو ڕوونە کە شیعر وەك دراوێکی دوو دیو وایە، دیوی یەکەمی ڕوخسارەو دیوی دووەمیشی ناوەڕۆکەو هیچ کامێکیان بێ ئەوەکەی تریان شیعر پێکەوە نانێن و، دەبێ ڕووخســارو ناوەڕۆك لەجـوانی‌و پتـەویدا لێکتـر بوەشێنەوە. ڕوخســاری شیعـر ووشەو دارشتنی گشتی‌و کێش و مۆسیقای ناوخۆو هەنــدێ جاریش سەرواش دەگـرێتــەوە کە ئەمیش ئاوازێکی خۆش بۆ ووشــەی دوا دێـڕەکــان دەخوڵقێنێ. ناوەڕۆکیش ڕەگەزی واتاو بیرۆکەو سۆزو ئەندێشەو جوانی‌و وێنەی شیعریی دەگرێتەوە.

هەرچەندە مەیدانی هەڵسەنگاندنەکەم گەلێك بەرتەسکەو لە توانادا نی‌یە ئەم هەموو هۆنراوانەی دیوانی ساڵێکی کاروان کە ژمارەیان دەگاتە [٨٩] هۆنـراوەی کورت و درێژ، بە تەواوی هەڵسەنگێنم و نرخی ڕەوای خۆیـان پێبدەم، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا دەبێ هەندێ لایەنی سەرەکی ڕوخساری شیعرەکان و ناوەڕۆکیان هەر بخەمە بەر نووکی خامەو ئەگەر بە کورتیش بێ، دەبێ هەندێ لایەنی گەشی لە لایەنی ڕەش و ئاڵۆزیی کارە هونەرییەکە جودابکەمەوەو بیخەمە سەر ڕووپەڕی هەڵسەنگاندنەکەم.

من دەمــەوێ بە تەرازووو پێـوانــەی شیعری نوێ‌و ڕەسەن ئەم هۆنراوانە هەڵسەنگێنم، ئەو نوێ‌و ڕەسەنەی کە لە خزمەتی ژیانی ئەوەی نوێ‌و هیـواو ئاواتی ڕۆڵەکـانی نەتەوەو زۆربەی میللەت دایەو، لە لای ڕەخنــەگــرە نوێخـوازەکــان بە نوێ دادەنــرێ، هۆنراوەکان بە کورتی هەڵسەنگێنم و نرخی شیاوی خۆیان پێبدەم.

لە کاتی خوێندنەوەو هەڵسەنگاندن دا، چاوم بە گەلێ جۆرە شیعر دەکەوێ، شیعـر هەیـە کلاسیکی‌یەو هێشتا چوارچێوەی ئەم ڕێبازەی نەشکاندووە، کەچی لە ماناو هێزو پتەویی دارشتنی‌دا ئێستاش تین و ووزەی تێدایەو، ناسکی‌و پتەویی‌یەکەی جێ‌یان بۆ لە دیوانی کاروان دا کردۆتــەوە. هەنـدێ هۆنـراوەی ڕۆمانتیکیش لەم دیوانەدا جێی خۆیان کردۆتــەوە، چونکــە زادەی سۆزو ئەنـدێشــەی سەرەڕۆی شاعـیرن و چۆراوکەی جوانی سروشت و خورپەی دڵن. شیعری ڕیالیزمیش بە هەموو لق و پۆپــەکـانی‌یــەوە هاتـۆتــە ناو دیــوانی کاروان و خۆی لەڕیالیزمی ڕەخنەگری‌و ڕیالیزمی‌نوێ‌دا دەنوێنێ.

ڕەمـز وەك کەرەستــەی شیعری نوێ ئەمڕۆ شوێنێکی دیاری لە بنیـاتی‌دا داگـیرکـردووە، بۆتـە کارێکی هونـەریی‌و ئەدەبی بەنـرخ بۆ خوڵقاندنی مانای پتەوی سروش بەخش. بە مەرجێ ڕەمزەکان بەهێزو پتەوبن و مانای گەورەو ڕووداوی کاریگەریان لەدواوە بێ، نە بادا ببنە مایەی دروست کردنی تەم و مژێکی خەست و مانای شیعرەکە ئاڵۆزو نادیاربکەن.

ئەگەر شاعیری نوێخواز ویستی لەبواری ئەدەبی بەراوردکاری‌دا تاقی‌کردنەوەی شاعیرێکی بیانی بگوێزێتەوە بۆ شیعری کوردی، دەستم دامێنی نەکـا کت ومت وەری‌گـرێ‌و دایـڕێـژێتــەوە، بەڵکـو کاتێك ئەو تاقی‌کردنەوەیە بکات، کە بیرو ئەندێشەی دێنێتەوە بۆ کوردستان و بەناو ئاسمـانی بێگــەردی‌دا پەروازدەکــەن و، کەرەستەی ووشەو دەربڕینی جوانی خۆمــاڵی‌و لێکچواندن و خواستنی گونجاوی بۆ پێکەوە دەنێ‌و بە گیانی نەتەوەیی خۆی ئەنجامی دەدات، تاکو ببێتە کاڵای باڵای ئەدەبی نوێی کوردی‌و تام و بۆی بێگانەی لێدوور بخرێتەوە.

لە کاتێ هەڵســەنگاندنی هۆنراوە تاکو پێم بکرێ لەشیعر دەدوێم نەك لە شاعیر، چونکە شاعیر هەر کێ‌بێت و هەر چۆن بنووسی، هەر شیعر بە زمـانی نەتــەوەکــەی خۆی دەهۆنێتەوە، زمانی نەتەوەش بریتی‌یە لە ووشەو ڕستەو ماناکانیان، خۆ ئەگەر شیعرەکەی بڵاوکرایەوە، ئەوا دەبێتە موڵکی میللەت تەنیـا سۆزو ئەنـدێشەو ناوەکەی بۆ شاعیر دەمێنێتەوەو ڕەخنــەگـر بۆی هەیـە بەپێی ووشــەو دەربــڕینــەکـانی، هۆنـراوەکــە هەڵســەنگێنێ‌و بزانێ چ مانایێك دەبەخشێ، ئەوە حیسابەو، ڕاڤەکردنی تایبەتی شاعیر بۆ بەرهەمی خۆی ئەوەندە گوێی پێنادرێ‌و، ئەگەر شاعیر گوتی: [مــەم وزین بولبــول و گوڵن] ئەوا هەر ئەو مانایە هەڵدەگرێ کە لەخۆشەویستی‌و هۆگری یەکتری‌دا [مەم بولبولەو زینیش گوڵە]و شاعیر بۆی نی‌یە بڵێ مەبەستم شتێکی ترەو چونکە زمانی نەتەوە هەر ئەم مانایەی لێهەڵدەستێنێ.

لە کۆتایی ئەم پێشەکی‌یەم دا دەمەوێ لە مەسەلەیەکی گرنگی ئەم بوارەی هەڵسەنگاندنی شیعرەکانەوە بدوێم، ئەویش مەسەلەی [کێش]ە، کێش ڕەگەزێکی زۆر گرنگی هونەری شیعرە، هەر ئەمەشە لە پەخشانی جودادەکــاتــەوە، جاران شیعری نووسراوەی کوردی لە ڕێگەی شیعری عەرەبی‌و فارسی‌یەوە، بەحرو کێشی عەرووزی عەرەبی بە خۆیەوە دیبوو بە (تفعیلة) دەکێشراو، بەپێی برگــەی کورت (ب)و برگــەی درێژ (-) ئەو (تفعیلة) یەیش دەپیورا. کەچی لە دوای جەنگی یەکەمی جیهانی‌یەوە، کێشی خۆمــاڵی کە کێشی پەنجــەیەو، لەسەر (تفعیلة)ی بەحری عەرووز ناڕوات و بە تڕپەو ئیقاع دەپێورێ، لەسەر دەستی نووری شێخ ساڵح و گۆران و پیرەمـــێرد لە شیعـری فۆلکلۆری کوردی‌و شیعـری میللی‌یــەوە بوژێنـرایــەوەو، شیعـری نوێی کوردی پێدانراو، هەنگاوی دووەمیش بەکارهێنانی کێشی کورت و درێژبوو لەهۆنراوەیەك دا. ئەمەش لەو جۆرە

شیعرانەدا خۆی نواند کە پێی دەگوترێ [شیعری ئازاد] ئازادی شاعیریش لە بەکارهێنانی کێشێکی پەنجەو بەشەکان و چەند جارەکانیان -ایەو، ئەمڕۆ شاعیری کورد گەلێ جۆر لەو کێشە خۆمالییانە بەکاردێنێ وەکو ئەمانە:ـ

١. کێشی (٦) بڕگەیی (٣+٣) و شاعیر بۆی هەیە لە کۆکردنەوەی چوار جار (٣) بڕگە (٣+٣+٣+٣) کێشی ١٢ بڕگەیی پێك بێنێ.

٢. کێشی (٧) بڕگەیی (٤+٣)و شاعیر بۆی هەیە (٤) بڕگەی تریشی بخاتەسەر (٤+٣+٤)و کێشی (١١) بڕگەیی پێکەوە بنێ‌و بە کۆکردنەوە (٧+٧)یش کێشی ١٤ بڕگەیی پێکەوەبنێ.

٣. کێشی (٨) بڕگەیی (٤+٤)و شاعیر بۆی هەیە لە کۆکردنەوەی ٣ جار ٤ (٤+٤+٤) کێشی ١٢ بڕگەیی دروست بکات و بۆیشی هەیە (٤) بڕگەی تریشی بخاتەسەرو بیکەیەنیتە (١٦) بڕگەیی (٤+٤+٤+٤)و بە کۆکردنەوەی (٤+٤+٥)یش کێشی ١٣ بڕگەیی پێکەوەبنێ. (٤) کێشی (١٠) بڕگەیی (٥+٥)و شاعیر بۆی هەیە بە خستنەسەری (٥) بڕگەی تر، کێشی (١٥) بڕگەیی دروست بکات.

ئەمانە هەموویان کێشی خۆماڵی کوردین و بە پەنجە دەپیورێن و، شاعیر ئازادە لە بەکارهێنانی هەر کامێکیان و، ئەوەی بەلامەوە گرنگەو دەمەوێ شاعیرە لاوەکان ئاگاداری‌بن ئەوەیە، نابێ لە هۆنینەوەی پارچە شیعرێك دا، کێشی هەمە جۆری جیاواز بەکاربێنن، واتە: ئەگەر دەستووری کێشی (٨) بڕگەیی (٤+٤)ی بەکارهێنا، ئەوا بۆی هەیە کێشەکانی بکات بە [٤، ٨، ١٢، ١٦] بەپێی هەناسەو مانای دەربڕینەکانەوە بەڵام نابێ بچێ لە هەمان پارچەدا دەستووری ١٠ بڕگەیی (٥+٥)و (٧) بڕگەیی (٤+٣)یش بەکاربێنێ بڵێ من ئازادم لە بەکارهێنانیان، چونکە موسیقای کێشی دێڕە شیعرەکان تێك دەچن و کێشی گشتیان دەدۆڕێ. ئەم بەکارهێنانەی پتر لە دەستوورێکی کێش لە هۆنراوەیەك دا لەو کاتەدا دەبێ کە هۆنراوەکە چەند بەندو بەشێك بێت و لەهەر بەشەی‌دا بۆی هەیە دووەیوە دێڕی یەکەمی ١٢ بڕگەیی بن و دوو نیوەی تری ١١ بڕگەو دووانی تری ٧ بڕگە بێ‌و بەم جۆرە لە هەر بەشێکی‌دا ئەم دەستوورە دووبارە ببێتەوە. ئێستاش بە پێی ئەم هەل و مەرجانەی کە خستمانە‌ڕوو، دەکەوینە سەر هەڵسەنگاندنی هۆنراوەکانی دیوانی کاروان.

## دیوانی کاروانی ژمارە (٦٠)

١. یەکەمین هۆنراوەی دیوانی ئەم ژمارەیەی کاروانی ساڵی شەشەم، پارچە شیعرێکی دوکتۆر (عیزەدین مستەفا ڕەسووڵ)ە، بە ناونیشانی (کاروانی ئێمە)یە، یادی شاعیرە ناودارەکانی کوردی وەکو [نالی، سالیم، سائیب، ناتیق، سەلام، مەحوی، گۆران، مەولانا خالید، کوردی] بە چەند ئیشارەتێك لە ناو هۆنراوەکەی‌دا تۆمارکردووەو لەسەرەتاکەی‌دا دەڵێ:ـ

وا بەهارەو لێشاوی چاوی ئەم خەکە
هەمووی ئاوی شیوە سوورە
هێشتا گەمی‌یەی سلێمانی
شوێن فەنەری
دەریای خوێنی شارەزوورە !

ئەگەر ئەم پارچە هۆنراوەیەی دوکتۆر پرۆژەی تاقی‌کردنەوەیەکی گەورەتر بوایە، ئەوا بێ‌گومان کردارێکی ئەدەبی نایابی پێکەوە دەناو تاسەی شیعری ڕەسەنی کوردی شیعرناسانی باشتر دەشکاند. چونکە هەر لەم چەند دێڕەدا سۆزو هەستێکی یەکجار ناسکی خوڵقاندووەو سەرنجی خوێنەرانی پێ‌ڕاکێشاون.

٢. ئافرەتێك بە چرپە ووتی: هۆنراوەیەکی خۆشکە (کەژاڵ ئەحمەد)ە، دەتوانم لە شیعرە چاك و سەرکەوتووەکانی شاعیری ئافرەتی کوردی بدەمە قەڵەم، چونکە شاعیر ئافرەتەو زۆر بە جوانی لە خەم و ئازارو گیروگرفتەکانی ئافرەت لە کۆمەڵی کوردەواری‌دا دەدوێ، هۆنراوەکە سەرتاپای جوان و ناسك و سەرکەوتووەو کێش و موسیقای شیعرەکانی سوارو ئاوازەدارن لە بەشێکی هۆنراوەکەی‌دا بە شاعیرە نێرینەکان دەڵێ:ـ

من نشتمانێکی سەوزم
چەندان ساڵە بەسەر جوانیما هەڵئەدرێ
پێنووسەکانتان بشکێنن
کەس وەکو خۆم
مێژووی بوونم تۆمارناکاو
ڕۆمانی خەمم نا نووسێ !!

٣. مەلا مەسعوود بێ‌بەش هەڵبەستێکی (ئەحمەد موختار جاف)ی کردووە بە پێنج خشتەکی‌و بەجوانی لە هونەرەکەی‌دا سەرکەوتووەو دێڕە شیعرەکانی خۆی بەجوانی لەگەڵ شیعرەکانی شاعیری یەکەم گونجاندووە. لەسەرەتای کارە هونەری‌یەکەی‌دا دەڵێ:

خومارو مەستی دوو چاوی سیاتم
سوتاوی ئاگری عەشق و جەفاتم
لە دوور هاتووی غەریبی دوور وڵاتم
دەمت بێنە بە قوربانی وەفاتم،
قەبووڵە من لە جێی مووچەو بەراتم!

هەست دەکەین شیعری هەردووکیان لە بارەی کێش و سەرواو ناوەڕۆکەوە زۆرو جوان و لێك وە شاوەن و بە دەگمەن نەبێ ووشەی ناسازیان تێدانی‌یە.

٤. نازە شیعر: چوار برووسکە شیعری شاعیری لاو کاك [نەوزاد عەلی ئەحمەد]ە، هەواڵدانێکی باشە بۆ شیعری نوێ نووسین، چونکە لەم هەوڵەی‌دا وزەی شیعریی تێدایە. لە پارچەی سێیەمی‌دا کە بە ناوی مرۆڤە دەڵێ:ـ

مرۆڤیت و
عەشقت هەنگاوی ئەمڕۆمە
کە تۆ هاتی
دەستیان لە مردنم هەڵگرت!
لە خەڵوەتی شەوانەدا
گۆڕ دەستی لە ژیانم شوشت !!

٥. لێڤە نابم: هۆنراوەیەکی کاک [ئیسماعیل تەها شاهین]ە، شاعیر هەوڵێکی زۆری داوە، ڕەمز و کەرەستەی کەلەپووری ئەدەبی کوردی تێکەڵاو بە دەربڕینی نوێی شیعرەکەی بکات و (مەم وزین) و (وەلی دیوانەو شەم)ی کردووە بە کەرەستەی بەهێزی هۆنراوەکەی و دەڵێ:ـ

م دگۆت و دیسان دبێژم
زینا مەم سەوداسەر کری
ئاڤا مەزن باخیڤت
شەما دیوانەیێ ڕەبەن
خستی بەندا جاف و گۆران
شەرمە ب خەملا وان بستریم .

ئەوەی سەرنجی خوێنەر ڕادەکێشێ ئەوەیە شاعیر کێشی دێرە شیعرەکانی دەگۆڕێ و لەنێوانی کێشی ٨ برگەیی (٤+٤) و ٧ برگەیی (٤+٣) دێ و دەچێ و ئەمە کەمێك کێشی گشتی دەشێوێنێ بەڵام لە بارەی مانا و ناوەرۆکەوە هۆنراوەکە باشە.

٦. بەکوژە ئەوسا بەجێم بێڵە : پارچە هۆنراوەیەکی ئێسك سووکی کاك (فەرەیدوون عەبدوول بەرزنجی)یە . بابەتەکە بریتی‌یە لە ٣ بەش بەشی یەکەمیان بەجوانی و سەرکەوتووی خۆی دەنوێنێ بەتایبەتی کە دەڵێ :ـ

نە «با» هەواڵی تۆی پێ بوو
نە لەگەڵ بارانا هاتی
وەك کۆچەری دەوار بەکۆڵ
هەر گەرمیان و کوێستان ئەکەم
ئای لە خەمی بێ وڵاتی (؟)

لە ووشە و ماناکانی و وێنەی شیعری‌دا جوان و ناسکن وکێش و مۆسیقای ناوخۆی سووك و ئاوازەدارن خۆزگە دوو بەشەکەی تریشی وەکو ئەم بەشەی دەڕۆیشت و لە ئاستی پتەوی ئەم بەشە دەبوون وردە سەرنجێکیشم لە بارەی ئەم نیشانەی پرسیارەی دووا دێڕیەتی (؟) کە دەبوایە نیشانەی سەرسوڕمان (!) بوایە ، چونکە ڕستەکان هیچ پرسیارێك و نیشانەیەکی تێدا نی‌یە .

٧. گەر گوڵی من بلبلم : پێنج خشتەکی‌یەکی کاك [محەمەد حەمە ئەمین ـ ئاودێر ـ]ە لەسەر شیعری (موخلیس) ، شاعیر پەیڕەوی هونەری پێنج خشتەکی بە چاکی کردووە و کێش و سەرواکانی باش لەگەڵ کێش و سەروای شیعرەکانی شاعیری یەکەم دا گونجاندووە ، بەڵام لە هەندێ دێڕدا ئاڵۆزی لێکچوواندن هەیە هەروەك دەڵێ :

[تۆ شەمی و بۆ کێلی باڵات من وەلی دێوانەمە]

دەبێ مەبەستی لە کێلی باڵات چی بێ ؟ ئەگەر مەبەستی لە باڵای بەرزی شەم بێ ، ئەوا باڵا بەکێل نە چوێنراوە بەڵکو بە چنار و عەرعەرو نەمام . خۆ ئەگەر مەبەستیشی ئاماژەکردن بێ بۆ شیعرێکی وەلی دیوانە کە گوتوویەتی :ـ

میلێ بە ئەنداز بەژن و باڵای شەم
بنیەن چە فەرقم بەبێ زیادو کەم

(میل) بە مانای (کێل)ە و ، وای داناوە خۆی بمرێ و کێلێکی بەرزی بەقەد باڵای شەمی لە پشت سەری گۆڕەکەی دابنرێ . لێرەدا (وەلی) کێلەکەی بە باڵای شەم چواندووە نەك بە پێچەوانەوە .

ئەگەر شاعیر گوتبای : [تۆ شەمی بۆ عەشقی باڵات من وەلی دێوانەمە] ئەوا گەلێك گونجاوتر دەبوو ، چونکە پەیوەندیی وەلی دێوانەو شەم عیشق بووە نەك کێلی باڵا !

٨. شیعر : ناونیشانی هۆنراوەیەکی کاك [حەمە ئەحمەد جاف]ە ، شاعیر لاوێکەو دەیەوێ دەنگێکی شیعریی بۆ خۆی بخولقێنێ . بەڵام جارێ هەر لە دەوری هەوڵدانەو ، لە سەرەتای هۆنراوەکەی‌دا دەڵێ :ـ

شیعر کۆرپەی لەدایك بووی
منداڵدانی شاعیرانە !!

ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ دەربڕینی (منداڵدانی شاعیرانە]یە، چونکە منداڵدانەکە هەم زیادە هەم نەگونجاویشە ، چونکە مەرج نی‌یە هەموو بوونێـك وەکو منداڵ بوونی ئافرەتان لە منداڵدانەوە بێ . بەڵکو تەنیا گوتبای : [شیعر کورپەی شاعیرانە] بە مە خەست و خۆڵتریش دەبوو . کە لە بەشێکی تری هۆنراوەکەی‌دا دەڵێ :ـ

شیعر کڵ و کۆی دەروونی جزیری و وەلیو گۆرانە
شیعر جێ ژوانی ئەڤینی سەلماو شەم و خەرامانە !

شاعیر هەستاوە سێ شاعیری ناوداری کوردی هێناوە و لە دوایش دا ناوی سێ ئافرەتی خۆشەویستی ئەو شاعیرانەی هێناوە ، (سەلما) بەرامبەر (جزیری) و (شەم) بەرانبەر بە (وەلی) داناون و ئەمانە ڕاستن ، بەڵام ڕاگرتنی (خەرمان) بەرامبەر (گۆران) نابێ ، چونکە عاشقی هیچ خەرامان ناوێك نەبووە بەڵکو ئەمە پتر لە مەولەوی دەوەشێتەوە کە گوتوویە :ـ

**خەرامان دەرکەوت لە تۆی پەردەوە !**

٩. سێ ستـران : هۆنـراوەیـەکی کاك [زیاد نەقیب برواری]یە ، شاعیر ـووەهوایێکی خۆشی لە کەلەپووری نەتەوایەتی کوردو ڕەمزو نموونەکانی ـۆ هۆنراوەکەی خولقاندووەو چیای سیپانیو سیامەندو ، بەکر مەرگەوەر ـە هێما بەکارهێناوە . لە بارەی کێشەوە ، چەند جۆرێك تێکەڵاو دەکات و ـە ئاوازی شیعریی دوور دەخاتەوە و بەرەو کێشی لاوکی دەبات و دەڵێ :ـ

**لێلێ جانێ / وەزی هەرم =٨**
**ل بنیا دارێ =٥**
**ل سەرێ مێرگێ . =٥**
**ژ بو بەژنا زراف = ٥ یان ٦**
**مینا بەژنا سپینداری =٨**

١٠. تاجا جیهانێ : هۆنراوەیەکی کاك [هاشم ڕێکانی]یە ، بە تێکڕایی هۆنـراوەکـە سەرکـەوتوە بە دەگمەن نەبێ هەست بە ناتەواوی کێش و ئیقـاعی دێـرە شیعرەکانی ناکرێ . ناوەرۆکێکی بە پیتی هەیە ، شاعیر (تـاجی جیهـان) شیـاوی (گەلاوێژ) و (گوڵ) نابینێ ، کەچی شیاوی ـرەکەی خۆی دەبینێو لەسەری دادەنێ .

١١. چیرۆکی [زمان بەڵای سەرە] هۆنراوەیەکی کاك [ڕۆستەم باجەلان]ە بابـەتی حیکـایـەتێکی فۆلکلۆری کوردییـە و بە شیعـر هۆنیوەتییەوە ـەکـەوێتـە بەر بابەتی [شیعری فێرکردن] کە هەندێ لە ڕەخنەگران لە چەمکی شیعری دەبەنەدەرەوە ، بەڵام ئەم هۆنراوەیەی شاعیر ، ئەوەندە سووك و خۆش هۆنراوەتەوە و جۆرە سۆز و ئەندیشەیەکی بەبەرداکردووە . بەرەو شیعری لیریکی هێناوەتەوە. کێشەکانی سووکن و «٧» برگەیین و ماناو ناوەرۆکی پڕن لە پەندو ئامۆژگاری بۆ منداڵانی کورد و لە کۆتایی هۆنراوەکەی دەڵێ:ـ

**سوود لە گشت پەند وەربگرن**
**ڕێگای ژینی پێ ببڕن !**
**چونکە کەلەپووری کورد،**
**ئەزموونێکە وردە، ورد !!**

**دیوانی کاروانی ژمارە (٦١)**

١. هۆزان : هۆنراوەیەکی کاك [جەلال حەمەد ئەمین]ە، شاعیر لە ئاستی خۆشەویستیی یارەکەیدا داوای لێبوردن دەکات و دەڵێ:ـ

**ببورە لێم جار نا جارێك**
**لەگەڵ ناخی بریندار ی خۆما ئەدوێم !**
**دڵنیابە، تۆ جەستەمی، تۆ گیانمی**
**تۆ ئیلهامی ناسکترین هۆزانمی !!**

بەم دەربڕینە ناسك و پڕ سۆزانە کۆتایی بە هۆنراوەکەی دێنێت و، کێشی شیعرەکانی ٨ برگەیی (٤+٤)ە سخ و پڕیی ماناشی بە ناوەرۆکی شیعرەکەوە دیارە.

٢. دوو پارچە شیعر : بەرهەمی کاك [بەیار باقی]یە، یەکەمیان بە ناوی (ئـەز)و دووەمیشیـان بەناوی (هەسەم ئاغا)یە، وا دیارە شاعیر لەگەڵ شیعردا نوێیە، کێشی دێرە شیعرەکانی لە هەر پارچەیەکیدا بە ئارەزووی خۆی دەگـۆڕی، لە کێشی ٨ برگـەیی (٤+٤)ەوە دەچێ بۆ کێشی (٣) برگـەییو (٥)و (٦)و ئیقـاعی شیعـرەکان تێك دەداو لەپارچەی دووەم هەوڵێکی باشی داوە بۆ بەکارهێنانی ڕەمزی کەلەپووری نەتەوایەتی وەکو (هەسەم ئاغا) و (لەعلیخان) و دەڵێ:

**دگوتن، د بێژن**
**هندی هەسەم ئاغا**
**دبیهنا بسکێت لەعلیخانی بیتن**
**ڕوبیاری هیڤیا**
**هشك نەبوویەو هەری دزیتن !!**

٣. یادی هەڵەبجـە : هۆنـراوەیـەکی درێـژی شاعـیری نەمـری کورد (ئەخۆڵ)ە بریتییە لە سێ بەش. شاعیر یادو بیرەوەرییەکانی سەردەمی ژیانی لاوێتی خۆی لەو شارەدا بە شیعر تۆمارکردووەو کێشی خۆماڵی ١٠ برگەیی (٥+٥)ی بەکارهێناوە. هەست و سۆزێکی ناسك و ناوەرۆکێکی پتەو لەشیعرەکەدا هەست پێدەکرێ.

٤. قیزا کێمە ئەز : هۆنراوەیەکی (دەیکا مێرخاسی)یە، بە جۆرێکی سادەو ساکـاری هۆنیـوەتـەوە، تام و بۆی ژیانی لادێی کوردستانی بەبەردا کردووەو ئەمە بەرەو شیعری میللی بردووەو کێشی ٨ برگەیی بەکارهێناوەو، ئەوەی مایەی پەسەندیی ئەم هۆنراوەیە، شیعری ئافرەتەو لە ژیان و هیواو ئاواتی ئافرەتەوە دەدوێو لە پارچەی دووەمیدا دەڵێ:ـ

**دار مازیکا پەلك زێرم**
**خوندەڤان و زاناو فێرم**
**ڕوژا جەنگی منیا شێرم**
**چونکی نەڤیا مێرانە ئەز**

وێنەیەکی گەش بۆ خۆیو بۆ ئافرەتی کورد دەکێشیو شانازی بە خوێندەواریو ئازایەتی خۆیەوە دەکات!

٥. چیرۆکی عیشقێکی دێـرین : هۆنراوەیەکی کاك [خالد عبدوڕەحمان فاتیحی]یە، لە کردارەکەیدا بە تێکڕایی سەرکەوتووە. بەڵام کە بەوردی سەرنج دەدەینە هەندێ دێرە شیعری، هەست بەناتەواوییو تەنگاوی ماناو دەربڕینەکانی دەکەین، هەروەك دەڵێ:ـ

**تۆربینی خەم و ژانم هەڵرشت و**
**لە پەنا بەردێك ئاورم تێبەردان**
**ووتم: نەوەکو سەرهەڵدەنەوە**
**لە پاشە ڕۆژدا پێمان بەن زیان !!**

هەست دەكەین چوارینەكە خۆی لاوازەو كە دەشكاتە دوا دێڕی هەر بە جارێك دەبێتە ووتەی ئاسایی‌و پەخشانێكی سادە. یاخود كە لە دوا دێڕی چوارینی كۆتایی‌دا دەڵێ:ـ

**لاولاوی سیس بووی تاقی لاوینتیم**
**خۆی ئالاندەوە، ئەستۆی وەنەوشە**

كاكە لاولاو گوڵێكی هاوینی‌یەو (وەنەوشە)ش زستانی‌یە، بەیەكەوە نابن.

٦. عەشقێكی پیرۆز :هـۆنـراوەیـەكی كاك [مستـەفـا كوێستـانی]یـە، شیعـرەكـانی ئەمەش لەسەر دەستووری چوارخشتەكی‌یە، بەڵام تەنها نیوەدێڕی دووەم و چوارەمی هاوسەروان. لە چوارینێكی‌دا دەڵێ:ـ

**گوڵاڵە ئەلقەی خۆشەویستی‌یە**
**لە نیسانێكا من لە پەنجەم كرد**
**تاسەی تینوێتی‌و عەشقی خودایی**
**زۆر بە زوومەوە كرنووشی بۆ برد !!**

دەبینین شاعیر لە نیوە دێڕی یەكەم و دووەم و سێیەمی‌دا زۆر بە جوانی سەركەوتووەو وێنەی شیعریی‌ی ناسكی خوڵقاندووە، كەچی كە دەگـەینە نیوەدێڕی چوارەمی هەست بەكزیی دارشتن ولاوازیی مانای دەكـەین بە تایبەتی لە خوێندنەوەی ئەم دەربڕینە ناو ئاخنەی [زۆر بە زوومەوە] كە زیـادەو هیچ كەڵكێكی نی‌یەو وشەی (كرنووشی بۆ برد)یش هەڵەیە چونكە دەگەڕێتەوە بۆ [تاسەی تینوێنی‌و عەشقی خودایی]و دەبێ بگوترێ «كرنووشیان بۆ برد».

٧. سەیـران : هۆنـراوەیـەكی كاك [هـوشیـار بەرزنجی]یـە. شاعـیر هونەرمەندانە چەند وێنەیەكی شیعریی لەسەر سەیرانی گوێی ڕووباری (سیروان) دەكێشێ‌و لە كارەكەی‌دا سەردەكەوێ‌و لێكچواندن وخواستن و جوانكـاریی‌یـە ڕەوانبێژی‌یەكانی ڕێكوپێك و دروستن، هەروەك لە دێڕە شیعری پێنجەمی‌دا دەڵێ:ـ

**دەنگی قاقای كەرووی ناسك**
**دڵ ڕاوچی‌یەو كیژە ئاسك !!**

یاخود كە لە دوای ئەمەدا دەڵێ:ـ

**ماچی تەری شەوی بەهار،**
**شەونم لەسەر كوناى گوڵ دیار !!**

ئەمانە دەربڕینی ناسكن، تەنیا لەبارەی كێشەوە، لە دوا دێڕدا ووشەی دیار كەمێك بارگرانی كردووە.

٨. سێ وێنە : سێ پارچە شیعری كاك [ئاوات كامیل]ە، هەموویان لەسەر كێشی ٨ بڕگەكی (٤+٤)ن، كاتێ لە كۆتایی پارچەی دووەم دا دەڵێ:ـ

**كەسێ نی‌یە گوێت لێبگرێ!**
**ڕازی دەروونتی پێبڵێی**
**پەپوولەی ماچ بەلێوتەوە**
**هەڵبنیشێ .. !!**

هەست دەكـەین دەربـڕینی وەكـوو [پـەپـوولەی ماچ بە لێوتەوە هەڵبنیشێ] یەكجـار ناسكـەو خواستن (ئیستعمارە)یەكی جوانە، بەڵام كاتێك كە دەڵێ:ـ

**عیشقم هاژەی تافگەیەكی زۆر بەخورە**
**بە سەر چیای باڵاكەتا**
**دێتە خوارێ !**

لێكچواندنی باڵا بە چیا چ جوانی‌یەكی تێدا نی‌یە، بەڵام ئەگەر بڵێ: چیای خۆشەویستی ئەوا باش دەگونجێ، چونكە عیشق و خوشەویستی لە گەورەیی‌دا دەبن بە چیا نەك باڵا ئەوەندە گەورەو بەرزبێ!

**(دیوانی كاروانی ژمارە «٦٢»**

١. یەكـەم هۆنـراوەی ئەم ژمـارەیـە ، هۆنـراوەیـەكی كاك [حـەسیب قەرەداخی]یـەو بە ناوی [نـامـەی خەونێك و خەمێك]ە بەچوار هەنگاو بابەتەكەی خوڵقاندووە و شیعرەكانی لەسەركێشی (١٦) بڕگەیی (٨+٨) و «٨» بڕگەیی (٤+٤)ن ، شاعیر بۆنی خەمی لە زۆربەی هۆنراوەكانی دێو تەنانەت دیوانی یەكەمی شیعرەكانیشی بە ناونیشانی «فەرهەنگی خەم»ەو لە خەم دا خۆشی‌و جوانی دەخولقێنێ و ، لە هەنگاوی سێیەمی‌دا ڕازی تەنیایی لەگەڵ خۆشەویستەكەی‌دا دەكات و دەڵێ :ـ

**تارمایی‌یە نائاشنابەكە لە كوێ ئەژیت ؟**
**ئێستە لە كوێی ؟ بۆ كوێ ئەچیت ؟**
**ئەی هاوارە لە ناخم دا چ ئاگرێكت نایەوە ؟!**
**چۆن دەرگایەك كرایەوە ؟**
**لە مەجلیسی خەمەكانما**
**چ تاڵاوێ خورایەوە ؟!!**

دوای ئەم هەنگاوە ، شاعیر نامەی خەونەكەی بۆ چیا دەنێری و داوای لێ دەكات كە بە وردی سەیری بكات و بیناسێتەوە ، چونكە خۆی سۆفی‌یەكی دڵسۆزو عاشقێكی خودایی وەكو هەللاجەو [أنا الحق]ی ووتە ئەمرەكەی كردووە بە شیعرو، بە جوانی لێی سەركەوتووە .

٢. شانـازیی : هۆنراوەیەكی شاعیری ئەندازیار كاك [جەلال مەدحەت خۆشناو]ە هەیكەلی هۆنراوەكەی داستانی بوونی مرۆڤایەتی‌یەو ، پشتی بە كەلەپـووری ئایینی‌و مێـژوویی‌و ئەفسـانـەیی‌ی كوردی بەستـووە و بەرهـەمێكی جوان و سەركـەوتووی دارشتوەو مەسەلەی تۆفان وچیای جوودی و ئەسكەندەرو خدری زیندەی تێكەڵاو بە مێژووی نەتەوایەتی‌ی كورد كردووە و وانـەی خۆشـەویستی‌ی خاك و ئاوی نیشتمـانمـان بۆ دادەدات و دەڵێ :ـ

**لە كاتی زوو**
**چەكوشەكەی دەستی كاوە**

**خۆشی هێناوە ئەم ناوە**
**دەگێڕنەوەش هەبوو نەبوو**
**کەوا لەوێ ژیار هەستا**
**لەژێر پەیرەوی ئاویستا .**

شاعیر بە جوانی داستانی رابوردووی نەتەوەکەی دادەڕێژێ و لە دواییدا دەڵێ :

**منی مرۆڤ ، منی ئینسان**
**فرچکم بەو ئاوە گرتوە**
**هێزم لەو خاکە بردووە !!**

کتێ کە دەڵێ : [منی مرۆڤ ، منی ئینسان] هەردووکیان یەك مانایان هەیە تەنها گوتبای [منی ئینسان] بەس بوو ، لەگەڵ سەرواى (ژیان)یش دا ـەگونجا کە لە دواییدا لە نیوەدێرێك دا دێت .

٣. بولبول و گوڵ : هۆنراوەیەکی کاك [جەزا عەلی ئەمین]ە ، بۆ نەوجەوانانی ـ ناوە لە شێوەی نۆبەرێتە . لە سەرەتادا یەناوی بولبولەوە دەڵێ :ـ

**ئەی گوڵی جوان .. گوڵی بۆن خۆش**
**دەوەرە تۆش !**

هەست دەکەین دەربڕینی [دەوەرە تۆش] گەلێك دوورە لە دەربڕینی شیعریی ، لەبارەی ماناشەو وشەی [تۆش] نەگونجاوە . چونکە خۆبولبولەکە بانگی شتیتری نەکردووە تاکو لەگەڵ خۆیدا بین بەسێ وبڵێ ئەی خونچە وەرە ، ئەی گوڵ دەتۆش وەرە !] بەڵام کاتێك کە دەڵێ :

**لە خەمناکیت دەکاتەوە**
**بزەی وەریو بۆ لیوانت دەباتەوە !**

هەست دەکەین دوا دێری یەکجار ناسك و وێنەیەکی شیعریی گەلێ جوانەو کاتیکیش کە دەڵێ :ـ

**خۆ دەزانم تۆ دڵسۆزی**
**بۆ من گشت کات مایەی ڕێزی**

دەبینین ئەم دەربڕینانە لە دنیای شیعرەوە دوورن و تەنها وتەی ئاسایین و بەس .

٤. شانۆی ژیان : هۆنراوەیەکی سەرکەوتووی کاك «کامیل ژیر»ە ، زۆر بە جوانی فەلسەفەی ژیان و هەڵوێستی خۆی لە سەر (شانۆی ژیان) دەنوێنێ ، بەڵام نازانم بۆ ئەوەندە لە ژیان دا رەش بینە ، خۆ هەر کامیل ژیرەکەی جارانە کەشانازی بە ژیانی گەشی نەتەوەکەیەوە دەکرد ! کەچی ئەمڕۆ دەڵێ :ـ

**من ئێستاکە لەو کەسانەم**
**پەیژەی بەختم وەرچەرخاوە**
**هەنگاو ئەنێم بۆ پێشەوە**
**هەنگاو هەنگاو دێمە دواوە**
**دەستی کورتم هیچ ناگرێ**
**دۆستەکانم بوونە دوژمن !!**

**بەرای من بۆ شاعیری واقیعی مەسەلەی بەخت و تالع بێ بایەخەو نابێ باوەری پێبێت و لەبارەی وشەو ڕستەو دەربڕینەکانیشی گەلێ جوان و بێ گرێن .**

**٥. بەلەنگاز : هۆنراوەیەکی کاك [ئیسماعیل تەها شاهین]ە لە کەسی هەژارو بەدبەختەوە دەدوێ ، شیعرکانی لەسەر کێشی (١١) برگەیین ، بەڵام لە بارەی هونەری سەرواى شیعرەوە ، وەك لە سەرەتادا بە باشی لێی سەرکەوتووە تاسەر نەیتوانیوە بڕوات و ، لەو کاتەی کە دەڵێ :ـ**

**دەمێ ئادەم ئاغا نەبوون بەلەنگاز**
**ئەم نە کرمانج بوون ، نە زەبوون بەلەنگاز**

لە سەرەتاوە تاکو ئێرە بەجوانی پەیرەوی دەستووری سەرواى کردوە ، کە لە وشەکانی (نەبوون) و (زەبوون)دا دەردەکەون وشەی (بەلەنگاز) سەروانییە و تەنیا لەنگەرە .

بەڵام لە دواییدا کە دەڵێ :ـ

**تەقایی بوو ماڵ و هەبوون بەلەنگاز**
**قەت نەبوو کەس بێژتە کەسێ بەلەنگاز !**

دەبینین لە دەستووری سەرواى لادا وشەکانی (هەبوون) و (کەسێ) هاوسەروا نین و بە مەش ئاستی هونەریی شیعرەکەی بێ لاواز دەبێ .

٦. رازی حەزێکی تینوو : هۆنراوەیەکی کاك [سەلام عومەر کەریم]ە، شیعرەکانی لە سەرکێشی ٨ برگەیی (٤+٤)ن و لە جۆری دووخشتەکین، بەڵام شاعیر «١٦» برگەی کەرت کردووەو کردوونی بە (٨) برگەیی. لەو کاتەی کە بە سەرەتاییێکی باش دەست پێدەکات و دەڵێ:

**ئێستا بپرسە داخۆ من،**
**لە کام لارێ پشووم داوە؟**
**چەند قەدبرو هەڵدێرانم**
**لە پێچێکا گرێ داوە ؟!**

دەبینین تاسەر ئەو هێزو گوڕەی لە ناو دێرە شیعرەکانیدا نامێنن، هەروەك دەڵێ:ـ

**چیشەن تۆش تۆزێ داخورپێو**

**لەم داوایەت وەرسووڕێوە !**
**نە پای بەلێنی چەند جارەت**
**بۆ خۆت تۆزێ وەحەسێوە !!**

هەست دەکەین ووشەکانی یەکەم نیوە دێری بە گرانی دێنە سەر زمان، ووشەی وەکو (وەحەسێوە) و (وەرسووڕیوە) دەکات بە هاو سەرواو، نە لە دەربڕین و نە لەمانا ووشەی گەشەی شیعریی نین و بە سووکی نایێنە سەر زمان.

٧. ژ ئەڤینا تە تێرنابم : هۆنراوەیەکی کاك [ناجی تەها بەرواری]یە، دێرە شیعرەکانی لەسەر کێشی ٨ بڕگەیی (٤+٤)ن، توانیویەتی مانای جوان بە بەر ووشەکانیدا بکات و لەو کاتەی کە دەڵێ:ـ

**ژ ئەڤینا تە تێر نابم**
**لڕیا ئومێدا تە دێ چم**
**نازڤرم**
**هندی من مابن گۆشت و خوین**
**هەتا تیروژکێن ڕوژا گەش**
**لسەر ئەنیاتە دەرنەکەڤن .**
**وەکی ئاسمانەکێ ساهی تیر روناهی**
**ژڤێ دلێ کول**
**خلاس نابن ئاخ و نالین !!**

دەبینین لەسەرەتادا، لە هەموو بارێکەوە چ لە کێش و مۆسیقای ناوخۆی ووشەکانیو چ لە ناوەرۆك دا هەست بە ناتەواوی ناکەین. بەڵام کە دەڵێ:ـ

**هەتا تیروژکێن ڕوژا گەش**
**لسەر ئەنیا تە دەر نەکەڤن**

هەست دەکەین نیوەدێری دوایی لەنگ بووەو لە جیاتی ٨ بڕگە بووەتە ٩ بڕگەو، بە تێکراییش هۆنراوەکە هەوڵدانێکی باشە بۆ هۆنینەوەی شیعری نوێ.

٨. کەسکە ژین : هۆنراوەیەکی کاك [هاشم محمد مصطفى ئەتروشی]یە، ئەم هۆنراوەیەش لەسەر کێشی هەشت بڕگەیییە، شاعیر بە جۆرێکی گەش بینانە ڕوو دەکاتە ژینی سەوزو خۆش و پێی دەڵێ:ـ

**گەر توو هاتی کەسکە ژینێ**
**ل وارێ مە بکە سەیران**
**گۆهدە لاووك، گۆهدە حەیران**
**گەر توو لەمە بویە میڤان**
**بێژە خەلکی بەسسە کوڤان !!**

شاعیر هەوڵێکی باشی داوە، تاکو ئاووهەوایێکی خۆشی کوردستان بەبەر ناوەرۆکی شیعرەکەیدا بکات، پەوەی ئەو ژیانە خۆشەی کە چاوەڕوانی دەکات بێو گوێبداتە لاووك و حەیرانی کوردیو ئەگەر لە خاکی کوردستان میوان بوو، با بە خەلکەکەی بڵێت بەس بێ دەردو خەم و ناسۆرو ئیتر نۆرەی ژیانێکی خۆش و بەختەوەر بێ.

**دیوانی کاروانی ژمارە (٦٣)**

ئەم ژمارەیەی کاروان دوو دیوانی شیعری بڵاوکردۆتەوە، یەکەمیان (دیوانی نەورۆز)و دووەمیشیان (دیوانی کاروان). لە (دیوانی نەورۆزدا)دا ئەم هۆنراوانە بڵاوکراونەتەوەو دیارە گوڵبژێریٚ هۆنراوەی نەورۆز نین و زۆربەی هۆنراوەی سادەن و هۆنراوەکانی برایان غەریب پشدەریو موکەرەم رەشید تاڵەبانی تا رادەیەك سەرکەوتنیان وەدەست هێناوەو وەکو شیعری جوان کەوتوونەتە دیوانەکەوە.

١. هۆنراوەی (بەهار) بەرهەمی کاك [لەتیف بەرزنجی]یەو لەسەر کێشی ١٠ بڕگەیی (٥+٥) دەڕوات و گەلێك دێرە شیعری جوانٚ و وێنەی خەملیوی تێدایە وەکو:

**سەوزیی پۆشیوە زەوی گۆڕاوە**
**گوڵاڵە سوورەی لەسەر ڕوواوە !**
**ڕەنگین بە تارای خونچەی بەهاری**
**ئاهەنگ ئەگێڕێ دێهات و شاری !!**

بەڵام کاتێك لە هەموو هۆنراوەکە ورد دەبینەوە ،هەست بە کزیی دەربڕین و مانای هەندێ لە دێرە شیعرەکانی دەکەین ،هەروەك لە سەرەتادا دەڵێ :ـ

**بەهار نەورۆزی وا هێنایەوە**
**ئاگر لەو کەژە هەڵگیرسایەوە**

بەهار نەورۆز ناهێنێ بەلکو نەورۆز پێشەنگەو بەهار دەهێنێ و ئاگری نەورۆزیش لە خۆیەوە هەڵناگیرسێ بەڵکو دەبێ بکرێتەوەو ، خۆزگە گوتبای

**نەورۆز بەهاری وا هێنایەوە**
**ئاگری جەژنمان بۆ کرایەوە !**

یاخود گوتبای [ئاگر لەو کەژەوا کرایەوە] ئەو دەربڕین و ماناکەی جوانتر دەگونجان .

٢. نەورۆز و کوترو ئاگر : هۆنراوەیەکی کاك [عەدنان مزیری]یە، شاعیر لە سەرەتادا بە دەستووری شیعری کلاسیکیی کێش و سەروادار دێتە مەیدانی ئەدەب و، لەسەر کێشی ١٦ بڕگەیی شیعرەکەی دەهۆنێتەوەو دەڵێ

**نەورۆز هەی کوترا مشەخت چاڤێ مەیێ ل ژڤانی**
**تو ل بوهارا ڤینێ بێی ل هیلینا دلی دانی .**

دەبینین ئەم دێرە شیعرە لە هەموو بارێکەوە جوان و سەرکەوتووە کەچی هەست دەکەین لە دواییدا لە بەشی دووەم کێشەکەی بەم جۆرە دەشێوێنیو دەڵێ :ـ

**ئەڤە کوریا ڤیناتەیە هەمبێز دکەن پراستی =١٥**
**ئەڤیندارین دسوژین ب ئەڤینا خوو تو مە دناسی =١٧**

مەست دکەین نێوە دێڕی گەلاڵبجیاتی (١٦) بڕگەیی بووە بە «١٥» بڕگەو می دووەمیش بە ١٧ بڕگەو ئەمەش کارێکی نەگونجاوە و گەلێ جاریش لە ـرەی ناوەڕۆکەوە مانای شیعرەکان زۆر تەنگاو دەبێ.

٣ من و نەورۆز و دووری : هۆنراوەیەکی سەرەتای شاعیریی کاك ڕۆستەم باجەلان)ە و ، بەرهەمی ١٥ ساڵ لەمەوبەریەتی‌و ،بۆیە کزو ‌ـو زەو ،خۆزگە شاعیر نوێترین و باشترین شیعری خۆی پێشکەش دەکرد چونکە دڵنیام کە بەرهەمی گەلێك لەمەی جوانتری هەیە. لە سەرەتای هۆنراوەکەیدا دەڵێ:ـ

**ئەوە نەورۆزی ئەمساڵیش هاتەوە**
**ئاگرێکی تازە سەرهەڵداتەوە !!**

ئەمە پتر لە قسەی ئاسایی دوور لە داڕشتنی شیعری دەچێ ، بەڵام ئەوەندەی لێناگیرێ چونکە بەرهەمی سەرەتای شاعیریی و شیعری ساڵی ١٩٧٣ یەتی .

٤ بەهارو پەیام : هۆنراوەیەکی ناسکی شاعیر (غەریب پشدەری)یە ، ســەر کێشی ١٤ بڕگەیی (٧+٧)ی داناوەو ، لەجێی خۆی شیعری ڕخشتەکی‌یە ، بەڵام شاعیر بۆ سووکی دەربڕینی دووانی کەرت کردووەو ردوونی بە «٧» بڕگەیی‌و سی‌یەمیشیان وەکو خۆی بە ١٤ بڕگەیی ێشتۆتەوە . دەربڕینەکانی شاعیر ، تام و چێژی لکە شێوەی موکریانی ـوە دیارەو ، ئەمەش لەوەوە هاتووە کەشاعیر کەوتۆتە بەر کارتێکردنی ـاعیرانی موکریان و بەم جۆرەش دەست بە هۆنراوەکەی دەکات و دەڵێ :ـ

**هەوری ڕەشی زستانێ**
**کە دووا فرمێسکی باری**
**بە ئەسپایی هەڵدەکا**
**سروەی بای نەو بەهاری**
**خۆی هەڵدە سوێ لە دارو لە بەردی کوردەواری!!**

بەتێکرایی ئەم هۆنراوەیەی شاعیر جوانترین هۆنراوەی دیوانی نەورۆزی ئەمساڵی کاروانە .

٥. کاك موکەڕەم ڕەشید تاڵەبانی ، وێنەیەك و ٦ کۆپلە شیعری بۆ نەورۆزی ئەمساڵ نووسیوە ، وێنەکەی سەرەتای هۆنراوەکەی جوان و سەرکەوتووە و کۆپلەکانیشی تارادەیەك سەرکەوتنیان وەدەست هێناوە ، بەڵام هەندێ جار کێش و مۆسیقای دێرەکانی بە تەنیا بڕگەیەك یا دوو بڕگە دەدۆڕێن و، زۆر . بە ئاسانی چارە سەردەکرێن ، هەروەك لە کۆپلەی دووەمی‌دا دەڵێ :ـ

**نەورۆز ، ئەو ئەسپەیە**
**لەناو دێری مێژووی شاردا**
**دەحلیکێنیت بە شارێگای کاروانێك دا**
**هەرغاردەدات**
**چەپکە نێرگز**
**لە قەد یاخەی بەهار دەدات !!**

دەبینێن هۆنراوەکە لەسەرکێشی «٨» بڕگەیی (٤+٤) دەڕوات ، کەچی یەکەم نیوەدێری دەبێت بە ٦ بڕگەو هیچ پارچەیەکی «٢» بڕگەیی بە دوادا نایەت تاکو کێشەکەی ڕاست کاتەوە و «٨» بڕگەکە پڕبکاتەوە ، بۆیە موسیقای کێشەکەی کوشتووە ئەگەر بەم جۆرە نووسرابایە ڕاست دەبووەوە :ـ

**نەورۆزی کورد ، ئەو ئەسپەیە**
**لە ناو دێری مێژووی شاردا**
**دەحلیکێنیت !!**

٦. ڕۆژی نوێی کورد : هۆنراوەیەکی کاك [ئەحمەد ڕەسوول پشدەری]یە لەسەر کێشی خۆماڵی ١٠ بڕگەیی (٥+٥) دەڕوات و دەربڕینی جوانی لەشیعرەکانیدا بەکارهێناوە ، بەڵام هەندێکیشی پتر بە دەربڕینی ئاسایی دەچن لەوەی بە دەربڕینی خەست و خۆڵی شیعریی بچن . لە سەرەتادا دەڵێ :ـ

**کام بیرەوەری وەکو هی نەورۆز**
**ـ ناخمان دەتەنێ ؟**
**کام عەشقی پیرۆز**
**وێکرا خروکەی سووری ئەم گەلە**
**بۆی رادەچەنێ ؟!**

ئەگەر شاعیر سەرەتاکەی بەم جۆرە دەست پێکردبایەو لە ووشەی (هی) ڕزگار کردباین ئەوا شیعرەکەی پتەوتر دەبووو گوتبای :ـ

**کام بیرەوەری وەك یادی نەورۆز**

کاتێکیش کە دەڵێ : [وێکرا خروکەی سووری ئەم گەلە بۆی رادەچەنێ] نازانم خروکەی سوور چۆن ڕادەچەنێ ؟ مەگەر لە کاتی لەرز لێهاتنی مرۆڤ ، چونکە کاری خروکەکان ڕاچەنین نی‌یە ، بەڵکو دەمار یاخود دڵ رادەچەنێ ، بۆیە ئەگەر یەکێ لەم دووانە بوایە باشتر دەگونجان و چاکتر ڕاچەنینیان لێدەوەشایەوەو بە ڕای من گەر گوتبای :ـ

**وێکرا دەماری هەستی ئەم گەلە**
**بۆی رادەچەنێ .**

لە کاتێکیش دا دەڵێ :

**مەشخەڵی نەوروز بۆتە بڵێسە**
**قەڵای زوحاکی کردە کڵێسە !!**

نازانم مەبەستی لە مەدا چی‌یە ؟ مەشخەڵ بە مانای ئاگرێك دێ کە گڕی خۆش بێ‌و بڵێسەش کڵپە سەندنی ئاگرە ، هەردووکیان لەیەك ڕەگەزەوە هاتـوون ، ئەمەیان بەهەر حاڵێك بشێ بەڵام نازانین مەبەستی لە دێڕی دووەمی چی‌یە کە دەڵێ :ـ

**قەڵای زوحاکی کردە کڵێسە !**

کڵێسە : کەنیسەی دیانانەو ، قەڵای زوحاك کە بوو بە کەنیسە چی لێدێ ؟ مەگەر هەر مەبەستی ئەوەبێ وەکو کەنیسەی شەوی سەرەتای پایزی ڕۆژهەڵاتی ببێتە ئاگرو چراخان .

<u>دیوانی کاروان</u> :

لە هەمان ژمارەی کاروان و لە دیوانی شیعرەکانی ئەم هۆنراوانە بڵاوکراونەتەوە :

١ . کەخاك ئەدوێ : هۆنراوەیەکی سەرکەوتووی کاك [مەدحەت بێخەو]ە ، لە دێرە شیعرەکانی دا ، شاعیر بەزمانی خاکی وڵاتەکەیەوە دەدوێ‌و ئەو کەسە بە ڕۆڵەی نەبەردی خۆی دەزانێ کە پتر دڵسۆزبێ بۆی و قوربانی لە پێناوی بدات و ،لە پارچەیەکی هۆنراوەکەی‌دا دەڵێ :ـ

**کێ نەگۆرە**
**کێ بێ‌پەروا**
**ڕێگەی هەردەم بەرەو خۆرە !**
**مشتێ لە قور و خۆڵەکەم**
**سڵاوێکی شڕۆڵەکەم**
**ناگۆڕێتەوە بە هەزار**
**پایەو پوول و کورسی خولدار**
**ئەو ڕۆڵەمە !!**

بەم جۆرە شاعیر لە زۆربەی پارچەکانی هۆنراوەکەی‌دا گیانی نەبەردیی‌و خۆشەویستی‌ی نیشتمانمان بۆ دەردەبڕێ‌و هۆنراوەیەکی سەرکەوتوومان پێشکەش دەکات.

٢ . ناسوودەیی : هۆنراوەیەکی کاك [کەریم دەشتی]یە، شاعیر ڕێبازێکی تایبەتی گرتووە لە شیعر نووسین دا، بە دوای ووشەی نوێ‌و دەربڕینی نەسواودا دەگەڕێ‌و، وێنەی جوانی شیعریی پێکەوە دەنێ، بەڵام ئەوەی سەرنج ڕادەکێشێ کێش و موسیقای دێرە شیعرەکانیەتی، بەپێ‌ی یاسای کێشی شیعری عەرووزو پەنجە نارۆن، بەڵکو پتر لەگەڵ کێشی حەیران و لاووکی کوردی دەگونجێن و ئەمەش هەوڵدانێکی نوێ‌یەو چەند شاعیرێکی کورد سوودیان لێوەرگرتوە؛ لە بەشێکی هۆنراوەکەیدا دەڵێ:

**ئەوەی من دەیبینێکم لە دووررا دەیناسم** =١٢
**هاتووە برووسکم لە چاوان بڵندکا ...** =١١
**ئەوەی من دەمەوێ چەوو شاخی لەسەر گاڵەدەم** =١٥
**زۆر ڕاوچی وەك منی پێکاوە** =٩

دەبینین هەر دێرە شیعرە جۆرە کێشێکی هەیەو بەم پێ‌یە دەرۆن [١٢، ١١، ١٥، ٩] ئەمەش وەك گوتمان پتر لەگەڵ کێشی لاووك و حەیران دا دەگونجێ.

٣ . تەشیا زینێ : هۆنراوەیەکی [دایکا مێرخاسی]یە، ئەم شیعرانەیشی وەکو هۆنـراوەکـەی لەمـەوبـەری، تام‌بۆی شیعری میلی پێوەیەو بە سادەو ساکاریی دایڕشتووەو لە پارچەیەکی‌دا دەڵێ:ـ

**فریشتێ ل ناڤ تەلبینا**
**دێ ئینمە خار وەکی دینا**
**ب تل‌لیا گول نەسرینا**
**دارا هزرا دێ ئینمە بەر !!**

شاعـیری ئافـرەت وەکـو شێت فریشتە دێنێتە خوارو بە گوڵی نەسرین گوڵبـارانی دەکـات و درەختی بیرو بۆچوونەکانی خۆی دێنێتە بەرو ئەم دەربڕینانەش جوانن.

٤ . دوو شیعر : ناونیشانی دوو پارچە شیعری کاك [ئیسماعیل راجی]یە، یەکـەمیـان بە ناوی [سـەمای مەرگ]ەو سەرکەوتنێکی چاکی وەدەست هێناوەو، وێنەی شیعریی جوانی تێدا خوڵقاندووە، هەروەك لەم بەشەیان دا دەڵێ:ـ

**لە تامەزرۆی تیشکی ماچی دەمی خونچەت**
**لێوەکانم دوو پەپوولەی بەندکراون**
**بەسووتانی باڵیان نەبێ**
**ئاشت نابنەوە !!**

لە هۆنـراوەی دووەمیشی‌دا شاعـیر دەربـڕینی نوێ‌و وێنەی شیعریی‌ی جوانمان پێشکەش دەکات و دەڵێ:ـ

**نیوە شەو بوو**
**بەبێ دەنگی فریشتەکان هاتنە خوارێ**
**بیری سوورو هەنگاوی تیژ**
**دڵی ڕەشی ئەو شەوەیان**
**دا دەخورپاند !!**






د. نافع ئاکرەیی

مێژوی مشتاو مڕی رامیاری هاوچەرخ لەسەر نیکاراگوا بە دوو ناڤ دەبەسترێت... یەکەمیان ئەنستاسیۆ سۆمۆزا «١٨٩٦ ـ ١٩٥٦»... ناوی لە ناو خێزانەکەی‌دا «تاتشۆ» بوو... لە راستی‌دا بەدانەری بناغەی رژێمی دیکتاتۆری دەناسرێت کە زیاتر لە نیوە سەدەیەك حوکمی نیکاراگوای لە دەستدابوو بە هاوبەشی لەگەڵ هێزەکانی ئیمپریالی ئەمریکی... هەموو خێرو خێراتی ئەم وڵاتەیان دەبرد بەسیاسەتی زوڵم و جەورو ئاسن رژێمەکەیان بە سەر میللەتەکەدا دەسەپاند...

ناوی دوەمیش «ئۆگۆستۆ تیسار ساندنیۆ» بوو ١٨٨٥ ـ ١٢ـ٢ـ١٩٣٤ ـ.

کوڕی خێـزانێکی دێهـاتی‌بـوو... خەریکی کاری میکـانیکی‌بوو لە سەرەتای ژیانی‌دا... شتێکی گران و ئەرەوابـوو لای کە دیـتی جەورو زوڵمی خێـزانی سومـوزاو یارمـەتی‌دانی هێزەکانی ئەمریکی بۆ ئەم دروندەیە... لە بەر ئەوەی بەرەیەکی بەرڤانی نیشتمانی دروست کردو بنکەکەی لە «لاس سیگـو بیـاس» بوو بە فێـڵ کوشـتیـان... کەچێ شۆڕەشەکەی هەر بەردەوام مایەوەو هێلی خەباتی خۆی نەگۆڕا تا توانـیـان رژێـمی سومـوزا بروخێنن لە ساڵی ١٩٧٩. لە سەرەتـای ئەم سەدەیـە ئەمریکا لە هەرێمی دەریای کاریبی سیـاسـەتی دۆلارو ئازاردانی بە کارهێنـا... لەسـاڵی ١٩٢١ هێزەکانی ئەمریکی لە سەر بەندەرەکانی نیکاراگوا دابەزین و نیکاراگوایان داگیرکردو میللەتەکەی چەوساندەوە... لەو دەمەدا «سـاندینۆ» لە «مەکسیکدا» لە کۆمپانیایەکدا مژوڵی‌کاربوو... هەر ئەو کۆمپانیایە بوون کە میللەتانی ئەمریکای ناوەڕاستیان دەچـەوسـانـدەوە... هەر لەوێ «سـانـدینـۆ» فێری خەباتی نەقابی‌بوو...

لەساڵی ١٩٢٦ گەڕاوە وڵاتەکەی خۆی بو ئەوەی دابنیشێت و ئەو پارەی کۆکردووتەوە بە شول بێخیت... کەچی بارو زورووف وڵاتەکەی لەو کاتەدا گەلێك نالەباربوو... لە ژێر باری ئیحتکاراتی بیانی‌دا دەنوزا... هەر لەو کاتەدا چریسکەی بەرەڤـانی میللی چەکـدار سەری هەڵدا کە بە سەرکـردایەتی جەنـەراڵ «مـۆنـاکـادا» بوو... خەبـاتـی بو ئازادی وڵات ومیللەتـەکـەی بوو... «سـانـدینـۆ» گەیشتـە شەڕکـەرانی

میللەتـەکـەی»... دروشم و نیشـانـەکـانی بەرەی نیشتمانی ئەمـانـەبـوون.: «ئـەبێ یانگی‌یـەکان لە نیکاراگوا دەربچن» «وڵاتێکی ئازاد یان مردن» ـ یانکی. واتە ئەمریکی ـ بەرهەڵستی توند بوو... دەنـگ بەرزبوون لەهەموو جیهان بو بەربەرچی هێرشە نارەوایەکەی ئەمریکاو ئیدانەی ئەویان دەکرد... لەساڵی ۱۹۲۷ هێزەکانی ئەمریکا بەهێزترکران... جەنەراڵ «مۆناکادا» مانـدوبـوو... مەیـدانی خەبـاتی بە جێهێشت... کەچی «ساندینۆ». بەردەوامی رێگای خەباتی هەڵبژاردو مەیدانی چۆڵ نەکردو لە جێگای جەنەراڵ «مۆناکادا» بە سەرکردەی شۆرش هەڵبـژێـرا هەموو چەپەرەکانی جیهان پاڵپشتی ئەو بوون... بروسکـەی زۆر نێردرا بو سەرۆکی ئەمریکی ئەو زەمانەی کە دەیانگوت: «جەنابتان هەموو شتێکتان هەیە جگە لە ویژدان و زەمیر نەبێ...» لە ساڵی ۱۹۳۳ بەرهەڵستی توند بوو... ئەمریکا سیـاسـەتەکەی گۆری سەرۆکی نیکاراگوایان بە فێڵ گۆری‌و پەیمـانیان دا کە هێزەکانی ئەمریکی دەربچن... لە رۆژی ۲ـ فێبـرایری هەمانساڵ «ساندینۆ» بەفرۆکەیەکی بچووکی رژێم سەفەری کرد بۆ «ماناگوا»، تا پەیمانی ئاشتی ئیمزا بکات پاشان گەراوە بو لاس سیگـۆ بیـاس» بو لای هاوڕێیـەکانی... ئەو زەوی‌یەی دەیانچاند بە وانیان بەخشی... بەڵام کە هێزەکانی ئەمـریکـا دەرچـوون هێنـدەك کرێ گرتی خۆیـان لە وێ بە جێهـێـشتن کە بە چاکی مەشقیـان پێکـرابـوو لە وانـە «ئـەنستـاسیـۆ سۆمـۆزا» بوو کە بە سیفـەتی سەرکـردەی چاودێرانی نیشتمانی دامەزرابوو تا ئاسایش بپارێزێ... ئەم چاودێرە نیشتمانیانە بە دوای ئەو شەرکەرانە دەگەران کە لە گەڵ «ساندینۆ»دا بوون و ئازاریان دەدان... ئەمە بۆو بە هۆی تێکچوونی وەزعی نیکاراگوا...

سۆمـۆزا میللەتی دەچەوساند... «ساندینۆ» شکایەتی دەکرد لای سەرۆکی کۆمار «ساکاسا»... لێپا سەرەك کۆماریش لە ژێـر تەوژمی «سـۆمۆزا»دا بوو... لە رۆژی ۱۲ـ۲ـ۱۹۳٤ «ساندینۆ» لە گەڵ چەند هاورێیەکی خۆیدا دەعوەت دەکرێنە ماڵی سەرەك کۆمـار... پاش خواردن... لەو کاتەی «ساندینۆ» لەگەڵ باوکی‌دا و سێ لە هاوڕێیەکانی بە ئۆتۆمۆبێلەك بەرەو ماڵ دەچن، چاودێرەکانی نیشتمانی دەیانگرن و لەو کاتەی «تاتشۆ» لە ئاهـەنگێکی تایبەتی خۆی‌دابوو... فەرمانێ دەرکردبوو کە کەس نارەحەتی نەکات تا ئەگەر «ساکاسا»ی سەرەك کۆماریش بێت... هەر لە عەینی شەودا گولە باران کران و لە جێگایەکی نەنـاسراودا نێـژران... هەر لە هەمـان سپێـدەدا جێگـای هاورێیـەکـانـی «سـانـدینـۆ» بە بەر هێرشـەکی مەزنی هاورێیەکانی «سۆمۆزا» کەوت و «لاس سیگۆ بیاس» یان وێران کردو زیاتر لە سێ سەد کەس،ژن و پیاو منالً دەکوژرێن.

لەپاش ئەو کاتە،بارو زروف بۆ «تاتشۆ» خۆش دەبێ‌و دەبێتە سەرۆکی نیکا راگواو لەو کاتەدا خێزانی «سۆمۆزا» بە رەسمی بە حوکمرانی نیکاراگوا ناسرا... بەڵام هاورێیەکانی «ساندینۆ» سەریـان دانـەنـوانـدو رێکخستنیـان مایەوەو هەر بە روحی سەرکـردەی خەبـاتیان«ساندینۆ»مانەوە... تا لە ساڵی ۱۹٥٤ دووبـاره شۆرشی نیکـاراگـوا دەستی پێکـردەوە... کەچی «سـۆمـۆزا» توانی لەنـاویان ببات... لەو کاتەدا جوانترین و گەورەترین هۆزانی ئەمریکای لاتینی لەسەردەمی هاوچەرخدا لەدایك بوون وەك هۆزانی «کاتژمێری سەنەر».

لەساڵی ۱۹٥٦ خەباتگێری نیکاراگوا «ریگۆ بیرتۆلۆپێس بێرین» «تاتشۆ»ی گولە باران کردو کوشتی... کوری «تاتشۆ» [لویس سۆمۆزا] لە جێگای‌دا دەبێتە حوکمران... هەر لەسەر عەینی هێڵی زوڵم و چەوساندنەوەی باوکی دەروات...

. لە شەوی ۲۲ـ۲ـ۱۹۷٤ لە کارەسـاتـی بومـەلەرزە «ئەرنستۆ کاردیناڵ چاکترین هۆزان بە ناوی [خواوەندەکانی زەوی چارەنـووسی مانـاگـوا دەزانن» نوسی‌و وەعدیـارکـرد کە بومەلەرزەکە گەفە بۆ ئەو مرۆڤانەی خەرابەیان هەیە... هەروا خواوەندەکان ئەبێ رژێمەکانی چەوسێنەر نەهێڵن... ئەم شتە ژی لە سەرکـەوتنی شۆرشی «ساندینی» ساڵی ۱۹۷۹ بەدی دەکرێت، ئەم دوور دیتن و پێش گۆتنە لە هۆزانەکەی کاردیناڵ دا ئەوەی لە ساڵی ۱۹٦۱دا بڵاوکـراوەتە بە چاکی ئاشکرایە هەروەك دەڵێت:ـ

هوزانێت مە تا نهو بەلاڤ نابنەڤە
دەست بو دەست... دهێنە ڤەگوهارتن
ب نڤیسین... یان ب وێنە گرتن

رۆژەکێ ...
ناڤێ وی دیکتاتۆری نامینیت
ئەو یێ ل دژی وی
ئەو هوزان هاتینە نڤیسین و
ئەو دێ چیت
لێ‌ها هوزان دێ هەرمینن
بو ڤەخویندنێ دێ هەرمینن

## گۆڵی داری بووە بە شمشێر

«سالۆمۆن دی لاسیبا»

نیکاراگوا فێل لێنەکرا... بە هۆی
کەربی دڵ پڕکینی کوژەرەکانی برامان و .
دوژمنانی خراپکارو
بە لێکدانی کۆمەلانی کوژەری بیانی
بەڵکو... بەچاندنی ترس
کە میللەت تێکدەدات و
گەمە کردن... بە دادو پیاوەتی ...
ئەم ئەتجامە بە جێ دینێ
نە کۆمەڵی «ساندینۆ»
نە بێ دەسەلاتی هەڤاڵە قوربانی‌یەکان
کە بوون بە نامووبی... مرۆڤێکی سادە
وەکو ئەو بنە دارەی گوڵی گەنم تەدا لە گۆندەکەمدا
پیاوێك وەك زەلامەکانی تۆ
بە بێ لە خۆ با بیبوون
شارستانی‌یەتەکەی بێ کەڵکەو
گۆڵ‌یەکانی گەنمەکەی بێ دانن
لەبەرامبەر ئەو کێشەیەی بە نەوەکان دەگەینێ
لەبەرامبەر ئەو ژانەی ولات ئازار دەدات

هەر گەلای درەختێك ...
دژی زورداران
دژی داگیرکەران
دەبێتە شەمشێر
قارەمانێکی مەزن ... کەهێژای پاڵەوانی‌یەتی‌یە
ئەی دایکی قارەمانەکانی پایەدار
ئەگەر «ئیلیازە»
بەناو لەیاد چوونا نقوم ببێت
تەنها ئەتو ئەتوانی سرودی گرینگی بچێنی ..
پیاوێکی قارەمان ...
ناسراوە بە کوری تۆ ..!
هەموو کورەکانی تۆنە
بە بەرزی تۆ ... وەك پاڵەوانان هەڵدەستن
ئەمەیە بەرزی و خۆشەویستی ولات
لە «رۆما» ژی ...
ئەوەی لەسەر «هانیباڵ» سەرکەوت
شەمشێری نەترسان ...
لەدەست دایە
ئەو شەمشێرەی ...
بەنێو «انجیل»دا چرسکی
بە بەردەقانی داود ...
شوانی بچوك
«کۆلیاتی» نەزانی ئەژدەها کوژرا
«فیرجیلۆ» بەسەر «ئیناس» سەرکەوت
ئەوەی بۆ تیشکی جێگای پیرۆز خۆی فرەدا
زانی ... زانی ...
لە ئاگرو سوتانی «طروادە» ولات رزگاربوو
چەند ئازیزو خۆشەویستە نیشتمان
لەسەر راستی خۆشم دەوێت
هیچ کەس نی‌یە هاوبەشم بێ لەڤیاندا
هەر چەندە ئەژدەها لە رێگادا هەبن
قسەی خۆش و باڵداریان هەبێ
تۆ لە نێوانیاندا مرۆڤێکی سادەیی

ئەو چریسکا ئاگر هەڵگری
لە «ریباس» وڵاتم ...
پاکترین جێگای ئەمریکای لاتینی‌یە
تانهو ئەسوتێت و ئەتلێتەوە
گەلێك خۆشی دەوێ ..
راناوەستێت
چونکە ئەستێرە ئاوا بووەکەی
لە کاتی ئاوابووندا ئەتریسکێتەوە
لەبەر ئەوەی سپێدەیەکی نوێ لە دایك دەبێت
یان شەوێکی هەتا هەتای ..
بە سەر ئەمریکادا دێتە خواریْ
کە گیرو گرفتی بەدوایی نەهاتوو ...
دێنتە ئەم دونیایە .

## سۆزداری ئێوە

**«إدوین إیلیسکاس»**

بۆ سەرۆك «کالڤین کۆلیدج»
باوکێك کاغەزی نوسی ..
لە سەرەتادا گوتی :
ئازیزم سەرۆکی بەرێز
کاغەزەکە لە «فیرگۆتسۆن میسوری بوو»
لە رۆژی «۳»ینایر ساڵی ۱۹۲۸دا ...

تێدا گوتی :ـ
جۆن، ف هیمبڵ
لە دوایی کاغەزەکەی سەرۆك گوتی:ـ
سۆزداری ئێوە
چیرۆکی «جونی هیمبڵ»ی دەگێراوە
چاوەشەك بوو

لە هێزەکانی دەریایی وڵاتە یەککگرتوەکانی ئەمریکادا
یان وەك بڵێم:
چیرۆکی مردنەکەی دەگێراوە
لە شاری «لاس سیگۆبیاس» نیکاراگوادا
دژی جەنەراڵ «ساندینۆ»ی وەك شێر
دیسان دەگێراوە :ـ کە ئەو لەبەر ئەم هۆیە
هیچ کەرب و کینی نی‌یە ..
دژی «ساندینۆ»ی شەرکەر
دیسان دژی هاورێ‌یەکانی «ساندینۆ» ژی..
چونکە «ساندینۆ» خەباتی رزگار کردنی خۆیو میللەتەکەی
خۆیو وڵاتەکەی ئەنجام دەدا
هەر وەك خۆیان لە ساڵی ۱۷۷٦
بۆ رزگار کردنی خۆیان خەبات دەکرد
کاغەزەکەی بە زمانی کۆمۆنیستەك نەبوو
یان بە زمانی «رادیکالی‌یەك» قسەی نەدەکرد
کەچی بەزمانی مرۆڤێك دەئاخوت
کە ئەڤینداری دادو دادپەروەری‌یە

## تارمایی

**«ئەنتینۆر ساندینۆ ئەدناندث»**

لەو دەمەی دەریاوانەکان بە ندەری «کورینتۆ» یان بەجێ‌هێشت
حەزی برایەتی جولاّ
بوونیان گری دەکرد
لەکاتی رۆیشتنداو
لە پێش رۆیشتن ژی
ئەڤینداری بەهەشی بەندەرەکانمان بوون
ئەو بەندەرانەی تەژی مارو کۆلۆی دەریایین
ئەبێ هەموومان یەك بگرین
تا تارمایی قەهرەمانی تۆ

که بەنێو تەم و مژدا تێدەپەڕێ
ـێزێك بوونیت بە هەـرێ نەرم و رەنگاو رەنگ
ـە پێش ئەوەی دەریا خۆی ئامادە بکات ...
ـۆ رۆیشتنی تۆ «ساندینۆ»ی مەزن .

# ساندینۆ

**«ماریۆ کاجینا بیکا»**

مرۆڤێکە ناوی خۆی ئاشکرا ناکات
ـ تای ناوی خۆی دەرناکات
ـەگەل لەش وگیانێکی نزم بیرمان دەکردەوە
که ئەم نشتمانە ئەوەیە
ئەوەی بووەو ئەوەی نەبووە
ـۆر کەس کوژران ..
بە بێ ئەوەی هیچ بزەییەکیان بگرێت
هەموویان مردن ...
لەژێر روناکی ئەو
لە سێبەری ترس و سوپای ئەودا
که هەر تفەنگی نێچیر زیاتریان نەبوو
بە زەخیرەی سەرەتایی
چەند کەمین و فێلّ و کشانەوە،سوتاندن ...
ئەنجام دران
ـەراستیدا ... هەمووی راستن
کەچی مێژوو دەست ڤالابوو
ناردی ...
زیرەکیو خوێنی نەترس
سینگی هەمی پارتا برەنگی چاك رەنگ کر
ل بەر مر ناوی ...
هەمی گیتار رەش پۆش بوون
هەمیشە ل سەر پشتا هەڵاتن و نەمانێ
نیشتمان پەروەری ..
ل دەف مللەتێت سەرەتایی
شەش سالّ لە ناو جەنگدا
بڕوای بە هەموو کارە مەزن و بڵندو بەرزی هەیە
سوپای نەنیاسی پڕ شور
بۆ تۆل ستاندنی راستی
گەلێك جار مردن بە پێویستی دەزانێت
ئەمەیە چیرۆکی هاو وڵاتی بێ ناو
سەری دانانوێنێ جگە لە بۆ نیشتمان
بەسە ... ئێمە بزانین و لەبیری ئێمە بێت
کە مردن چەند جەورو زوڵمی لێکرد

# بۆ ئۆکۆستۆ ئیسار ساندینۆ

**[ئەلبێرتۆ ئۆردۆنیث ئۆرگۆیبۆ]**

ل سێبەرا کۆلافەکێ مەکسیکیدا
ئەنیا ویـیا تویرە ب شەمشیرەکیو
دیتنا خەمبارییا وی
پێلاڤێ ئەستو درێژی خۆ گۆریکەرا دکرە بێ خۆ
دەمانجا تەژی ئاگر ل بەر پشتێ
باوەشینەکا بارۆڤەکێ ئاخفتنێت نەراست
تەیرەکێ ب لەز
ئۆردوگای ب لەزێ وی
بەرەڤانێی دکەت
تا فروکە دکەڤیت و پارچە پارچە دبیت
تارمایێ وی دناف [تشیبوتێ] بلند دبوو
وەك پەیکەرێکێ ل گیانێ ئوجاغێت کەڤندا
دەبیا نەمر ببیت
ل وێرێ دەبیا د گەل بزاڤێت خۆدا بیت و
دەبیا بێژتە هەمی میللەتێت بیانی :ـ
ئەڤە «ساندینۆ»یەو ل هەمی گۆرەپانێت ڤیرەدا رادوەستیت.

«دوو هوزان»
[فیرناندو غوردییو]

# ستل

دوو مری ..
ئێکەك ل بەرامبەر هەمیا
ناچێتە دناڤ دلێ هیچ کەسەکیدا
ئەوێ دی کەس نابینیت
لێپا دناڤ هەمی دلادا دژیت .

★ ★

«پەیڤ»
تشتەکە گەلەك جارا من دێخته دتەنگاڤییادا
ئەگەر زاروك بپرسن
-: باب... کێ «ساندینو» کوشت ..؟
ئەرێ دمبیا ب چ پەیڤ پەرسڤا وان بدمینەڤە

# ٢١ فیبرایر

«سلیادو مورییو»
تە گوهـ ل دمنگێ گۆلایە
ل شەڤا پانزدەی سیپتێمبەرێ
ل نێزیك بنگەهێ فروکا
ل لایێ پەرێزا «لادبیانگا»
دمنگێ گۆلا دهاتە گوها
ئەم دچوینە دناڤ شەڤێداو ...
ژێ دمرکەتین
سەردابەکا ژێر ئەدرییەو
هیچ ناگەهێتێ..
شکەفتەکا سەربرێت کرێ گرتی یەو
«کاین»ی هیچ تشتەك ژ برایێ خۆ نەدزانی

«یهودا»ی ژی پارێت خیانەتی د هەژمارتن
خزم وکەس ل بەر دمرگەها د ئاخفتن و
بۆ وێ هندێ پیچەك بابێ شەمالێ هەلژێ
بۆ بەربانکی چەند کورسیك ئینانە دمر
هەمی تشتەك ل ڤێرێ ...یێ راوەستایە
رۆژنامەو ...
باروڤەو ...
ژیان ....
دمربارا زیندانێت رامیاری د ئاخ
ل خو گۆرێکەرا
ل پێتەڤێت رویدانا کارەساتەکێ
بو نەهێلانا تشتێ مرنێ ...
د ئاخ
دمربارا مەودابێت بێ دمنگی و ترس و لەرزا د ئاخفن و
بۆ ئاشتی یا گۆرستانێ
بۆ وان یێد بەرزمبین
ئەوێت نەهاتینەڤ مالێت خۆ
دمربارا ئەو زیندانێت پاش چەند هەیڤا
زیندانا چەند سالا
بۆ مەیدانا سیدارمدانێ
ل ئوردوگایەکێ سەربازێ
ب هاژوتن
دمربارا وان د ئاخفن
شەڤێت بەرێ د خەمباربوون
ریڤەچوونا مرۆڤی ب تنێ
دێ بەرزمبیت ئەگەر ئاخف
ئەگەر بوو ...!!

# بیرکردنەوە لە مردنی قارەمانێک

# بۆ ئۆکۆستۆ تیسار سانحیۆ

[فرانسیشکۆ دی ئەسیس فێرناند

کەس نەیتوانی لە تەکیەوە بمینێ
کەس نەیتوانی مردنی لێ دوورکاتەوە
یەکێك دوای ئێخست
ئەوە ... ئەوەی ناگەینێ کە ژیانی لەلایە
مەودایەکی تری هەبوو
هەر وەك ڤیان... بۆ ژیان ئەمرێو
زەوی تەژی ئاو دەبێت و
ئەو شتەی بناغە گرتی ویران دەبێت
لە ناو شەپولەکانی مردندا دەسوتێن
ئەو وێنانەی ... دوور نەبوو لێزمەی باو باران بگرنەوە
یان دڵێك بجولێنەوە ...
کە هێشتا ژیان تێدا مابێ
ئەوەیە سروشتی مرۆڤ
لە نیکاراگوادا زیاتر لەم نەریتانە هەبوون
لێی گەرێن ب ئاخوێت ..
لەسەر چەند مەسەلە
پاشان با پیاڵەکەی هەڵدات
بەڵام ئەگەر دەنگەکە بەلای یەکێك دا بچێت
لە شەکەی ساغ دەکاتەوە بە نانەوای
دزێکی تری بیانی درۆزن
«گواتوسا» مەزنە لە سەرسینگی
بە چاقو هەڵکۆلاوە
یان دەهاتە وێری باپیرەکێ ئامادەبوو
پاڵەوانەکا ئامادەبوون بو کارەساتی پیشەیی
لێرە ... لە ئەمەریکا لاتینیدا
بەچاکی ئاشکراو دیارە
پاڵەوانیو شەهادەت و تەم و مژ ...
«بۆ ساندینۆ»

«گلی باتیگاس»

بەیتێکی شیعر بکەمە دیاری ... نە
چاکترو گرانتر لەبەیتی شیعر ...
هەڵکێشانی شەمشێرە
بە روی دز
سترانێکی بکەمە دیاری
چاکترو باشتر لە ستران
کەمینێکە ...
سەربازێکی کەرامەت ..
مرنێ بۆ دوژمنی بە دیاری ببات
بو بەیتە هوزانەك ببەم
بو دزی بەرزی وڵاتی خۆم بە دیاری
یان سترانێك بو رێگرو نژدەچییەك
کە ئەڤینداری نیشتمانی خۆیە
ئەوەی خۆی گۆری وڵاتی خۆی دەکات
کەم کەس ئەم کارەیان ناسی
باشترە دەبیا ..
دەنگێ من سترانبێژێ وی بیت
زەندو باسکێت من ژی
ل سەر چیایێ بلند
بەیراقاوی هەڵگریت
باشترە دلێ خۆ یێ سورو زەر
ل ئێڤاری
دلێ منێ بڵندو مەزن ..
بو ببەم
ل سەر عەینی رێزا چیاییت بلند
کو ڤیا نا مە هەمیا پیڤە یاماێو
دێ مینیت

**سەرچاوە**

گۆڤاری «الفصول الأربعە» ژمارەی ١٨_١٩ سالی پێنجەم ١٩٨٤

●

# شەوێکی تر

حەسیب قەرەداخی

١٩٨٨/١١/٧



دیسانەوە ـ هاودەردەکەم ـ وا پێم نایە شەوێکی تر
جامی خەمم هەتا لێوە
ئەی ڕابەری خەمبارەکان .. ئەمە جامی خەمی منە
خەمی کەسی پێ مەپێوە

لە چاوم دا خۆی ناگرێ و من هەر دەینێم بەسەرەوە .

ژیانی من چامەیەکە بەسەریەکدا تێکشکاوە
سەرخۆشیش بم دێر بە دێریم بیرخەرەوە
ڕەخنە سازیت... گرێکانیم بۆ وازبکە،
هێماکانی هەڵبەرەوە .
وا کووپەی مەی دەگاتە بن.. باوەربکەن تەواو مەستم
کەفتەم، کەفتەی ئەم مەیخانە سێبەر قورسەم

بێ داردەستم .
هۆ شەمەکەم، شەمی دێری تێروانینم
منی (سەنعان) مێزەرمەکەم کرد بە ـ زوننار ـ
بەر لەئەوەی سەر هەڵبڕیت
ـ کە من چاوم بە چاوت کەوت ـ چۆن دەتوانم
بڵێم من شێخی سەنعانم ؟!
چۆن چۆن بڵێم من مەزهەبی (تەرسا)ی ئەوین
چاک دەزانم ؟!
باشە ئاخۆ تۆ پرسیوتە، من لە کێشی ئەم بارەدام؟
باشە ئاخۆتۆزانیوتە من ژێیەکم لە ناو گەرووی ئەم شارەدام؟
ـ ڕۆژێ مێژوو هاتە ئێرە ..
لە لاپەڕەی دوو سەدەیدا ..
وتی بینیم کۆڵە سواران بە پەنجەی کۆڵ ژێیان دەکوشت ـ
منیش لە ناخ و سۆزم دا ئەوەی هەمبوو ـ فرمێسکی سوێر ـ
بۆ کەژاڵ و بەهارم ڕشت .
هەمووساڵێ: حەقە پەڵە.. داوای شەست و لافاو دەکەم،
چەمی ئەشکم بێ و سەربکات
چەوی سووری دەردی گرانی عومری خۆم بۆ دەربخات
ئەی تۆ هاتی ماڵۆچکەکانی دڵی من شەخڵ بکەی...
ببیان پێوی ..
ئاخۆ ئەم عیشقەی تۆ دەگرن ؟
بەچکە کەوی شیعرمکانم دەستەمۆکەی
ئاخۆ دەژین یاخود دەمرن ؟
کە تۆ پرسیت ـ ئیمتحان بوو ـ ناوی گوڵان چەن دەزانیت؟
منیش وتم باوەربکە تەنها ناوی تۆ دەزانم
وەکوو (سیزیف) هەر بە تەنها تاشە بەردی ئەم خولیایە
سەردەخەم و دەهێنمە سەر نەری شانم
کە تووڕە بوویت وتت ئەی تۆ لە خوای ئەوین داوات چییە؟
وتم هەرچی ژنە کوردە ...
بڵێت بەخەنجەر دووگیانم.
ئەم هەلەیەو لە دەستی خۆتی دەرمەکە...

بێرە ناو خەڵوەی شێواوم
درەختێکم. بێ سەیربکە.. ئاخۆ چۆن چۆنی ڕوواوم؟!
ئاخۆ سایەم کەڵکی هەیە لە ڕێگەتا ببمە سایەت؟
لە ئینجیلی بەرباخەڵتا دەشێ منیش ببمە ئایەت؟
من ئەو (زەردەد) م بێ بمبینە، جێگە نوێژی (نارامسین) بووم
چەپڵم سەکە .
فێری حەوزی سەرچاوەکەی قەرەداخم
قەت ناچاری تەیەمومی خۆڵم مەکە .

★ ★ ★

ئەی شەمەکەم، ئەم شەویشم بەم سەرمۆرە دەبەمە سەر
ئەی شەمەکەم مەیەو مەچۆ ..
با (شەولەبان)ی شەوی شار نەت دا لەبەر
هەر هیچ نەبێ تۆ بمێنە بۆ زاخاوی خەنجەرەکان
هەر هیچ نەبێ تۆ بمێنە وەکوو مۆمێ بۆ دەرەکان
لە کۆچەڕێی کۆچەریدا.. هێندە دەرە هەڵکەنراوە
بێ شەوقی شەم ڕێ دەرناکەن
بێ شەوقی شەم شیعری منی بابی خەمان لەبەر ناکەن
بێ شیعرو گر .. هەتا ماون تاجی ڕەواج لەسەر ناکەن.

★ ★ ★

ئەی جامی خەم کە شەو دابێ هەر بە پری دەتخۆمەوە
سەورزەی مەزەم مەی ئالوودە، من سەوزەی خۆم ناشۆمەوە
من لە ڕەنگی جوانی تۆدا تاڵاوی ژین ڕادەماڵم
ئەی جامی خەم شێوەی شەمم لە تۆدایە...
هەموو شەوێ بێرە ماڵم
بێ تۆ گوندێکی وێران و بێشکەیەکی بێ مناڵم
بێ تۆ ساوای زەدەی دەستی شەولەبان و دایکی هاڵم
بێرە ماڵم، بێرە ماڵم
شاپەڕێکی تازەم دەیێ بیخەمە سەر تینی باڵم.



# حەزێك !

جەلال مەدحەت خۆشناو

هەولێر ١٣ / ٩ / ١٩٨٨

ئازیزەکەم . . . .
عیشقت کارێکی تێ‌کردووم
هۆشی لە کەللەدا بردووم
لە تاوی تۆ ، نەڕۆژ نەشەو
چاو نابێتە میوانی خەو !
هەزار وێنەی جوانی باڵات
لەبەر چاوم دێت‌و دەڕوات
سەر هەڵئەدەن ، دەنوێنەوە
بۆم ناگیرێن ، دەکوژێنەوە !
هەزار نەخشی تۆی گوڵی گەش
وەك نووسینی سەر تەختەی ڕەش
دای دەچینم‌و دەی بڕمەوە
کە بۆم نابێ ، دەی سڕمەوە !
ئازیزەکەم . . . .
لە جێی ژوانان ، لە کاتی خۆ
کە تۆ یارم بووی تەنیا تۆ
کە چاوەکانم تێ دەبری
مەلی هیوای دڵم دەفڕی !
حەزم دەبوونە پەپوولە
دڵ دەکەوتە خورپەو جوولە
کوڵمەکانت دەبوونە گوڵ
بۆ ماچی تەڕی لێوی دڵ !
ئێستای دەردی پیری‌و زەمان
لە گەلاریزان‌و خەزان
نە خونچە گوڵم لەپارە
نە جێگای ژوانیشم دیارە !
ئازیزەکەم . . . .
نابێ جارێکیکەی زەمان
تۆم بکاتەوە دەزگیران
هەر دووك ببینەوە بەلاو
بچینەوە باوەشی لاولاو !
مانگی گوڵان . لە بەهاران
پاشی ڕێژنەی نمە باران
پەلکە زێڕینە بدەینە کۆڵ
بخشینە خواری دۆڵاو دۆڵ !
یاخود بەرەو لووتکە ڕاکەین
لەگەل قاسپەی کەو سەماکەین
گزنگی ڕۆژی نوو بگرین
ئەوسا با بە جووتە بمرین
٥

○ ئەمین حەیدەر ○

# ب

دنکێن گەنمی
پشتی دگەهی .
دگەهیتە هەڕەتا ژینێ‌و
سوردکەت سەر پانکا مشتاخێ .
ژنوی پێڤە
هێژ نەبوی نان .
زەڤی یێ بو هەلدکەلێشن
ئاڤێژنە ناڤ لاتێن ئاخێ .
وەسا وەغەرا گەنمی
ڤوناغێن وێ بێ وەستیانە .
ژیانەکا بەردەوامە
بەردەوامیەك بێ ناڤبڕ
پڕ ژیانە

لەوا دگەل ئاڤیا ئێکێ
گادار دگەل وێ ژڤانە . (١)
بوهار تێت‌و
گەنم کە سکە
وەك ڕەنگێ هیڤیێن سەری :
لێ سەرێن مە
کو دگە هنە لێڤا مرنێ‌و
دانگا ژیانێ بەرددەن .
کۆدەکا مرنێ ڤەدخۆن .

# ساران وشـــــۆڤ

لاتەك كويرتر ژ بێ گەنمی
دكەنەوار .
ڤێجا هەكە
كاكلا سەران پیژۆك بیت
مرنا وان هەر مرنە ،
ڤەژین نابن
ناكەن وەرار .
لێ ژیانا مە
دگەل گولێن گەنمی
بەروڤاژە .
ژیانا مە
بــ مرنێ دەستپێ دكەت .
ژیانا وان
بــژیانێ دەستپێ دكەت .
ئەو هەمی زكا تێر دكەن
ئەم هەمی چاڤا پڕ ناكەین
ئەو هەمی دەڤا پڕ دكەن
ئەم هەمی سەرا پڕ دكەین .
هندیكە سەرو گولێنە
دنالەك دی
وەكی هەڤن .
ئەو تێن خارن

ئەم تێن خارن .
وان چ جارا شۆڤ نەڤێتن
مە چ جارا گۆڤ نەڤێتن
لێ هەكە باران نەباریت

دز نادزن
ناهێن خارن
ئەو دناڤ لاتێدا درزن .
هنگی مرۆڤ
ئەو دێ سەرێ ئێكو دوو خۆن .
هنگی مرۆڤ
دێ سەرێ مرۆڤاتی بێ شۆن .
بارانا شین بوونا مەژی
هزرو بیرن .
گەر تاڤیا هزرو بیرا
مە نەباراند .
سەر درزیت
چ ناگریت

چاڤ بۆ دگریت
بوهار دكەربا دچرمسیت
دیرۆك دكەربادا درە ڤیت
خەونا نیڤەرو ڤەدرەڤیت .
زیندە خەونا تەڤ زیندیا
دبیتە خەونەكا مری .
دەرسۆكا هەمی سەیدكا
دچاڤێن عەلی بەگیدا
دبیت كوری .[۲]
باران باران
هەكە مە ئەو باران نەمان .
زەڤیكا مە دمینیت شۆڤ
خانیكا مە دمینیت گۆڤ .
هەكە زەڤیو خانی ژاربوون
وەدیارە .
مە نەمان دیرۆكو مرۆڤ .
باران باران
باران نەبیت
نەزك تێرەو
نە هزرەكێ ددەتن سەر .
باران نەهێت
زكێ دەستاری بر سیەو
خەم پێڤەتێن گولێن زەر .
دل بۆ كۆڤانان كورسیەو
ژدارێ هێڤیا مەزن
بێ وازیو ڤەمان تێنەبەر . . .

(١) گادار : هێمایە بۆ (حەسەنێ گا دار) ئەو خۆ كەسبیەك چڤانوكیە دبێژن ئەوی هەمی دنیایێ كێلای ئو لدەمێ گوتینێ : بەسە جامێر بێ هەر مرن وهێلانە . ئەوی رژدیا خۆ دیاركریەو گوتیە وان : هەتا مرنێ هەر كرنە . .
(٢) بەیتێ عەلی بەگیو سەیدەوانێ كورێ وی . بێ خویایە . دەمێ لچیایێ مەقلوبێ شێخان عەلی بەگ بــ دەستێت خۆ بێ دەستی سەیدەوانێ جەگەرێ خۆ دكوژیت . كو دەرسوكا سەیدەوانی لــبەر چاڤێن وی دبیتە كوریا خەزالان لــدەمێ با دهژیت .

# دەنگی ئەوین

من پێت نالێم خۆشم دەوێی !
بەڵام ئەوەندە دەزانم ..
لە هەناسەم پێویست تری بۆژیانم
لە گیانیشم پێویست تری بۆ مانەوەم
لە سۆماشم پێویست تری بۆ چاواتم
من هەر ئەوەندە دەزانم
بێ تۆ ژیانم مردنە
هەرچی دەکەم نرخی نەبوو .. نەکردتە
من هەر ئەوەندە دەزانم
تۆ نەبی هیچ شا مرۆڤێ
نابێتە هۆی بوژانەوەی
هەست و سۆزو شیعرەکانم
من هەر ئەوەندە دەزانم
لە ئۆکسجین پێویست تری بۆ ژیانم

○

مەهاباد قەرەداغی

○

# گۆت

حازم هاجان

رۆژ وەلاتێ بیرا منا
چاخێ دگریت ، !
رۆندکا وێ خەتیرا منا
بسەردە بەردن چەند لێمشتێن تارێ ·
لێبرەشینن تەرگ‌و باران ژ زۆرداریێ
لیبرەون هورو باروڤا
تێوەربن ڤۆلێ گورگ‌و هۆڤا
داناکن زك کونج‌و گۆڤا
ئەڤێ رۆژێ هەڤیر دکم
تێکلی هەش‌و ژیردکم
دکما نانەك . . ! !
من هیڤیا پێ تێربتن جهانەك
ئەڤێ بیرێ دەمێ بێریێن خوەزیکا ،
ڤەنج د دۆشن . . !
پەیڤێد ساڤا ،
یێد رووت‌و لۆچ‌و کوزری بنۆشن
بێ چەنگ‌و پەر
دێ فردن‌و خوە ژ قرەرەشك‌و قولنگا
ناڤەشێرن ! !
پاخلێد ئەسمانا دێ ساکن
لناڤ مەژیێ ستێرا . .
دێ هێلینا ڤەوەژێرن . ! !

چونکی ئەو ستێر ژی وەك دلێ هۆزانێنا
بخورتی د ژەنن ، !
دناڤ لەپ‌و پەنجێد تاریێدا
بزۆری د کەنن ، ! !

* *

رۆژ جیهانا ژنبا منا
رهـو ریچال ڤینا منا
من د ڤەژینت ژ مەرگێ خوە
من ئاڤددتن ژ جەرگێ خوە
ئاخینکێد من هاویش دکت
تەزینکێد ناڤ گەهێد من دا
بەر پیش دکت ، ! !
من د کۆلت بنکلێ پەیڤێ
کورترین دەرزا مێژوا من
لێدهلکت هەیڤێ

* *

دشەڤێد من دا
رۆژ پرتوکا ئەز لێدخوینم
سپیدەیەك نوو ژ گەشیێ ئاڤس
لسەر لێڤێد وێ . . ئەز د بینم ! !

○

# دوا
# هۆزانی خۆشەویستی

نەوزاد بەندی

دلدارەکەم ،
ئەم ژووانە ، دوا ژووانە !
ئەم ووشانە ، دوا گفتوگۆن . . !
دوا رازی نێوان منو تۆن . . ! !
دوا رازی من وتۆن
دوا سەرنج ئەگرمە چاوت .
خۆم ئەخەمە دوا شەپۆلی
قژی خاوت . . !
سەرم ئەخەمە ناو پۆلی
پەنجەکانت .
ئەمە سیفمۆنیا بۆ نازو
پەنجەکانت . !

* * *

دوا ژووانە . . !
ئیتر چیرۆکی دلداری
نێوانمان ، کۆتایی پێ دێ . . ! !
ئیتر کاتی گیڤگلدانو
تەنیایی دێ . . !
ئیتر تۆ لە من وون ئەبیو
من لە تۆ وون !

کێ ئەزانێ ،
چەند سالو مانگ تێپەڕ ئەبن ؟ !
کێ ئەزانێ ،
چیت لێ دێ تۆ ! ! ؟
چیم لێ دێ من ؟ ؟ !

* * *

دلدارەکەم :
هەر کاتێ خەزان دەرکەوتو
گەلاێ دارەکان هەلوەرین ،
ئەو کاتە یادم کەرەوە ! !
هەر کاتێ شەوانی هاوین ،
ئەستێرەیەکت دی ، کشا . .
هەر کاتێ پێکی تەمەنت ،
زۆربەی رژا . .
هەر کاتێ کە بەفر باریو
پەلەوەرەکان کۆچیان کرد . .
هەر کاتێ گورگی رەشەبا ،
هەلمەتی بۆ ژوورەکەت برد ،
ئەو کاتە یادم کەرەوە . . ! !
ئەو کاتە لاپەرەکانی ،
دەفتەری یاد هەلدەرەوە . . ! !

* * *

بەلام گیانە ،
کاتێ بەهار
بە لەنجەو لار
سروشتی بە گولو گولزار ،
رازاندەوە . .
هەر کاتێ کە باران باریو
بەفری لوتکەی شاخەکانی ،
تواندەوە . .
هەر کاتێ رۆزگار ، دۆستێکی
وون بووی بۆ لام ،
گەراندەوە ،
لەو کاتەدا ،
پڕ بە دل یادت ئەکەمو
باست ئەکەم . . ! !
بۆت ئەگریمو . لە خەلکو خوا : —
داوای دەنگو باست ئەکەم . . ! !

# کۆچ

بەیان کانەبی عەولاّ

که تۆ برۆی
نەدەتوانی ژانی مێژوو .
لەئەستۆی خۆت بکەیتەوە
نەدەشتوانی بستە خاکێکی جێنشین
دوورخەیتەوە
نە دەتوانی دڵۆپی ژان
لەنێو پێکی بەردەمتا هەڵفرێنی
نە دەتوانی زەردەخەنەی ڕەنگاو ڕەنگی پڕ لەهیوا
بۆ ئەم منداڵانە بێنی .
هۆ شاعیرە بێدەنگەکە !
وەرە مەڕۆ !
هێشتا دونیا نەگۆڕاوە

دونیا زۆری وەبەر ماوە .
وەرە مەڕۆ !
لێک دابڕان ،
بێهودەیە
چونکە بەدووان
دەتوانین ژان شەتەك دەین و هەڵفرێنین .
چونکە بەدووان
زەردەخەنەی ڕەنگاو ڕەنگی پڕ لەهیوا
بۆ ئەم منداڵانە دێنین .
وەرە مەڕۆ !
توخوا مەڕۆ !

# پەسنا کچا گوندا

صباح یحیی

هو یڤیا دلا کچا گوندا
ڕەوشا هەمی مالا تو
سەر بلندی لەو نەوندا
دیمەنا هەلالا تو
**نازكو دلێ پڕ ئەڤینێ**
**چنارا نهالا تو**
**ڕۆژا جەنگێو دەست هەلینێ**
**پێشرەڤا هەڤالا تو**
لچیاێ پڕ ئەشکەفتو دۆل
ڕۆژا سەرێ سالا تو
سپێدەهیا دل تژی شۆل
هێزا زەندێ پالا تو

**چەندە شەنگی کەزی شۆڕێ**
**بوان زلفو خالا تو**
**ب بهاڤێ نازك پۆڕێ**
**گەشکە دلێ کالا تو**
هەیڤا شەڤێت گەنجو لاڤا
بڤ ژانو مەتالا تو
ژ ئەڤینا گەرمە تاڤا
بابێ هوین جەلالا تو
دەما دیللیو خەزانیێ
دوستامە عەبدالا تو
لشۆڕەشا ئەڤینیێ
زبنا مەمێ ئالا تو

# جێ ژوان و کچی شیعر

م . ر. کوردۆ
٩٨٧ چەمچەماڵ.

کە ڕێژنەی بارانی نیگام،
دەگرمە چاوی ( کات ژمێر)
وەك بوکێکی تازەی نازدار ، بەنازەوە؛
بە ئاستەمێك : بە دەنگێکی،
پڕ سۆزی خوای ئاوازەوە..
دەڵێ بنوو:
بەیداخی شەو،
بۆ نیوەو بەڵکو زیاتریش..
هەڵکشاوە
چاوی خەڵکی:
(زنە)یەکی ووشك بووە ..و
لقی سیروانێکی خەوی تێ ڕژاوە..
دەڵێ بنوو:
ئێستا کۆرپەی دایك مردوویش،
هێندە بەبێ ناز گریاوە؛
هێندە هەنسکی بۆ ناخی شەو هەڵداوە؛
دوو چاوە خنجیلانەکەی:
سوور بووەو خەوی تێ زاوە..
هەتا مناڵی وورکنیش،
ئێستا وورك بەری داوە..
دەڵێ بنوو:
ئێستا نازداریش پرچەکەی تێك ژاکاوە..
ئێستا جێ ژوانی یارانیش
کپەو خامۆش
تەنیا بۆنی گوڵاوی ماچی لێماوە..!

* * *

جێ ئامادەیەو ئامادەم،
وا هەڵدەستم:-
گڵۆپەکەم دەکوژێنمەوە. و
دەرگاکەشم کڵۆم دەدەم..
کە سەر بۆ سەر سەرینەکەم،
بەئەسپایی،
شۆڕ دەکەمەوە ، وەك میوان..
هێواش ، هێواش
یەکێك لەدەرگاکەم دەدا؛
کاتێك دەرگا والادەکەم،
سەرنج دەدەم :-
کچی شیعرە دواکەوتووە ..و
تازە هاتووە ، بۆ جێ ژوان ..!

# کاڵێی گوێ ئاگردانەکە

گەزیزە

لە دوای نیوەڕۆوە تۆ ئارامــت لێبــراوەو هەر وەك ئاســمان بەکوڵ دەگریت . . . خەریکە بدەیتە شەقەی باڵ و بەسەر شانی باوکتەوە بنیشیتەوە . . . چی دەکەی ؟ . . .
خۆ گڤەی باو دەنگی باران و تۆفانیش لەولاوە بوەستێ ئەوەندەی تر ترسی لەگیانتدا ڕواندووە ، بە هەموو ژیانی خۆت شەوی وا تۆفان و بەفرو سەرمات نەدیوە ، . . . بۆ پشوویەك نادەی ؟
بیر لەچی دەکەیەوە ؟ . . . سەرەتای ئەم شەوە زۆرجیاوازە . . .
سەرەتایەکە تا ئێستا بیرت لێ نەکردۆتەوە ئەویش تەنیاییە ، ئەم ئێوارەیە نە باوکت دیارەو نە بەرماڵــەکەی ، . . . بیرتە هەموو ئێوارنێك دەست بەنزاوە کرنووشی دەبرد بۆ خواوەندی میهرەبان و تۆش بە دڵێکی خۆشــەوە خەریکی خواردن ئامــادەکــردن بوویت ؟! . . .
کەچی ئەم شەو نازانیت ڕوو لەکوێ بکەیت ؟ . . .
جارجــاریش لوورەی بایەك بەبــەفــرەو شالاو دێنــێت و بەر پەنجــەرەکــەتــان دەگرێت ، تۆش تەڵەزمە دارێکی کە دەخەیتە ئاگردانەکەوە ، هەر لەگەڵ کڵپەی ئاگرەکەدا قرچەیەك لە دڵتەوە هەڵ دەستێ . . . ترس و سەرمــا بوونــەتــە هاوڕێی ئــەم شەوەت . . خێرا بەرەو پەنجــەرە بچکــۆلانــەکــە دەڕۆیت کە دەڕوانێت بەسەر کۆڵانە باریکەکەدا . . . جا هەلاوی دەمت بەر چاووت دەگرێ و بەچمکی فەقیانــەکەت شووشەکە دەسڕیت تالەودیووەوە بالای باوکت دەرکەوێ . . .
جا کە ناهومێد دەبێت لەگەڕانەوەی هانا بۆ ئاگردانەکە دەبەیەوەو هەردوو ئەژنــۆت بە دەست دەبــەستیتــەوەو سەرت دەخەیتە نێو باوەشی ئەژنۆتەوە ، وەك جۆلانێ خۆت دێنیت و دەبەی . . .
ئەوەتا فرمێسکەکانیشت توانای خۆ ڕاگرتنیان نەماوە ، ناچارن بێ شەرمانە بچۆڕێنە سەر کوڵمە ئاڵەکانت . . . . . دەی ئێستا ڕوو لەکێ دەنێی ؟.
لای کێ سۆراخی باوکت دەکــەی ؟ . . . . دیسانەوە دەستت کردەوە بە گریان . . . خۆ ئێستا مناڵ نیت . . . ئەزانی ئەمەیان گریانی منالی نی‌یە . . . کەچی هەردوو جۆرە گریانەکەش هەر بۆ باوکتە . . . بیرتە بە منالی چۆن بە دوایدا ئەگریای ؟
وەرکت ئەگــرت و ئەگــریای تا لەگەڵ خۆی بت باتە دەرەوە ، ئەویش هەموو جار پێی ئەووتی :ـ (ئاخر کاڵێ گیان من ئیش دەکەم گەر لەگەڵم بیت ماندوو ئەبیت) . . . .
تۆش نەت دەزانی نەئیش چی‌یەو نە ماندوویەتی ، .
پێت دەکوتا بە زەویداو قژە خاوە کاڵەکەت دەهاتە سەر چاوت و بە دەستە خڕیلانەکانت چاوەکانت هەڵئەگلۆفت و ئەت ووت :
نا . . . نا . . من هەریەم . . ئەی لای کێ بم ؟
من هەریەم . . . یەم

ئیتر کە باوکت گوێی لەم ووشانە ئەبوو ئەوەندەی تر ماندوو ئەبوو...
هەموو جار ناچارت دەکرد کە پێت بڵێ: - (ئاخر کچەکەم من کۆڵ هەڵئەگرم.... تۆناتوانیت... ئەزانی کۆڵ هەڵگرتن مانای چی؟!)
تۆ ئەو کاتە منالْ بووی هیچ شتێکت نەدەزانی. بۆیە خێرا وەڵامی باوکتت ئەدایەوەو ئەت‌ووت: - (قەیناکا تۆ بمبە منیش کۆڵ هەڵ ئەگرم).
بەڵام نەت‌ئەزانی باوکت بۆیە نات‌با تا ماندوو نەبی. - چووختی

ـەکـەو بازارەکان نەبیت، تا زمانت بە ووشەی ناشیرین نەبژێ... کاڵێ ـوکت لەوە دەترسا تۆی خنجیلانە دەمارە دەرپەڕیوەکانی دەستە ـسووەکانی ببینیت لەکاتی کۆڵ هەڵگرتن‌دا.... تا... تا... ئیتر هەـسکەکانت دەبوونە تیرو دڵە کونبووەکەی باوکتیان لەت لەت دەکرد... ئەویش ناچار ئەبوو دەستە خڕپن‌و خڕیلانەکانت لەنێو دەستە جڕچ‌و لۆچەکانیدا بشارێتەوەو بڵێ: — (دە قەبناکا... وەرە... ) تۆش بە پێکەنین‌و قریوەقریو دوای ئەکەوتی‌و.... خۆ ئێستا ئەوکاتە نی‌یە، گوێی ـەگریانت نی‌یە تا لە ئامێزی خۆیت‌گری‌و ژیرت کاتەوە... گریانی ئەم شەو بێسوودە.....

بیرتە کە لە سەری کۆڵانەکەوە بەرەوخوار دەبوونەوە بۆ بازار. هەستت دەکرد هەموو ئەم جیهانە موڵکی تۆیەو وات‌دەزانی کەس باوکی نی‌یە تۆ ـەنی؟!... ئەی بیرتە کە باوکت کۆڵەکانی بۆ خەڵکی هەڵدەگرت، کە ئەت‌زانی بارەکەی قوورسە، خێرا هاوارت دەکردو بە گریانەوە ئەت‌ووت: — (نا... نابێ هەڵی‌گریت... نابێ.... زۆر قورسە.....
....).

باوکیشت بۆ ئەوەی فرمێسکە گەشەکانت نەبینێ، کۆڵەکەی دەئەگرت‌و بە دووسێ جار دەیبردەوە.... کاڵێ ئەزانی گریانی ئەو کاتانە بۆ ـمووبوونی باوکت بوو، گریانی ئەوکاتە جیاوازبوو. کاڵێ تۆ ئەوکاتە منالێ ـوی هیچت نەدەزانی، کەچی لە ناخیشتەوە بۆ زۆر شت ئەتلایتەوە....

ئەی ئەو ڕۆژانەت لەیاد دێ کە لە ئیش‌کردن دەبوونەوە باوکت ئەیخستیتە سەر قەڵان دۆشکانی‌و تۆش بە قریوەو پێکەنین دەستت دەکرد بە یاری‌کردن‌و کڵاوە چڵکنەکەی باوکت لەسەری دائەکەن‌و ئەت‌کردە سەری خۆت‌و دەستە خنجیلانەکانیشت دەهێنا بە سەرو قژە چڵکنە ـنۆسکاوەکەی باوکتا، دەمیشت پڕبوو لە نووقڵ‌و چۆرەك‌و گوڵە بەڕۆژەو، هەموویت بەیەکەوە ئەخوارد... چەن دڵت خۆش بوو، پاشان دەستت دەکرد بە گۆرانی ووتن‌و بە دەنگی بەرز دەت ووت: (هاتینەوە... هاتینەوە... لە کارکردن هاتینەوە...). ئەم گۆرانیەت ئەووت ئەووتەوە تا ئەگەیشتنە ماڵەوە،.... ... ڕۆژانت ئاوا بەسەر برد... تا بوویتە ئەم کچە شۆخەی ئێستا... کە ئەمانەت دێتەوە بیر خەریکە بەرەو دەرگاکەی دەرەوە بفریت‌و بچیتە ناوکۆڵانە تەنگەبەرەکەتانەوەو پڕ بە دەنگ هاواربکەیت: (باوکە گیان.. وەرەوە... خۆشم ئەوێیت... گوێت لێمە..
؟...

هەناسەکانت هەمووی دوکەڵەو کەچی ناشزانیت ئاگرەکەی لەکوێ‌دایە؟

کە گەورە بوویت هەوڵت ئەدا ماندوویەتی باوکت برەوێنیتەوە، کەچی ئەو ڕازی نەدەبوو. هەموو جار ئەیووت: (کچەکەم تۆ ئەتەوێ خۆڵی‌سەرروخسارێکی ماندوو بسڕیت؟) ئەمە کاری تۆ نەبوو هێشتا زۆرت مابوو تا بە ئارەقی نێوچاوانت باوکت تێر کەیت.... ئەو لەپێناوی تۆدا هەموو ژیانی خۆی دانا. تا بەسەربەرزی بژێت، تا لەبەر دەرگای گیرفان پڕەکان‌دا برسی نەبیت... باوکت ئاوا گەورەی کردیت، تۆش هەموو ژیانت بووە خۆشەویستی ئەو، وای‌لی‌کردیت نرخی هەموو پیاوێکت لابێت... هەموو جار بەخۆتت ئەووت: (گەر لەدواڕۆژدا ماڵ‌و منالم بوو، منالەکانم واگۆش دەکەم کە ببنە نموونەی ڕێزو خۆشەویستی بۆ باوکیان، بە ووشەی باوك پەروەردەیان ئەکەم... ). کاڵێ ئیتر بەسیەتی بیرکردنەوە سوودی نی‌یەو ئەم شەوت جیاوازە لەشەوانی تر ناچێت.... ئەم شەو سەرەتای ژیانێکی بێ‌باوکی‌یە...، بەهەموو ئازارو خەمەکانی خۆتەوە لوول بویت، تا لەبەرەبەیانێکی زوودا. ڕۆژگار چەپۆکی ڕەشی کێشا بەسەرتاو هەواڵی مەرگێکی ترسناکی دایتێ.... هەواڵی نەگەڕانەوەی باوکت... دەی ئێستا بگری.... چاك بگری، ئیتر ناگەڕێتەوە... سەرما زۆری بۆ هێناوە برسیەتی‌و پیریەتی تەنگی پێ‌هەڵچنیوە...، .....، تادوا هەناسەی بۆتۆ ڕەنجی دا، تا پرچە کاڵەکانت گەردیان لێ نەنیشێ... تا...،....
دەئیتر هەڵسە لەپەنجەرەکەوە سەیرێکی گوێسوانەکانی بەرانبەرتان بکە... سەیرێکی کۆترو ریشۆڵەکان کە، چۆن سەرماو بەفرو باران ڕاوی ناون. ئەوانیش بۆتۆ غەمبارن. چاوەڕێی تەنیا زەردە خەنەیەکی سەر لێوانتن، چونکە ئەزانن تۆ هاوڕێیانی، ئەزانن لەڕۆژانی سەرمادا تۆ داڵدەیانی‌و جێیان ناهێڵی، نایانەوێت ئاواکزۆڵە بکەیت... ئەوەتا بە دەنگە پڕ سۆزەکانیان بانگت دەکەن... کاڵێ دە ئیتر مەگری، ڕووبکەرە باڵندەکان‌و تۆ هاوڕێی ریشۆڵەو کۆترو بەفریت، باوکت فێری کردی باڵندەو بێ زمانت خۆش بوێ، دەی... دە هەڵسە سەرمایانە... خێرا ڕاکە باوەشیان بۆ بکەرەوە،... بیان هێنەرە بەر دەم ئاگردانەکە، دەی... تۆ لەوکاتەوەی باوکت فێری سۆزو خۆشەویستی کردی شەیدای جوانی ڕەنگی ڕەشی ریشۆڵەو ڕەنگی سپی بەفر بوویت،... دەی خێراکە دەرگاکە بکەرەوە ریشۆڵەکان چاوەڕێتن.. ئیتر باوکت نایەتەوە......



O



# گۆڕهەڵکەن

سەلاح عومەر

کابرا نامۆکە هەر کە گەیشتە ژێر قەدی تەپۆلکە گردەکە ئیدی لە توانای‌دا نەما هەنگاوی دی بنی‌و سەر بکەوێت .

پیرەمێردەکەش بە دوای ئەودا سەقام گیربوو . هەر دووکیان رووەو سەرەوە سەریان بەرز کردەوە . گۆڕەکەیان لێوە دیار نەبوو .

کابرای نامۆ هەر تەنها بە لەش شەکەت‌و ماندوو نەبوو . بەڵکو مێشك‌و دڵ‌و دەروونیشی لەو پەڕی ماندوو بووندا بوو . سەری لە نێوان جەمسەری بڕیاری سەرکەوتن‌و سەرنەکەوتندا ئەم بەرو ئەو بەری بوو .

•

برینێکی سارێژنەبووش بزمار ئاسا لە ناخی دەچەقی‌و گینگلی پێ دەدا . بە دیار گردەکەوە دۆشدا مابوو . هەتا پیرەمێردەکە چەند ووشەیەکی کاریگەری ئاراستە نەکرد ئەم لە شوێنی خۆی نەجوڵایەوە . پاشان بە پەنجەی شایەتمان ئیشارەتی بۆ سەرەوە بۆ کرد . پەنجەی پیرەمێردەکە بووە ئەو باریکە ڕێیەی لە ئاستی‌دا بەرەو سەرەوە هەنگاوی شل‌و خاو بنێت . نەیدەتوانی چۆن روو بە رووی گۆڕەکە بێتەوە . بۆیە دەم نادەم هەڵوێستەیەکی لە قەدی گردۆلکەکە دەکرد . هەندێ دەوەستاو ئاورێکی بۆ دواوە دەدایەوە . وەکو ئەوەی بیەوێ پیرەمێردەکە بانگ بکات تا بێت قۆڵی بگرێت‌و بەرەو سەرەوە رایبکێشێ . بەڵام پیرەمێردەکە تەنها بە سەر بۆ لەقاندن‌و هێما بۆ کردنەوە وەڵامی دەدایەوە .

ماوەیێکی چاکی پێ‌چوو تا کابرای نامۆ گەیشتە سەر تەپۆلکە گردەکە . لەوێ وەستاو لە دوورەوە بەرانبەر گۆڕەکە بەچۆك داهات . هەڵچوونێکی شێتانەش دەستی پێ هەڵبڕی‌و کەوتە لە خوا پارانەوە . سوجدەی بۆ خواو خاك‌و خۆڵی سەر گۆڕەکە برد . دەیویست لە ڕازو نهێنی ڕاستیەکی گەلێ گەورە بگات کە تا ئێستا کەس پەی پێنەبرد بوو. بە ڕووخساریش گلەیی لە هەر هەموو شتێکی ئەم دەشت‌و دۆڵ‌و گردۆلکەو پیرەمێردو قوتابخانەو مامۆستاکان دەکرد . نەیدەزانی چی بکات‌و چی بڵێت‌و چۆن هەڵس‌و کەوت بکات . هیچی پێ‌نەکرا جگە لەوەی چەند جارێ ئاور لە دواوە بداتەوەو لە پیرەمێردەکە بڕوانێ . لە دوایین تەماشاکردنی پیرەمێردەکە شتێکی نادیارو نا ئاسایی خوێندەوە. نەیزانی نەگلەیی کردنە نە سەرزەنشت کردنە . تۆ بڵێی بە کابرایێکی بێ بەزەیی‌و دڕندەو نامرۆڤانەی تێ‌بگات ؟ گوایە تازە دێتە سۆراغ‌کردنی ئەم گۆڕە بێ‌نازەو پاش بە سەر چوونی سێ مانیگش ئەوسا ئێرە بەسەر دەکاتەوە .

کە پیرەمێردەکەی وابینی نەیتوانی چیتر تەماشای بکات . بۆیە بە ناچاری چاوی بڕیە کێلەکان‌و نیگای لەسەر نووسراوی سەرکێلی لای سەری گۆڕەکە رووواند . بە حەپەساوی لێیان ووردبۆوە . وەکو ئەوەی لەوەتەی هەیە گۆڕوکێلی گۆڕی نەبینی بێ ئەوهایی نووسراوەکانی بە سە دەکردەوە .

بەڵام هێندەی کردی هیچ سەرو دەرێکی لیٚ دەرنەکردن . خوێندەوار بووایە بە تەواوی دڵنیا دەبوو ودەیزانی ئاخۆ نووسراوەکان ناووساڵی مردنو نە ،دایكبوونی کورەکەی ئەون یا نەء. بۆ دڵنیابوون ویستی پرسیار لە پیرەمێردەکە بکات . بەڵام گریانی قەتیس ماوی قورگی لەگەڵ ووشە بەندبووەکانی سەر زمانی تێکەڵ بە یەك بوونو نەیانهێشت هیچ بڵیٚ .

ناچار سەری لار بووەوەو نا ئومێد ڕوانییە کۆمەڵە خۆڵە هەڵدراوەکەی نێوان هەر دوو کێلەکان . پیرەمێردەکە کەوای بینی یەکسەر لیٚی چووە پێش . بە هێمنیش دەستی خستە بن باڵی . ڕاستی کردەوە هێمنتریش

بەرەو گۆڕەکە ڕایکێشا کابرای نامۆ هێشتا چەند هەنگاوێکی مابوو بگاتە سەر گۆڕەکە دەماو دەم کەوتە سەر یەکیٚ لە کێلەکان . لارروومەتێکی زامدار بوو . بیٚ ئەوەی بە سەر خۆی بێنیٚ یەکسەر لە تەنیشتیەوە لیٚ پاڵکەوت . جا زامدار بوونی. تەنها لارروومەتێکی کەی دەگاتە ئاستی ئازاری دەروونی . هەتا ئازاری پێوەبینی متەق ئەکرد . چونکە ئازاری کارەساتی بزربوونو بیٚسەرو سۆراغ چوونی کوڕەکەی گەلیٚ کاریگەر تر بوو لە زامداربوونی هەر هەموو ئەندامەکانی لەشی . پیرەمێردەکە بە پێویستی نەزانی هەمدیسان کابرا هەڵگرێتەوە . وازی لیٚهێنا تا بە تەواوی کفتی دادەمرکێتەوە . لە دڵی خوێدا گووتی : با تێر کێڵو گۆڕو خاکی نێوانیان لە ئامێز بگرێت . با تێر تێریش ماچیان بکات . بەڵکو ئیهی ئەمە خوایە هەندیٚ دێتەوە سەر خۆیو کارەکە بە بارو دۆخێکی دیدا دەسوڕیٚ . کابرای نامۆ ئاگای لیٚنەبوو کەوا هێدی هێدی خوێنی لا رووومەتە بریندار بووەکەی دا دەچۆڕێتە سەر خاكو خۆڵی گۆڕەکەو تێکەڵ بە مەرگەساتی تەرمەکەی ژێرەوە دەبیٚ .

گۆڕەکەی نیشانی نامۆکەیانداِ هەر بە ناو گۆڕ بوو . چونکە لە کێلە ناریکەکانی بترازیٚ دەنا هیچی دی لە گۆڕی ئاسایی نەدەچوو : سەر ئەم تەپۆلکە گردەش نە گۆڕستانو نە جیٚی ناشتنی تەرمو ئادەمیزاد ناشتن بوو . مەگەر کەسێکی ئاوارەو سەرگەردان وا بەم شێوەیە بگرێتە باوەش .

جاران سەر ئەم تەپۆلکە گردە تەنهاو چۆڵە لە بەردی ڕەقو درکو داڵ پتر هیچی تری بە سەرەوە نەبینراو هیچ کەسێکیش بە سەریدا ڕانەبوورد . بەڵام وا ئیمرۆ دوو زەلام بە سەریەوە وێڵنو بە دوای شتێکدا دەگەڕێن . دەیانەویٚ شتیٚ بدۆزنەوە . تۆ بڵیٚی بیدۆزنەوە !

پیرەمێردیٚ وەکو ڕیٚنیشاندەرو ئەوی تریش خاوەنی تەرمێکی بزربووی سیٚ مانگ لەمەوبەر .

پیرەمێردەکە دوور وەستاوەو بە حەپەساوی چاوەڕێی کۆتایی هاتنی ئەم دیمەنە جەرگ بڕەی نامۆکەو گۆڕەکە خولقاندویانە دەکات .

کابرای نامۆ لاتەریب لاشەی سستو ماندووی لە گۆڕەکە نزیك دەخاتەوە دەیەویٚ قەدو باڵای سەرتاپە لە خۆڵە هەڵدراوەکە هەڵسویٚو لە گەڵیا بێتە یەك . لا تەریب درێژ دەبیٚ . وەکو ئەمیش بیەویٚ ئالەم ساتە پڕ مەینەتیەدا نامۆیانە تەرمە نێژراوەکە ئاسا دواساتی ژیانی بکاتە قوربانی مەبەستێکی پیرۆز ئەوهایی دێتە بەرچاو بیٚدەنگ ڕاکشاوە . نایەویٚ ڕاست بێتەوە .

خەمێکی خەست بەر دڵی پیرەمێردەکە دەگریٚ . ئەمیش لە ئاست ئەم شانۆگەرییە تاسابوو . نەیدەزانی چی بکات . گریانیش لە ساتێکی وادا دەستە وەستان دەوەستی . خەریك بوو باوەڕ نەکات ئەمە گۆڕی ئاساییەو زەلامەکەش کابرایێکی ئاسایی . لەبەر چاوی گۆڕە شەق بوو دەرزی برد . تەرمە نێژراوەکە هاتە دەرەوە . بە جلێکی سپی یەوە .لە گۆڕەکە هاتە دەرەوە بە سەر خۆڵە هەڵدراوەکە بازیدا . هات بە دیار نامۆکەوە دانیشت . سەری خوار کردەوە . دەمی لە نیو چەوانی نزیك خستەوە . ماچی کرد . کەوتە قسە . نامۆکەی دواند . ئەوسا لە تەنیشتیەوە درێژ بوو . بە جووتە پاڵکەوتن . ئەمە وای لیٚکرد . ئەمیش بچێت لە پاڵ ئەوان درێژ بێت . بەڵام بە دیوەکەی دیدا سوڕایەوە .

بۆ ئەوەی پێکەوە . دەم بە گویٚی خاکدا بنێنو لە ڕازو نهێنی مردن و ئەم گەردونە بگەن کابرای نامۆ بیٚئاگا بوو . ئەم دیمەنە تەنها لەبەر چاوی پیرەمێردەکەدا تیٚدەپەڕیٚ . پیرەمێردەکەش کە گەیشتە سەر گۆڕەکەو لیٚ پاڵکەوت . هیچ شتێکی لە مانەی چەند ساتیٚ لە بەرچاوی بوون نەبینی . نەیزانی نە خەونەو نە خەیاڵ .

شتیٚبوو هاتو ڕۆیی . ویستی لە نامۆ بگەیینیٚو پرسیاری لیٚ بکات ئاخۆ ئەم مرۆڤە جل سپی یەی کە تازە لەبەر دیدەی دەجوڵایەوە کوڕی ئەمە یانەء؟ بەڵام خۆ نامۆکە تەرمەکەی نەبینی تا بڕیاری ئەوە بدات ئاخۆ کوڕەکەی ئەوە یانەء ؟ پەشیمان بۆوەو ئەمیش بیٚدەنگ بوو .

ڕاستە ناوی مردوو ساڵی لە دایك بوونو ساڵی مردن لە سەر کێلی گۆڕەکان دەنووسرێن . بەڵام کیٚ دەڵیٚ ئەمە هەر هەمان ئەو کەسەیە کەکابرای نامۆ بە دویدا دەگەڕیٚ ، چونکە هەتا ئیستاش هیچ شتیٚ نیشانەی سەدا سەدی ئەوە نادات کە ئەمە کوڕی نامۆکەیەو سیٚ مانگ بەر لە ئێستا بیٚ سەرو شوێن بزربووەو لێرە نێژراوە هیچ هێزێکیش نییە مردوو زیندوکاتەوە ، تا بە جاریٚ مەسەلەکە ببڕێتەوەو کابرا بە دڵ شکاوی ڕیٚو ڕیٚ نەگەڕێتەوە . ئەگەر چی مامۆستاکانیش هەر هەمان قسەی قادری

هاوڕێی شێرزادیان دووبارە کردەوە کە ئەمە فلانی کوڕی فلانە . لە
نووکەوەش بۆیان گێڕایەوە کارەساتەکە چۆن روویدا .
ئەوەتا ئەم پیرە مێردەشیان بە گەڵداوە . بەڵام ئەم هێشتا هەر باوەڕ
ناکات .

هەتا جلوبەرگ وسعاتو جزمەکەشیان نا بەمستی . ئەم نەیدەویست
بێتەوە بەڵام یەکێ لە مامۆستاکان خستیە سەر ئەورایەی بردنەوەی
دەبێتە دەرمانی ساڕێژبوونی برینی دڵی دایکی . ئەویش شتومەکەکانی
خستە ناو تورەگەیەکو نایە کۆڵ .
– گۆڕەکە هەڵدەکەنمو هەرچییەکی تێدا مابێ دەیبەمەوە .
– چی . چی دەکەی ، گۆڕ هەڵکەندنی چی؟ هیچی لێ نەماوە . ئێستا
هەر بە جارێ بۆتە خاك و خۆڵ . گوناحیشە ، گۆڕ هەڵکەندن گوناحە .
– ئەگەر ئێسقانیشی لێ مابێ دەیخەمە ناو ئەم تورەگەیەو دەیبەمەوە . لەوێ
گۆڕێکی رێك پێکی بۆ هەڵدەگرم ، لەبەر چاومان بێ باشترە ، بۆ ئەوەی
هەموو رۆژێ سەری لێبدەینو ئاگامان لێ بێ . پاشان دایکی دەحەسێتەوە
.– من لێرە ئاگام لێ بەتی . وەکو گۆڕی کوڕی خۆم بێ ، ئەوها سەری
لێ دەدەم. زۆر رێكو پێکیش هەڵیدەگرم ، ئێوەش بە پێی توانا وەرنە
سەردانی .

پیرەمێردەکە هێندەی کردی نەیتوانی گۆڕ هەڵکەنە نامۆکە پەشیمان
کاتەوە . چونکە ئەمە بریاری ئێستای کابرای نامۆ نەبوو بەڵکو بریارێ بوو لە
مێژەوە پێش ئەوەی أ بگاتە ئێرە دابووی هەر کە گۆڕەکە بدۆزێتەوە یەکسەر
هەڵیکۆڵێو ئەگەر ئێسقانیشی بیاتەوە هەر بیباتەوە . بیجگە لەمەش ئیە ،
بەڵکو ئەمە خواشە تەرمەکەی هیچی لێ نەهاتبێ ، یا هیچ نەبێ ئەندامێکی
مابێ . یا نیشانەیێ ، ببێتە هۆی ناسینەوەی .

گۆڕ هەڵکەنەکە خۆی تائێستا تەرم شۆرو گۆڕهەڵکەنبوو وخەڵکی
دەناشت ، کەچی ئەوەتا ئیمرۆ کار بە پێچەوانەیە ، دەبێ ئەمجارە
خاکەنازێ بگرێتە دەستو خاكو خۆڵ هەڵبداتەوە ، تا تەرمێکی ئازیز لە
ناو چاڵێکی تەنگو تاریك دەربهێنێ . راستە حەزی دەکرد یەکێ بێت
پێی بڵێ : ئەمە گۆڕی کورەکەی تۆ نیەو وازی لێ بێنە .

بەڵام نەیدەویست لە هەڵکۆڵینی پەشیمانی کەنەوە . ئێ ئاخر دڵنیا
نەبێت چۆن وا بە دەست بە تاڵی ، رێو رێ بگەرێتەوە جاران بروای بە
بچووکترین قسە دەربارەی مانی کورەکەی هەبوو . زۆری حەز دەکرد بڵێن
کورەکەت ماوە .

منداڵێ بیگووتیا شێرزاد ماوە دەکەوتە هەلکە سەما . جادوکەرو ئەمو
ئەو نەما سەری پێ نەکا . هەموو هەر دەیانگووت شێرزاد ماوە . زۆریشی
باوەڕ بە خەوینەرەکە هەبوو . لە هەمووان پتر ئاسودەیی بە دڵو دەروونی
دەبەخشی . کە نازەنینی کچەزاشی خەواند هەر بە جارێ کەوتە سەر ئەو
باوەرەی کە شێرزاد نەمردووە ماوەو دەگەرێتەوە .

نازەنین هەر وەکو بە راستی خاڵوی بەزیندوبەتی ببینێو بەرانبەری
وەستابێ قسەی لەگەڵ دەکرد . کابرا بەرانبەر ئاوێنەیێك نازەنینی نواند .
هێندەشی پێ نەچوو بە چەند قسەیێکی سەیر ، بە قسەی هیناو گوتی :
خاڵۆ ئەوە لەکوێی . بۆ ناگەرێیتە وە ؟ دەوەرەوە ، وائێمە چاوەرێی
هاتنەوەتین . پاشان پاش ئەوەی نازەنین بە خەبەر هات گووتی : قسەم
لەگەڵ خاڵۆکرد ، بەڵام لە شارێکی زۆر دوور بوو ، ئەمزانی کوێیە .
شارێکی زۆر خۆش بوو ، دەوران دەوریشی بە چیای سەرکەش دەور .
درابو خاڵۆ سەفەرێ دەکرد ، لێم پرسی کەی دەگەرێیەوە ؟ گووتی :
جارێ نا ، ماوەیەکی دی ، کە ئیشەکانم تەواو بوون ، یەکسەر
دەگەرێمەوە ، جارێ چاوەرێم مەبن .

بە قسەی کابرای خوێنەر بووایە دەبووایە ئێستا لە مێژ بوو شێرزاد
بگەرێتەوە . کەچی ئەوەتا ، ئەوا سێ مانگە نەسەری هەیە و نەسۆراغ .
باوەری بەقسەی قادری هاورێی شێرزاد نەبوو . یانەیدەویست باوەر
بکات . ئەم باشتر ئاگای لە مەسەلەکە بوو ، بەراستیش هەموو شتێکی بۆ
درکاندن . بەڵام ئەوا خەریکە ئێستا هەر هەموو شتێکی قادر گوتبووی
بەراست بزانێ .

. پیرەمێردەکە دەیزانی خۆشی بێو ترشی بێ نامۆکە هەر گۆڕەکە
هەڵدەکەنێو هەرچییەکی لە تەرمەکە مابێ دەیداتە شانو دەگەرێتەوە بۆیە
هەستایەوە ، بە پەلە بەرەو قوتابخانەکە کەوتە رێ . هێندەی پێ نەچوو
هاتەوە . خاکە نازێکی لەبەردەم کابرای نامۆدانا . لەجاران هێمن تریش
راستی کردەوە ، بەچەند ووشەیەکیش وای لێکرد ، تازووە دەست
بەکاربێ .

کات بەرە بەری عەسرێکی درەنگ بوو کابرای نامۆ کەوتە خاکەناز
وەشاندن بۆ ئەوەی دوا مەبەست لەم ژیانەی بگەیێنێتە ئەنجام . دوا مچو
دوا ئامێزیش بکاتە ئاوێزانی چەند پەلە ئێسقانێکی رووتو کەللە سەرێکی
بۆشو بەتاڵیش بنێتە کۆڵ .



چیرۆك بۆ نەو جوانان



# تانجی‌یە بۆرەی حەماغا

○

جەزا عەلی ئەمین

○

نەنە ئامە بۆ ئێمەی منداڵ تامێکی تایبەتی هەبوو . هەر رۆژە نا رۆژێ لە سەر تەندووری ماڵی خۆیان کۆی دەکردینەوە . تا چیرۆکمان بۆ بگێڕێتەوە .. حەزمان دەکرد قسە شیرینەکانی قەت تەواو نەبن . ئەویش هەندێ جار بۆی دەکردین بە چەند ئەڵقەیەك و یەك لە دوای یەك بۆی دەگێڕاینەوە .. لە دێیە بووین گەورەو بچووك خۆشیان دەویست . پیرێژنێکی سوورو سپی پاكو تەمیز . پرچەکەی هەموو دەمێ دەتوت بەفری لێ باریوەو نایتە کێنێ . چاوی شین چەناگەی چاڵ جارو بارە کە گەرمای بوایە دڵۆپە ئارەقەی تێدا دەوەستا . رەنگ‌و رووی نەنەمان لە بیر ناچێ .. منداڵینە ! خۆزگە ئێوەش لە هەموو کۆڵانێکی شاری نەنە ئامەیەکی واتان ببوایە . بۆ خۆتان لە خۆشی‌دا خەنی دەبوون‌و تەلەفزیۆن و رادیۆتان لە بیر دەچۆوە !

هەر کە سەرو بەندی چیرۆك گێڕانەوە دەهات دەتوت موومان بۆ هەڵکرووزاوە هەر یەکە لەم لاو لەو لایەوە قوت دەبووینەوە .. دەم‌و پلی خۆمان نەدەجووڵاند مەگەر پرسیارێکی بە جێمان هەبووایە . گوێمان رادەگرت .. چاومان دەگرتە نەنە !

– منداڵینە تەواون ؟ کێ ماوە . کێ نەماوە ؟

منیش بە دەم پێکەنینێکی شەر ماوی‌یەوە سەرم هەڵ دەبری :

نەنە گیان هەموو ماوین !

نەنە بە دوو پەنجە قژی هاویشتە پشت گوێی . چوار مشقی دانیشت .. ئێمە حەزمان دەکرد بچینە دەمی یەوە .

یان لە دوورەوە دەم‌و پلی بخۆین :

ئیمڕۆ نۆرەی تانجی‌یە بۆرەی حەماغایە !

هەموومان بە دەم بزەو نەرمە پێکەنینەوە روانیمانە نە نە .. نەنە وای رانەهێنابووین بیکەینە قریوە قریوو کەس گوێی لەوی کە نەبێ . پێی سەیر بوو هەموو بە ناوی چیرۆکەکە گوێ قولاغ بووین‌و زەردەخەنەمان هاتێ . بۆیەکا تەماشای جل‌و بەرگەکەی کرد (کراسەکەی کودەری‌یەکی گوڵ وردی تەخت مۆر بوو ..) دەستێکی هێنا بەدەم‌و چاوی‌دا . ئینجا وتی :

– ئەوە چۆنەکایی‌یە هەمووتان پێ دەکەنن ؟

کاڵێ بە دەم‌و لێوێکی بزە گرتووەوە هەڵی دایە :

– نەنە گیان ناوەکەی سەیرە .

سوارە لای منەوە دانیشتبوو . بە ئەسپایی دەمی جووڵاند هەر ئەوەندەی لێ تێ گەیشتم نەنەئەوە :

یەکەم جارە چیرۆکی تانجیمان بۆ دەگێڕێتەوە . تانجی بێ‌و بۆربێ‌و هی حەماغا بێ لە وانەیە شتێکی خۆش بێ .

کەمال وتی :

ئەوە تانجی‌یەکەی کاکم نەبێ بۆتە حەکایەت ! ؟

نەنە سەری هەڵ بری :

لەوانەیە چیرۆکی ئیمرۆمان لە باتی پێکەنین توورە بوونی پێ بێ ! ئێوە

ئێستا گوێ بگرن بزانن چی روو دەدا ..

ئێمەش بە وردو خوردی گوێمان بۆ دەگرت چونکە دوایی لێی دەپرسینەوە . کێ لە هەموومان پێشتر چیرۆکەکەی بگێرایەتەوە . یان وەڵامی پرسیارەکانی نەنەی بە تەواوی بدایەتەوە چنگێ مێوژو گوێزی دەدایە .. ئێوە مێوژو گوێزی ئەوتان نەخواردووە دەنا بیرتان نەدەچۆوە . مێوژە سوورکەی نەرمو بێ قنچك ، کاکڵە گوێزی سپیو خر دەرهاتوو .. ئای لەو مێوژو گوێزە ئێستاش تامەکەی لە ژێر ددانمدایە !

نەنە وتی :

حەماغا تانجی یە بۆرەی بەرادەیەك خۆش دەویست نەبێتەوە .. بە تایبەتی ئەو جارانەی کەروێشکی قەڵەوی بۆ دەگرت . لە راودا کاتێ بە دوای کەروێشکەوە بوونایە سەد جار بە قوربانی تانجی یە بۆرەببووایە جارێ بوو . تانجی خواردنی جودا بوو . تانجیو حەماغا بە خواردنی باش راهاتبوون هەموو نانێکیان بۆ نەدەخورا .

ئاغا زۆر جار بە ئاغا ژنی وتبوو :

- ئافرەت تانجی یە بۆرە تانجی نی یە غەزەبی خوایە ! هەر ئەوەتا کەروێشکی دی تا نەیگرێ کۆڵی لێ نادا

گۆشتی کەروێشکم نەبێ ناژێم با بیشم وابو ! دەزانی کاتێ بە سواری ئەسپە کوێت دوای کەروێشك دەکەوین ها لێرەها

لەوێ کاتێ تانجی کەروێشك لە خۆڵ وەردەدا . ئەو کاتانە شا بە سەپانی خۆم دەزانم ئاغاژن هەر ئاگات لە تانجی یە بۆرە بێو زیادە پارووی چەورو نەرمی بدەیەو غافڵی مەکە. ئاغاژنیش سەری بۆ ئاغا دەلەقاند:

- خوانەتگرێ ئاغا بۆ قسەت!

حەماغا هەموو باسو خواسێکی ناو ماڵو دیوەخانی هەر باسی تانجی یە بۆرە بوو.. ئاغاژنو پیاوانی دەستو پێوەند وایان لێ هاتبوو هەرکە ئاغایان بدیایە تانجی یە بۆرەیان دەهاتەوە بیر !

تانجی یەکی سپیو پەڵ رەش چاو زیتو گوێقوت ، لۆق دیرێژ ددان تیژ. ئاغا زۆر بە دەوری دەهات، جلی زوو زوو لێ دەگۆری زەنگۆڵەی جوانی بە ملەوە هەڵدەواسی ، بۆ راو لە ملی دەکردەوە.. ئێواران بە فێنکی بە یەکەوە پیاسەیان دەکرد.. ئاغاژن،ئاغاو تانجی لێ تێکەڵاو دەبوون ! ئەوە بە تایبەتی دوای ئەو خەوەی ئاغا دیبووی «خوا بە راستی بگێری» ئاغا بوو بوو بە تانجی یە بۆرەو..تانجیم تانجی بوو حەماغای دەبرد بۆ راوێ ، دەیرەتاند . بە ناو درك و داڵدا بە دوای کەروێشك دەکەوت بۆی نەدەگیرا گەدو گیپاڵی رێی راکردنیان لێ بریبوو. هەناسەی سوار دەبوو.. جنێوی دەخوارد . لە باتی پاروە نانی چاك ئێسقانی بۆ فرێ دەدا، ددانەکانی بە دوا یەکدا هەڵ دەوەرین . ئاوێنەیەکی لە بەردەمی ئاغادا دا دەنا . لمۆزی هەڵ دەدایەوە تانجیان بە دەمو ددانی خۆی پێ دەکەنی .

منداڵینە ! لەو ساوە ئاغا ئەو چیرۆکەی بۆ ئاغاژنێ گێراوەتەوە ئاغاژن ناو بەناو ناوی ئاغا لە تانجی یە بۆرە دەنێ .

ئەو جارانەی ئاغا کەروێشکی بگرتایە ، کاتێ بەرەو ماڵ دەبۆوە دەیکرد بە دەنگە دەنگو هاتو هاوار . بەڵام کە کەروێشکی پێ نەبووایە لەگەڵ تانجی یە بۆرە وەك بە فیتی یەك بزانن بە دزی یەوە دەگەرانەوە بۆ دێو خۆیان دەکرد بە کەلاوەو دیوەخاندا !

ساڵ هاتو ساڵ رۆیی . تانجی یە بۆزە راوی جارانی نەما .. کەروێشکی بۆ نەدەگیرا . تەنانەت کەروێشکیوا هەبوو گاڵتەی پێدەکرد وەك بڵێی دەیزانی پیر بووەو قاچو قولی راوی نەماوە .

کەماڵ وتی :

- نەنە گیان ئاغا کەڵکی راوی پێوە مابوو ؟

نەنە وەڵامی دایەوە :

- چاوی نەنەی تانجی یە بۆرە لە پێش ئاغاوە پیر بوو .. ئاغا چەند تانجی یەك پیر دەکا ئینجا بۆ خۆی پەکی دەکەوێو دەمرێ .

منداڵینە !

ئاغا هەر لە تانجی یە بۆرە دوو تاژی بچووکی هەبوو ناو بە ناو ئەوانیشی لەگەڵ تانجی یە بۆرەدا دەبرد بۆ روا . تا ئەوانیش فێربن . چۆن گوێ لە ئاغا دەگرن . کەی پەلاماری کەروێشك دەدەن . لە پێشدا گوێی دەگرن . تانجی یە وردەکان هێشتا تانجی یە بۆرە راوی پێدەکرا فێری کەروێشك گرتن بوون.. ئاغا وەك جاران بە دەوری تانجی یە بۆرەدا نەدەهات خۆشەویستی تانجی یە بۆرەی دابوو بە تانجی یە وردەکان .. هەر خەریکی دەستەمۆکردنی ئەوان بوو .. دوای ئەوەی تانجی یە وردەکان دەمیان بە کەروێشك گرتن راهات ئاغا هەر بە تەواوی تانجی یە بۆرەی لە بیر چۆوە . ئاغاژنیش زیادە پارووی تانجی یە بۆرەی دەدا بە تانجی یە وردەکان !

نازە وتی :

- نەنە گیان تانجی یە بۆرە مرد ؟

- نا . نازە چاو جوان .. بەڵام خواردن و کردنی جارانی نەما .. لە کەلاوەیەکدا دەژیا رۆژیوا هەبوو ئاغا بیری دەچوو ئاوی بۆ بەرێ . یان پارچە کولێرەیەکی خووساوی بداتێ تا نیوە شەو سکی هەڵ دەگوشیو بە دەم برسێتیو تینوێتی یەوە خەوی لێ دەکەوتو هەزار جار مەرگی خۆی بە ئاوات دەخواست .

رۆژێ تانجی یە بۆرە بیری لەو کەروێشکانە دەکردەوە کە بۆ ئاغای

گرتبوون ، ئاغاژن بە سوورەوە کراوی لە سەر دەوری‌یە قبوڵی بۆی دادەنا . ئاغاش بەدەم مشە مشەوە دەیخواردن .. کەروێشکی بۆر ، رەش ، خاڵدار ، شینباو ..

گوتم نەنە :

تانجی‌یە وردەکان هەواڵی بابیان نەدەپرسی ؟

نەنە وتی :

– با ، رۆژێ چوونە لای ، تانجی‌یە بۆرە پیی‌وتن :

لەبەر ئەوەی راوم پی‌ناکرێ ، لێرە کەوتووم ، بەڵام تا قاچی راوم هەبوو ، کەروێشکم دەگرت خۆشەویست بووم ئاغا دەیبردم بۆ پیاسە.. ئاغاژن خواردنی تایبەتی دەدامێ ئیستاش وەك دەمبینن مێشم تێ وروکاوە .. کەس بە لامدا نایە .. ئێوەش هەروا ددانتان تیژو قاچتان درێژ نابێ وەك منتان لێ دێ.. ئەو جێگا خۆشەی ئیستاتان لێ دەستێننەوە .. پارووتان لی‌کەم دەکەنەوە .. ئەوسا رەنگە حەماغا وەك ئیمرۆی من پیرێ ، بەڵام منداڵە هارو هاجەکانی پیی دەگەن .. لەوانەیە بڵێن بابمان تێك‌چووە .. بروام پی‌نەکەن .. بەڵام دوا رۆژ لە هەموو شتێك تێ دەگەن ..

تانجی‌یە وردەکان لە دڵی خۆیاندا دەیان وت :

– تۆ بڵێی ئاغا بۆ ئێمەش وابێ ؟ خۆ چاکمان لە بیرە کاتێ لەگەڵی دەچووین بۆ راو ئاغا چۆن چۆنی بە قوربانی دەبوو .. بەڵام ئیمرۆ چی ؟

منداڵە خۆشەویستەکان !

ئەو دوو تانجی‌یەش پیربوونو چوونە ئەو شوێنەی کە بابی‌یانی لی‌کەوتبوو ، لی‌مردبوو !

ئەوانیش تانجی دیکەیان لی‌کەوتبۆوە ، لەناوچەکەدا ناوبانگیان هەبوو .. ئەوانیش پیری‌یان بە چاوی خۆیان دی .. نان کەمی‌و بێ ئاوی شارەزا بوون ئینجا بروایان بەتانجی‌یەبۆرەکرد .. ئەوانیش ئەو چیرۆکەی تانجی‌یە بۆرەیان بۆ کورەکانی خۆیان گێرایەوە .

نازە گوتی :

– نەنە گیان دەبێ کەی نەوەکانی تانجی‌یە بۆرە بەقسەی تانجی‌یە بۆرەی باپیرەیان بکەن ؟

نەنە ئامە ئاهێکی هەڵ کێشا :

– منیش چاوەڕێی پرسیارێکی ئاواهی بووم .. رۆژێکی دیکە چیرۆکەکە تەواو دەکەین .



# خانـــووەکە

نووسینی : گۆفری نات موهانتی

وەرگێرانی لە ئینگلیزیەوە : انور محمد قە

(سەدەسیڤا) بە خۆی‌و. خێزانەکەی‌و. کەلوپەلە کانیانەوە لەو شەمەندەفەرە دابەزین کە لە باکوورەوە هاتبو.

لە ئیشەکەیدا بۆ (کەتاك) گوێزرابۆوە. هەرکە گەیشتنە بەشی دەرەوەی شۆستەی ئێستگەکە. (مەندەکرانتا)ی کچی لێی پرسی:

– بابە خانوە تازەکەمان لە کوێیە؟

(سەردولا) کە دو ساڵ منالتر بو لە (مەندەکرانتا)ی خوشکی لە خۆشی خانوی تازە خۆی پێ نەئەگیراو. کەوتبوە قیژاندن:

– خانوی خۆمان. خانوی خۆمان!

لە خۆشی‌یا سەمای ئەکردو. (ئەنوستوپ)ی چکولەو (گەیاتری)ش چوونە پاڵ کۆرسەکەوەو. کەوتنە قاوو قیژو پێکەنین‌و. لە کاتێکا شۆستەکەیان بەجێ ئەهێشت (دەمەیانتی) لەمێردەکەی پرسی:

– ئایا (شەربەکە لە فارگۆنەکەدا مایەوە؟

(سەدەسیڤا) وەڵامی ژنەکەی دایەوەو. ووتی:

نەء هێنام. با بڕۆین.

ئەنجا بە منداڵەکانی ووت:

ئەوەندە مەقیژێنن.

خەڵك چاویان بڕی بوە منداڵەکانی‌و. ئەوەش نائاسایی نەبو. چونکە کەلوپەلەکانیان قورس بو. عەرەبانچیەکان یەکە یەکە بەرەو پیری ئەهاتن‌و. ئەیان ویست ڕێکەوێ لەگەڵیاندا. جارێکی دیکە (مەندەکرەنتا) کەوتەوە پرسیار:

بابە. خانووەکەمان لێرەوە چەند دوورە؟

(سەدەسیڤا) وەڵامی نەدایەوە. لە پێشا کەلوپەلەکەی ڕەوانە کردو. ئەنجا عەرەبانەیێکی دیکەی گرت بۆ خێزانەکەی. لە ناو عەرەبانەکەدا تەماشاییکی ژنەکەی کرد. سکی هەبوو. بە نیانی‌یەکەوە لێی‌پرسی:

- چۆنیت!

ئەویش بە کورتی وەڵامی دایەوەو ووتی:

- باشم

ئەنجا باوکە ئامۆژگاری منداڵەکانی کردو، ووتی:

- دیکەن بێزار مەکەن.

(سەردولا) کەوتەوە قیژاندن

- خانو. خانوەکەی خۆمان. خانو

ئیتر هەمو منداڵەکان بوونەوە بە کۆرس و. ئەیان قیژان:

- خانوەکەمان. خانوەکەمان. خانوەکەی خۆمان.

(دەمەیانتی) کە بەرامبەر (سەدەسیڤا) دانیشتبو. زەردەخەنەیێکی بۆ مێردەکەی کردو. ئەویش سەرێکی بۆ لەقاند.

(سەدەسیڤا) پاش دوانزە ساڵ خزمەت. گۆیزرابۆوە بۆ (کەتاك)و. هەرچەندە خۆی جارجار سەری (کەتاك)ی دابۆوە. بەڵام ئەمە یەکەمین کەرەت بو لەگەڵ ژن و. منداڵەکانیا بێن بۆ ئێرە. خۆی شارەزای شارەکە بو. چونکە لە دێیەك لە دایك بو بوو. کە لەبەری ئەوبەری روبارە کەوەبوو. هەرهەشت میلێك لە (کەتاك)ەوە دوور بو. لە خەیاڵیا بە خۆی ئەووت. ئەبێ ئێستا زۆربەی رووەك لە پێگەیشتندا بن لە ئاوایی کۆنی بووبەپیرانی و. یەکسەر بیری بۆ چڵە سەوزە درکاوی‌یەکانی کوولەکە رویشت.

ریزە بینا هەردو لای رێگاکەیان پڕکرد بۆوەو. قاڵب و. کۆمەڵە لم و. نۆری پڕ خشت و شیشی ئاسن زوو زوو ئەبینران و. تێدەپەرین. کەس گوێی نەئەدایە. گەر لۆرێك پیاوێکی بکردایە بە ژێرەوە. خۆ ئەو هەر ئەمرد زوو یان درەنگ و. بەو هۆیە بوایە یان هەر هۆیەکی دیکەو بەوەش تەگەرە لە پێشکەوتن ناکەوێت. شارەکە ئیجگار ئوتومبیلی زۆری تیابو.

ئوتومبیلی خواپێاوان. (کەتەك) شارێکی بەکاراو. سەرکەوتوو. قەڵەبالغ بوو. پڕ بو لە خەڵکی هەمە چەشنە. (سەدەسیڤا) (کەتەك)ی لە پێش دوانزە ساڵدا بەجێ هێشتبو. ناوچە بە ناوچەی (ئۆریسا) گەرابو. (مەندەکرانتا)ی کچی لە (بەڵەسۆر) هاتبوە دنیاوەو. (سەردولا)ی لە (کورەپۆت)و. (گەیاتری) لە (روسیلکوندە)و. ئەو منداڵەش کە هێشتا

روناکی دنیای نەدی بوو. لە قوژبنێکی دووری بەشی (مەندەو نەچا) خولقابو. ئەبێ لە (کەتەك) بێتە دنیاوە. بەڵام لەکوێ؟ (سەدەسیڤا) بە ژنەکەی ووت:

ئەم شارە بۆ دەوڵەمەندانەو. جێگای ئێمەی تیادا نابێتەوەو! ژنەکەشی دڵخوش دایەوەو. ووتی:

یەجگار واش نا ئەویش بە دڵتەنگی‌یەکی بیرڕۆیشتوەوە لە ژنەکەی پرسی:

تۆ ئەزانی کێشەکە چی‌یە؟ •

هەرخۆشی وەرامی خۆی دایەوە:

- چونکە ئەوانەی ئەبێ لە کاتێکی تایبەتیا بمرن نامرن!

ئیتر ژنەکەی لێی پرسی:

- کەوابێ سوودی خەمخواردن و. بیرکردنەوە چی‌یە؟ و. هەر خۆی کەوتەوە دڵخوشی دانەوەی مێردەکەی و. ووتی:

- ئێستا بێت یان کاتێکی دیکە. خانویەکمان هەر چنگ ئەکەوێ مێردەش دانەکانی جیپر کردبۆوەو. لەبەرخۆیەوە ووتی:

- هەر دەستمان ئەکەوێ. بەڵام بەم زووانە نابێت. ئیتر هەناسەیێکی پڕ کینەو. نائومێدی هەڵکێشاو. بە توورەیی‌یەوە. تەماشایێکی رێگا خۆڵاوی‌یەکەی بەردەمی کردەوە.

هەمو شوێنێك هەر ئوتومبێل بو. یەك یەکی راو ئەنا. ئەمان بۆ ماڵی (راتنەکار) ئەچوون. (راتنەکار) هاوری‌یەکی منداڵی (سەدەسیڤا) بو. کە ئێستا لە بازاری پاش جەنگدا خەریکی کرین و. فرۆشتنی ئاسن و. پۆڵا بو.

(راتنەکار) لە خانوویەکی بچکۆلانەی سەربەدارگیراودا بوو. جگە لە ژورەکەی سەر داڵانەکە. هەموو بەشێکی تەسك و. تروسك. بوو. لە وێشا جێگای نوستنەکانیان بەیەکەوە نووسێنرابون و هەندێ لە کەلەپەلەکانیان بە قوولاپ بە بنمیچەکەوە هەڵواسرابون و. ئەو نەختە شوێنەی مابۆوە بوبوو بە جێگای ژیان و. هەڵسان و دانیشتنیان. (راتنەکار) پێنج منداڵی هەبو. هەموشیان لە تەمەنی قوتابخانەدا بون. خۆی و. ژنەکەی و. منداڵەکانی و. نوکەرەکانی. هەموویان ئا لەم خانوە بچکولانەیەدا ئەژیان و. جگە لە خۆشیان. سەگەکەو پشیلەکەو.

مانگاکانو. مشکەکانیش جێگای خۆیان تیاداکردبۆوە. ئەنجا ئا لەو باری ژیانەدا کە (راتنەکار)ی تیا بو بایەخی سەرسوور هەڵهێنەر بوو کە ئامادەبێ خۆی دەربڕیبو پیشوازی لە (سەدەسیڤا)ی هاورێی بکات. بەڵام زۆر شت روو ئەدەن لە ژیاندا کە بە تەمای روودانیان نەبوویت. وەکو شتی ناڕاستەقینە، یان میهرەبانی‌یەك بە تەمای نەبوویت، یان کێشەو سەختی‌یەکی ناوەختی، یان کارێکی لە ناکاو رووداو. ئەمانە گشتیان بە شێکن لە ژیانو، هەرچی چۆنیك بن. (سەدەسیڤا) بڕوای پێیان هەبوو. ئەی ووت، (ئەبێ ژیان کەڵکی چی‌بێت گەر باوەڕمان بە روودانی نەزانراودا نەمێنێ، خۆش بەو باری خەمباری یەییەوەو. ئەو چکە مووچەیە هەرچۆنێکی لێك ئەدایەوە ئەنجامەکەی هەر برسێتی‌و قەرزاری‌و. بێ دەستی بوو، ژیانی لەگەڵ تراجیدیاییکی یۆنانی بەراوورد ئەکرد.

(راتنەکار) نامەیەکی وەڵامی بۆ هاوری‌کەی ناردبۆوەو تێ‌ی‌دا نووسیبوی:

– ئەتوانن بۆلای ئێمە بێن‌و. بۆماوەی نزیك مانگێك بمێننەوە بە تەنیشت خانوە بچکولانەکەی (رەتنەکار) ەوە. کوختەیێکی سەر بەگەڵاو گیا دا پۆشراو هەبو، هەر ئەو ووت چاوەڕێی (سەدەسیڤا)یە بێتە ناوی. لە قوڕ دروستکرابو، تەنانەت پەنجەرەیەکیش بۆ هەوا گۆڕین تیا نەبوو. دەرگاکەشی لە پارچە داری بڕراو دروست کرابوو. چەند پارچە بێڵ‌و. ئاسن‌و، سندوقە کۆن‌و، دو دوڵابی شکاوی پڕ کتێبی قوتابخانەشی تیادابو لەگەڵ دو مێزو پێنج کورسیداو، سێ هەرزاڵە خرابونە ناوەڕاستی ژورەکەوەو. ئیتر لە هەردو لاوە نەختێك جێگا مابۆوە. کە گەیشتن (سەرسیڤا) پێی ووتن:

– ئەمە خانوەکەیە

(رەتنەکار)و. ژنەکەی لە دوایەوە، هاتن بە پیر میوانە کانیانەوەو، منداڵەکانی هەردو هاوڕێش ئەیان ڕوانی‌یە یەکتری. دنیا تاریکی کردبو. بارانیش زۆر ئەباری‌و. هەمویان لەسەر جێگاکانیان نووستن. (سەدەسیڤا) لە پڕ بە ئاگا هاتەوە بێ ئەوەی بزانی بۆچی، بە خۆی ووت (ئا ئاوایە ژیان!) دەرەوە تاریك بوو، بارانیش هەر ئەباری، (ئەبێ پیاو بەسەرماو باران بمرێت کەچی نامرێت‌و. هەرچی چۆنێك بێت. پەنایەك بۆ خۆی پەیدا ئەکات‌و لە ژیانا بەردەوام ئەبێ!) زۆر سوپاسگوزار بوو. بۆ چارەنووس خۆی‌و، هەروەها بۆ (رەتنەکار)ی هاوری‌ی (بەڵام) لە خۆی پرسی (بەڵام ئەی دوای ئەمەچی ئەبێ چی!).

لە جێگاکەیدا راچڵەکی کە هەستی کرد شتێك، وەکو مشکێك بە سەر دەستیا ئەجووڵایەوە.

ئەیزانی مشکەکان لە خانوەکەدا رمبازێنیان. بوتەنانەت بە روناکیش ئەهاتن‌و. ئەچوون. لە ژێر جێگاکەیدا چەندەها دەنگی سەیرسەیر بە گوێ‌یدا ئەهاتن‌و. لە هەمان کاتدا لە شوێنیکەوە بۆ گەنێکی بە لووتا هات. (سەدەسیڤا) گلۆپەکەی دەستی لە ژێر سەرینەکەی دەرهێناو. بینی وا سەگێکی بێ‌تووك لە ژێر جێنگاکەیدا نووستووە. بە خۆی ووت (ئەم سەگەش مافی هەیە لەم خانوەدا بژی...) بەڵام تاکو ئازایەتی‌و. پیاوەتی خۆی دەربڕی لە باتی ئەو میوانداریتی‌یەی لەگەڵیا کرابو. ویستی سەگەکە راوبنیتە دەرەوە سەگەکەش لەسەر ئەوە سووربو کە نەچێتە دەرەوە بۆ ناو باران‌و. تاریکی‌یەکە. جێگاکانو. کورسی‌و. دۆڵابەکان بەردەمی (سەدەسیڤا) یان گرتبوو. نەی ئەتوانی بەتەواوی بەشوێن سەگەکەرا رابکات‌و. پیاوو. سەگەکە کەوتبونە چاو شارکێ لە یەکتری‌و. لەم بەری ژورەکەوە رایان ئەکرد بۆ ئەو بەری‌و. وادیار بوو سەگەکەش کۆڵێك یاریەکەی لاخۆش بێ‌و. ئیتر پاش نیو سەعات راونان لە ژورە کەدا. (سەدەسیڤا) چوەوە ناو جێگاکەی‌و. سەگەکەش ئیتر پێستەکەی خۆی نەئەخوراند، بەڵام جارجارێك مشەیێکی قووڵی لێوە ئەهات‌و. بۆگەنەکەی پێستیشی هەر مابو. ئەنجا خۆسەگەکە خۆی لێپرسراوی ئەوە نەبو. (سەدەسیڤا)ش زانی هیچ چارێکی نی‌یە. لەبەرئەوە بە مۆسیقای دەنگی بارانەکە خەوی لی‌کەوت. سەر لە بەیانی تیشکی خۆرەکە کۆڵی بەتین بو کە گوێی لە دەنگە دەنگی بو لە هەمولایەکیەوە.

سەری لەسەر خۆ بەرزکردەوە. بینی رەوە مەرێك‌و دو مانگا لە دەرگا کراوەکەوە هاتونەتە ژورێ. ئیتر خۆی پێ‌نەگیراو. بڕیاری‌دا بە دوای خانودا بگەرێ.

نەختێك گیای (پاهنی)و. شقارتەیێکی خستە گیرفانی‌و. کەوتە خۆی. ئەوەی باش بوو یەکشەمە بو. ئەیزانی ئەمە وولاتێکە ئەبێ هەرکەسە بە هەولێ‌و. تەقەلای خۆی شتمرێك بێنی‌و. ژیان وات لی‌ئەکات خۆت بناسیت کە تا چ رادەیەك بە تواناو چالاکیت. بەو جۆرە کەوتە بیرکردنەوەو سواری پاسکیلەکەی بوو بێ ئەوەی بزانی روو بکاتە کوێ. لە مێشکی خۆیدا شارەکەی کرد بە چوار بەشەوەو. بڕیاری‌دا هەر بەشەی بە رۆژێك ببڕێت. کەوتە هەواڵ پرسین لە دوکاندارو. خوردە فرۆش‌و. هەندێ ناسیاوی خۆی‌و. زانیاری‌یەکی زۆری پەیداکرد لە بارەی چەند خانوو یەك‌و. خاوەنەکانیانەوەو. هەرکە شتێکیان پێ ئەووت یەك سەر رۆژمێرەکەیدا ئەینوسی‌و بەڕاکردن ئەرۆیشت بۆ چاوپیکەوتنی بەڵام هەمیشە دەست ئەنرا بە روویداو پی‌یان ئەووت:

– خانو نی‌یە

ئەمیش ئەی ووت:
- خۆ ئەم خانوەکەسی تیادا نی یە.
- دەمێکە پیاوێك گرتویتی بەکرێ
- باشە ئەو خانوەی ترم ئەدەنی کە تەواو بو؟
- نەخێر. ئەویش پیاوێکی دیکە لە پێشەوە کرێی داوەو. هەربەکرێ کەی ئەو خشتەکان کراوونو بناغەکەی پیێ دروست کراوە.

لە هیچ کوێەك خانو نەبو. (سەدەسیڤا) لە بارەی توپۆگراڤی شارەکەوە زۆر شتی بۆ دەرکەوت! ئای چەند شارێکی گەورە بوو. چەندەها شەقامی گەورە گەورەی تیابو! بە بەراوردکردنی جارانەوە. شارەکە زۆر گەورە بو بو. لە کاتێکا (سەدەسیڤا) بە دەورویشتی ولایەتەکەدا بۆ ژیان گەڕابو. دانیشتوانی شارەکە خانویان بۆ خۆیان دروست کردبو. ئیتر بازاڕی جەنگ‌و. سیستەمی دەست بەسەراگرتنی نرخ وای لە هەندێ کەس کردبو زۆر بە زوویی دەوڵەمەندبیو. شارەکە پربو بو لە بازاڕی رەش‌و. لە دەوڵەمەندان بەڵام بۆ ئەم خانویەکی تیادا نەبو!

لە هەر گۆشەیێکەوە ئەتگرت. شارەکە گەورەو. تازەو سەیر دیار بوو. ئەو دیمەنە کۆنانەی ئەم شارەزایان بو هیچیان وەکو خۆیان نەما بونو. بینای دو نهۆمی لە جێگای ئەو حەوزو ئاوو کانیەی جاران قازو مراوی مەلەیان تیادا ئەکرد. دروست کرابونو. سەریفەو کەلاوەکان کرابون بە شەقامی تێرو پرو. بنای بەرز بەرز ئەبینران لە جێگای پر شیێو زەلکاوەکانی جارانداو. وا دەرئەکەوت دانیشتوان گاڵتەیان بە (سەدەسیڤا) ئەهات‌و. هەروەکو پیێ بڵێن (ئیمە هەمو شوێنێکان داگیر کردوەو. ئیرە جێگای کرێکار نی‌یەو. هیچ شوێنێك نی یە بۆ توو. بگەڕیرەوە بۆ.... ) .

(سەدەسیڤا) لە کاتی خۆیدا لە خانویەکی بچوکدا ئەژیا ئا لەم شارەدا. کە بەو گوزەرەدا تیپەری بیرەوەری رابوردوی هاتەوە بیر. خانوەکە لە ژێر درەختێکی - (نیم) دابوو. بەردەمی خانوەکە نەختێك گۆڕرابو. لەبەردەمی دەرگا کراوەکەیدا راوەستا. ئیستا کرابو بە چەشنە خەستەخانەیێك کە تەنها حەیی خۆ پاراستن دابەشی ئەکات دژی نەخۆشی یە درمەکان. پیاوێك لێی پرسی:
- فەرمو ئەتەوێت کێ ببینی؟
- ویستم تەنها تەماشایەك بکەم.

ئەم خانوە بەشێك بو لە رابوردووی‌و. ئیستا هیچ پەیوەندی یەکی بە (سەدەسیڤا)وە نەما بو. خانویەکی دیکەش هەبو لەشەقامێکی تر کە چوار ساڵ تیادا ژیابو. کە لەبەردەمیا راوەستا. گشت ژورەکانی ناوەوەی هاتنەوە بەرچاوی‌و. چەند رووداوێکی گەنجیتی‌شی هاتەوە بیری. خانوی دراوسێکەیانی هاتەوە بیر کە بە تەنیشت ژوری خویندنەکەیەوە بوو. چۆن بە شەوانی مانگەشەو. دەنگی کچێك ئەهات گۆرانی لەگەڵ موسیقای هارمونیکادا ئەووت. لەبەردەمی دەرگاکەدا راوەستاو. لە خۆی پرسی (تۆ بڵێی. وەکو جاران پر دەنگە دەنگو قەڵەبالغی بێت؟). سەگەکەی منداڵی خۆی هاتەوە بیر کە ناوی (بهالو)بو. (توبڵێی رابکات‌و بەپیری یەوەبێت!) - (بهالو) زۆر حەزی لەشیرینی ئەکرد. لە پر پیاوێکی ورگن لێی پرسی:
- کێت ئەوێت؟
- ئایا (سەدەسیڤا یابو) لێرە دەژی؟
نەء. بەرەو خوارترەوە بپرسە.

(سەدەسیڤا) سەری خۆی داخست‌و. رۆیشت‌و. لە پر وەکو بێتەوە سەر هۆش خۆی‌و. سەرسام بو لە خۆی. ئایا ئەی ویست کێ ببینی؟ خۆ ناوەکەی خۆی لە پیاوەکە پرسی بو! گەر بە دوای خۆیدا ئەگەڕێت. پێویست ناکات هەنگاوێکی دیکە بروات بۆ پێشەوە. بەڵکو پێویستە بۆ دواوە بگەڕیتەوە. بۆ رابوردوو. لەوێ بە شوێن خۆیدا بگەڕێت. ئوتومبیلێك لە دوایەوە بە خیرایی‌ئەهات (سەدەسیڤا) بازی دایە قەراغەکەوەوە خۆی بە دیوارەکەوە نوساند بەڵام بێ سود بو. هەرچی قورو لیتاوی جادەکە بو پرژانی بەسەر جلەکانیا. ئەوکەسانەی ئوتومبیل لێ ئەخورن خۆیان جلی چاکیان لەبەردایەو. باری ژیانیان تێرو تەواوەو. ئیتر چۆن ئەتوانن لە کێشەو چەڵەمەی هەژاران بگەن؟ ئەوان پەرۆشی تەنها کاروباری خۆیانن‌و. ئەوانەی ئوتومبیل لێ‌ئەخورن ئەبن بە نۆکەری ئوتومبێلەکانیان‌و. ئەوانەش کە بەپێ ئەرۆن ئەبێ ببن بەقوربانی بۆ ئوتومبێلی دەوڵەمەندەکان و. هیچیان ئەویکەیان ناناسێتەوە!

ئەو قورو لیتەیەی بەسەر جلەکانیا پرژابون هێنایانەوە سەر بارو هۆشی راستەقینەی خۆی‌و. بیری کەوتەوە کە لە چەند خانویەکی ئەم گوزەرەدا ژیابو. بەڵام بۆچی تەنها لەم شارەدا؟ ئەی لە چەندەها سوێنی دیکەی ئەم سەر زەمینەدا نەژیابو؟. بە دەوزی چەندەها ئاگردانا دانەنیشتبوو. عارەقی ناوچەوانی لە چەندەها ئیستگەی شەمەندەفەردا نەسری بو! ئەی لە چەندەها باری ژیانی جیاواز جیاوازدا خۆی نەدی بو!؟ هەرباریکیش لەو بارانەی ژیانی. ئیستا بوبون بە رابوردو بۆی‌و. هەرچەندە هەموکەرەتێك ئەبەزی‌و ئەشکا لە خەباتی ژیانیا. بەڵام هەر سەری دەرئەهێنایەوەو. وائیستاش ژیاو بوو. ئامادەش بو جارێکی دیکە بکەوێتەوە خەباتکردن لەگەڵ ژیانداو. لە هیچیش پەشیمان نەبو!

ئێوارەبو کە گەیشتەوەماڵەوە. هەوری تاریك تاریکیش خەریك بون ـە ئاسماندا کۆ ئەبونەوەو، رۆژێکی لێڕۆیشتبو بێ ئەوەی هیچ خانویەکی دەست کەوێت، ئیتر پاش بڕینی هەرچوار بەشی شارەکە لە ماوەی چوار ڕۆژدا (سەدەسیڤا) دەوامی. لە فەرمانگەکەی دەست پێ‌کرد. بەڵام دەوام کردنەکەی تەنها لەسەر کاغەز بو چونکە جێگایەك نەبو لەسەری دانیشی. فەرمانگەکە شارە هەنگ بو، کارکەرەکانیش هەنگەکانی بون. نە کاتێکا چەند هەنگێك ئەفرینە ناو شارە هەنگەکەوە هەندێکی دیکە ئەفرینە دەرەوەی. ئەوەتەی دنیا دنیایە ئەمە پیشە بوە، هەندێ هەنگەکان نەختێك گەورەن، نەختێك قەڵەوون‌و، لە هەمان کاتدا هەندێکی دیکەیان نەختێ بچوکن‌و، نەختێ لاوازن‌و. هەندێکیان زۆرتر ویزە ویزیان دێ‌و قایمتر گاز ئەگرن، کەچی ویزە ویزی تێکرایی هەموانی دیکە ئەوەندە کزو بێ دەنگە ئەڵێی گفتوگۆ یەکی لەسەر خۆیە!

(سەدەسیڤا) هەرچی چۆنێك بو، مێزێکی لە داڵانێکی تەسکا دانا. لەگەڵ کورسی‌یەك‌و. دو دۆڵابی بچکوڵەو. ڕپ لەسەر کورسیەکە دانیشت‌و. دەستی لەسەر مێزەکە داناو. بە چاوەکانی زەق زەق تەماشای پێشەوەی ئەکرد بەڵێ ئیسپاتی کرد کە کارگێڕێکی ئەم فەرمانگەیە بوو. لێرە ئەیتوانی جێگا بۆ خۆی دامەزرێنێ!

تەماشای دەوروپشتی خۆی کرد. بینی پشقلی بزن لە نزیکیەوەیەو. هەندێ نیشانەی ڕیخی گاش بەزەوی یەکەوە دیاربو. بیستبوی کەوا بۆنی پشقلی بزن چەشنە پاراستنێك ئەبەخشی دژی نەخۆشی سیل‌و. ڕیخی گاش وەکو پاکەرەوە بو! هەستی کرد کە لێرەشدا هەمو شتێکی بە دەست نەبو.

ئەنجا بزنێك‌و. سێ بەرخ هاتن‌و. (سەدەسیڤا) بەسەرسامی‌یەوە تەماشاییکی کردن‌و. ئەوانیش بۆ ماوەییکی چاك چاویان تێ بڕی بوو.

(سەدەسیڤا) لە فەرمانگەکەی داوا کرد خانویەکی میری بدەنێ. بەڵام بەڕیوەبەرەکەی تێی گەیاند کە ئەوان لێپرسراوی ئەوە نین‌و. لای روون بو ئەبێ جارێکی دیکە بکەوێتەوە تێکۆشان‌و. هەوڵی تایبەتی خۆی چونکە کۆمپانیەکان لەسەر هەوڵ‌و. تێکۆشانی تایبەتی دامەزرابون. ئا بەو شێوەیە (سەدەسیڤا) ئامۆژگاری کرابو. ئا ئاوا بینا دروست ئەکرێت‌و شت‌ومەك بۆ دەرەوەی وولات ئەبرێ‌و. لە دەرەوە ئەهێنرێت. کەوابێ ئیتر هیچ هەیە مەحال بێ؟ گەر یەکێ خانوی دەست نەکەوێ ئەوە پەیوەندی بە تێکۆشانی خۆیەوە هەیە. یان بە کەمتەرخەمی‌و بێ‌شانس‌و. بەختی‌یەوە هەیەو. ئەمەش پێویستی بە دڵنیا کردن نەبو. پیاوانی شارانی گەورەش هەمیشە ئامادەن یارمەتی ئەوانە بدەن کە لە کێشەو چەڵەمە دان‌و. هەردەم پەیمانیان ئەدایەو پێ‌یان ئەووت:

– ئەگەرێن بۆ خانوویەك بۆت.

ئەنجا دوهەم رۆژ کە ئەم لێی ئەپرسینەوە:

– چیت کرد بۆم؟

– لە بارەی چی‌یەوە؟

– لە بارەی خانوەکەوە.

– ئا. خانو. وانی‌یە تێ تێ. کەی بینیم ئاگادارت ئەکەم. بەو شێوەیە دڵنیایان ئەکردەوە بێ ئەوەی خانویەکی چنگ کەوێت‌و. هەرچەند (رەتنەکار) هەرگیز نارەزایی دەرنەبڕی. بەڵام (دەمەیانتی) ژنی هەمو ئیوارەیەك لێی ئەپرسی:

– خانوەکە بەچی گەیشت؟

ئەو منداڵەی بە تەمای هاتنە دنیاوە بو. پێویستی بە خانویەك هەبو. هەر (دەمەیانتی) خۆی بوو بە هۆی رزگار کردنی مێردەکەی. چونکە (سەدەسیڤا) داوایەکی پێشکەش بەخەستەخانە کردبو لە بارەی منداڵ بونی ژنەکەیەوەو. ئەوانیش کوختە ژورێکیان دایەو. ئیتر بە خۆی‌و. خیزانەکە یەوە گۆیزایانەوە ناوی‌و. ئیتر (سەردولا) کەوتە سەماکردن لەسەر تۆزەگیا سەوزەکەی بەردەم کوختەکەو. هاواری ئەکرد:

– خانو. خانو. خانوی خۆمان.

(ئەنوستوپ) و (مەندەکرانتا)و (گەیاتری)ش کەوتنە رمبازێن بەسەر گیاکەداو. لەراستیشدا کە تیشکی خۆرەکە ئەی دا لە سەوزەگیاکە دیمەنێکی زۆر دڵگیری ئەنواند.

(دەمەیانتی) لای هەیوانەکەوە وەستابوو. زەردەخەنەیێك گرتبووی‌و (سەدەسیڤا)ش تەماشای نەختە هەورەکەی ئەکردو. بیری لەوە ئەکردەوە کە ئەبێ ناوی منداڵە تازەکەیان بنێن چی. لەوکاتەدا. دەرگای حەوشەکەی دراو سیکەیان کرایەوەو. تەرمی مردویەکیان لێ‌هێنایە دەرەوەو. (سەدەسیڤا) ترس گرتی‌و. هاواری بۆ منداڵەکانی کردو، ووتی:

– دەی منالّان بۆ ژوورەوە!

١ ئەم چیروکە لەم گوڤارە وەرگیراوە:

LOTUS: JOURNAL OF AFRO - ASIAN WRITERS ASSOCI ATION NO 56 - 1985 (Page 11 - 17)

٢ گوفری نات موهانتی. ئەدیب‌و نوسەرێکی ناسراوە لە هندستان‌و. **چەند خەلاتێکی بەرزی ولایەتەکەی خۆیی‌و گشت هندستانی پێ دراوە**





# سیراکۆس

وەرگێرانی

ئەندازیار. خوسرەو جاف

**بیست ساڵ پێش زایین رۆمانەکان لە گەرمەی دەستەڵات و توانا و بەهێزییان دا بوون و هەر رۆژەی پەلاماری وڵات و ناوچەیەکیان دەدا بۆ نواندنی دەستەڵات و هێزو تواناو دەست کەوت ، بەهێـزێکی زۆرەوە هەڵیـان کوتایە سەر شاری «سـیراکـۆس» ، بەڵام هەرچی کۆشش و تەقەللاو ئازایەو هونەری جەنگیان نواند نەیان توانی شارەکە بگرن و دەرو دەروازەی بکەنەوە، بۆیە ناچار بوون ئابلوقەی شارەکـە بدەن تاوەکـو دانیشتـوانی شارەکـە خۆیان بە دەستەوە بدەن .**

ئابلوقـەدانی شار زیاتر لە سێ ساڵی خایاند ، شار نە ك هەر خۆی نەدا بە دەستـەوە بەڵکو رۆژ لەدوای رۆژ بەرگرییان و بەربـەرەکانیان زۆرترو بەتین تر دەبوو، ئافرەتانی شاریش لە پتەوکردنی ورەو بیرو رای پارێزەرانی شاردا رۆڵێکی دیاریان هەبوو بۆ هاندانی جەنگاوەرانی شارەکەیان تاراندنی دوژمن لە چواردەوری شوراکانی شاردا .

لەنێوان جەنگاوەرانی ناو شاردا لاوێکی جوانی عاشق هەبوو هەرکە بچووکترین هەلی بۆ برەخسایە یەك و دووی لێ نەدەکردو دڵێرانە لە شوراکانی شار دووردەکەوتەوەو بە هەڵەداوان خۆی دەگەیـانـدە خۆشـەویستـەکـەی و کاتێکی شادی لەگـەڵدا دەگـوزەراندو هێزو توانا و هۆشی دەمەزرد دەکردەوەو پاشان خۆی دەگەیاندەوە ناو شار بە هیوای رۆژی کشانەوەی دوژمن لە دەوروبـەری شارەکـەیـان دا تاوەکو ئەوانیش بۆ هەمیشە بەیـەك بەختـەوەر ببن ، ئەم دوو دڵدارە بەئـەنـدازەیـەکی لەرادەبەدەر یەکتریان خۆش دەویست بە تایبەتی کورەی عاشق هەرکـە چاوی بە خەرمانی زوڵف و ئەگریجەی کچە دەکەوت

ئاگری ئەوینی بڵێسەدارتر دەبووو تەواوی عیشق و ئارەزووی دەبـەست بە خەرمـانـە زێـرینەو تێری نەدەخوارد لە بۆن و نەوازشیـا ، هەست و ئەوینی کورە بە ئەگـریجـەی بڵنـدو سەربەرەو خواری کچە بەلای کچەوە سەردەمێك بوو زانرابوو ، بۆیە هەمیشە خەریکی رازاندنەوەو ئاگاداری تاڵ تاڵی زوڵفی بوو بوو ، ساتێك لەبیری نەدەکردو زیرەکانە پەروەردەی دەکرد .

جارێکیان دوای ژوانێکی ئاگرین و پر رازو نیازو ئەوین کورە هەستـا بگـەرێتەوە بۆ لای برا سەربازەکانی لەسەر شورەی قەڵاکەوە کچە نواری چەند تاڵێك لە تاری کەوانەکەی بچراوە ، لەو رۆژانـەش دا بە دەست هێنـانی مووی کلکی ئەسپ و ریخۆڵەی چوار پێ کارێکی سانا نەبوو، زەمانێك بوو دوژمنێکی درو بێ ئامـان چواردەوری شاری ئابلوقـە دابـوو ، پەلەوەر

نەیدەتوانی نە لەشار وەدەرکەوێت و نە بێتە ناو شارەوە ، برسێتی تەنگی پێ هەڵچنیبوون ، هەرچی ئاژەڵ و چوارپێ لەشاردا هەبوو هەمووی لە برسانا لەلایەن خەڵکی شارەوە خورابوون، مووی کلکی ئەسپ و ریخوڵەی چوار پێ لە شاردا وەدەست نەدەکەوت تا تاری کەوانەکەی پێ ساز بکاتەوە ، کچە کەوانەکەی لە کورە وەرگرتو بۆ تاوێك گوم بوو، کاتێك کە گەرایەوە تاری کەوانی کورەی خۆشەویستی نوێ کردبۆوە، کورە لەم کارە سەری سورما و لە دڵی خۆیدا دیگوت دەبێ ئەو موویانەی لە کوێ وەگیر هێناوە .. !؟ هەر چەند بیری دەکردەوە پەی بە رازەکە نەدەبرد ، تا دوایی بۆی دەرکەوت کە کچە پوتەڵەیەکی لە زوڵفی خۆی بریوەو هۆنیویەتیەوەو کردوویەتی بە تاری کەوانی دڵدارەکەی تاوەکو باشتر دوژمن تاك لەچنکات ، کورە لە سەرەتاوە دڵی نەدەهات

دەست بۆ کەوانەکەی درێژ بکاو گێژو مەنگانە دەینواری بە کەوانەکەیداو لەبەر خۆیەوە دەیبۆڵاندو دەیگوت :
زوڵفی تۆ خواکان تەنها بۆ بۆن کردن و سەیرکردن خوڵقاندوویانە ، ستەمە ئاوەها بەکار بهێنرێت ، لەسەرخۆ دەستی بۆ کەوانەکە درێژکردو بە ئارامی گوێپەنجەی دەکێشا



بەسەر تارە هۆنراوەکەوە ، لەپڕ بەتەواوی تواناوە کە تاری کەوانەکەی کێشاو هەرکە بۆنی گوڵاوو مسك و عەنبەری زوڵفی دڵدارەکەی چوو بە لوت و سینگ و هۆش و ناخیدا هەستی بە هێزێکی جادویی کرد لە لەش و بازویدا و بۆی دەرکەوت کە بەو هێزو تواناو هەستی کەوانەوە قەرەچوڵی دوژمن دەبرێتەوە ، بە پەلە گەرایەوە بۆ سەر شورەی قەڵاکەو کەوانی خستە کارو دەستی کرد بە تیربارانی دوژمن و لەگەڵ هەر تیرێك دا کە دەیهاویشت دوژمنێکی دەتلانەوە ، هاوەڵەکانی سەریان لە رازی ئەو هێزو توانایەی کورە سورمابوو ، نەیاندەزانی چاوگەی ئەو تواناو هێزو باوەرە چییە ؟ بۆیە کەوتنە پرسیار لە کورەی هاورێیان ، سەرەنجام رازی تواناو هێزی ئەو تیرهاویشتنەی کورەیان بۆ دەرکەوت ، هێندەی پێ نەچوو جەنگاوەرانی دەورو پشتی کورەی دڵدار هەر هەموویان تێکرا چاویان لەو کردو لە زوڵفی خۆشەویستەکانی خۆیان ڕنی کەوانەکەیان هۆنیەوەو بەدڵ و تواناو بە باوەڕێکی پۆڵایینەوە دەستیان کرد بە کوشتنی دوژمن . تیرباران و پێکاندنی سەربازانی دوژمن بە دەست ئەو تاقمە سەربازەی قوللەی قەڵاکە بووبووە هۆی لێکەوتنی زەرەرو زیانێکی زۆر لەهێزی دوژمن ، فەرماندەی سوپای رۆم لە پێکاندنی ئاوەها پڕ رێزەکاری ئەو قوللەی قەڵایە سەریان سورمابوو نەیاندەزانی تێنەدەگەیشتن هۆی چییە ؟! تا سەرەنجام رۆمەکان توانیان لەگۆشەیەکی شورای شارەکەوە بێنە ناو شارەکەو یەك لەدوای یەك قوللەکانی شار بەدەست بهێنن تەنها قوللەی کەواندارانی عاشق نەبێت هەرچی دەکۆشان نەیاندەتوانی وەچنگی بهێنن ، تا دوژمن بریاریدا تەواوی هێزو دەستەڵاتی بەرەو ئەو قوللەیە بنێرێت ، ئەوە بوو دوای کوشتارێکی زۆر توانیان قوللەکە بگرن و ئەو جەنگاوەرانەی تێیدابوون یا بیانکوژن یا دەست گیریان بکەن ، بەگرتنی دوا قوللەی بەربەرەکانیو وەدەست هێنانی تێکرای شار رۆمانەکانی سەرمەستی سەرکەوتن کردو جەژن و بەزم و ئاهەنگێکی زۆریان گێراو لە هەمان کات دا فەرماندەی رۆمەکان کەوتە پرس و لێکۆڵینەوەی رازی بەرەبەرەکانێی دوا قوللەو ئازایەتی شەرکەرانی ئەو قوللەیە ، بۆی دەرکەوت دڵدارانی شار لە پێناوی شاروو وڵاتەکەیان دا چەنێك عاشقانەو لە

خۆبـوردنیان نیشان داوە بۆ پاراستنی شاری «سیراکۆس» و چەنێك بۆ هێزی رۆمانەکان بەگران تەواوبووە، بۆیە بریاری‌دا تۆڵەیـەکی لە بیرنـەچـوو لە ئافـرەتانی زوڵف درێژی شاری «سـیراکـۆس» بکـاتـەوە . سەرکـردەی لەشکـری رۆمـەکان فەرمانی‌دا هەرچی ژنان و پەری روخسارانی زوڵف درێژی شار هەیە یەك یەك کۆیان بکەنەوەو لە بندا خەرمانی زوڵفیان ببرن .

کچـەی دڵداری کورەی عاشق کاتێکی زانی لە ریـزی ژنانی زوڵف درێژی شاری «سیراکۆس»دا چواردەوری گیراوەو تا ئەگـریجـە ئاڵتـونیەکانی کە وەك تاڤگەی زێرین وایە هەڵ نەپاچن دەربازبوونی نی‌یە .

کچە ماتو بێ‌دەنگ لەریزدا وەستابوو چاوەرێی نۆرەی زوڵف برینی دەکردو بیری لە دڵدارەکەی دەکردەوە لە دڵی خۆیدا دەیگـوت : ئاخـۆ دەبێ چی بەسـەر هاتبێت ..؟ کوژراوە ..؟ برینـدارە ..؟ بە دیـل گیراوە ..؟ کچـە سەری لێ شێـوابـوو نەیدەزانی چی‌بکا ، ئاواتە خوازبوو بۆ دواجار زوڵفی پەخشان بکـردایە سەر سینگ و سەروبازووی پیاوانەی دڵدارەکەیداو ئەویش دەست و پەنجـەی بەرەڵلا بکـردایـە لەنـاو خەرمانی ئەگـریجەو ، پەرچەمدا ، تاوتاویش بەنازێکی ژنانەوە بەخەندە زوڵفی لادایەو ئەوکاتە هێندە ئازاری ئاوەها زۆر نەدەبو بە دەم ئەنـدێشـەو ئاواتـەوە کاتێـك لە چاوی کردەوە نواری لەگـەڵ نازدارانی شاری «سـیراکـۆس» لە ژوورێکی پان و بەرین دا ترنجـاون بەسـەر یەکداو بۆی دەرکەوت کەلە هەمان ژووردا سەرمایەی جوانی‌و رازو نیازی ژنانەی لەدەست دەدات ، لە ناوەراستی ژوورەکەدا سەربازێکی رۆمی لەندەهوری قەیچی بەدەست راوەستـاوەو تەققەی دەمی قەیچیەکەی دێت و وەك چۆن بە هەورین مەر ببـرنـەوە بێ رەحمـانـە زوڵفی پەری پەیکـەرانی‌داوەتـە بەر تیغی بێ بەزەیی قەیچی ، لەولاشەوە چەنـد سەربـازێکی رۆمی لەزوڵفـە براوەکان پەتو گوریسیان دەهۆنیەوە تا نۆرە گەیشتە کچەو لەسەرخۆ ئارام و بێ دەنگ چووە ژێـر دەستی رۆمی قەیچی بەدەستـەوە چاوە پرشنـگ دارەکانی نووقاندوو توند توند دانی بەلێویدا نا تا پرمەی گریان و سۆزی دەروونی لە قورگیـدا نەتەقێتەوە ، هەر کە گوێی لە خرمەی دەمی قەیچی بوو وەك وابێت تاڵ تاڵی بەنەکی ببچرن

بەلام نەی دەویست بە شیوەن و گریان دوژمن دڵشاد بکا دوای زوڵف برینەوەی ئەو تەنها چەند ئافرەتێکی دیکە مابوونەوە ئەوا نیشیان دا بە دەم قەیچی‌یەوەو زوڵفیانیان هەڵ پاچی ، کاتی ئافـرەتـە زوڵف هەڵ پاچـراوەکـان هاتنـە دەرەوە نواریان لە گۆرەپـانی شاردا چەندین سێ دارەیان هەڵواسیوەو لە زوڵف و پەرچەمی هەڵپاچراوی ئەوان پەت و گوریسیان سازاندوەو بە سێدارەکان دا شۆریان کردوتەوە ، دڵی کچە کەوتە لێدان و بێ ئارامی ، هۆن هۆن فرمێسك بە سەر روومەتە نەخشینەکانی‌دا سەراژێر دەبۆوە، لەبەر خۆیەوە دەیگوت : تۆ بڵێی وابێت ..؟ دڵ رەقی‌و دەرندەیی‌و نارەوایی بەم ئەندازەیە ...؟! خوێن خۆری بەم رادەیە ..؟ زوڵف و پەرچەمی من هاوولاتیانی شارەکەمی پێ هەڵواسن ...؟! لەم ئەندیشەیەدا بوو سەیری کرد وا کۆمەڵێك سەربازی بە دیل گیراوی شارەکەیان دراونەتە پێش و بەرەو لای سێ دارەکان دەیانبەن ، کچە لەناو بە دیل گیراوەکاندا کورەی دڵداری خۆیشی بەرچاو کەوت ، هەرکە کورەی دی هاواری لێ هەستاو بەلادا هاتوو لە هۆش خۆی چوو ... کاتێك بە هۆش هاتەوە ماتەمی و بێ دەنگیەکی سامناك باڵی کێشابوو بەسەر خەڵکەکەداو لەشی شۆرە سوارانی شاریش رەشەبای زۆرداری دەیشـەکـاندەوە ، کچە وەکو جادو لێکراوێك لەسەرخۆ بەرەو سێدارەو لەشـە هەڵواسراوەکـان رۆیشت و یەکـە یەکـە لە روخسـاریان ورد دەبۆوە بەرەو ئەوی‌تر دەرۆیشت و بەدوای کورەی دڵداری خۆیدا دەگەرا تا گەیشتە سێدارەیەك لەشێکی لەژێردا کەوتبوو ، کە وردبۆوە لە روخساری دڵدارەکەی خۆی ناسیەوەو سەری نا بە روخساریەوەو لە ناخەوە ناڵاندی . کورە لەسەرخۆ چاوی کردەوەو روخساری پەری ئاسای زوڵف ناوی کچەی دی‌و سەرسام بوو .

کچـە لەسـەرسـورمـانـی کورە تێگـەیـشـت بە زەردەخەنەیەکەوە وتی : «هێشتا هەر بەلاتەوە جوانم» ؟.. کورە بە لێوە لەرەوە وەلامی‌دایەوەو وتی : هەرگیز تۆم لەم جوانیەدا نەبینیوە .. ئەمەی وت و گیانی سپارد ، کچە کەورد بۆوە لە پەتە پێچراوەکەی گەردنی دڵدارەکەی زوڵف و ئەگریجەکەی خۆی ناسییەوە کەلە گەردنی دڵدارەکەیدا پێچرابوون .





نیکولینەوەی شانۆیی

•

- حیدر عبدالرحمن -

•

# پێـــدا چوونەوەیەك
# بە نمـایـشی سینـــاریــۆی
# شانۆگەریەکی ژەهراوی

**سەرەتایەك** :

ئەلکسەندەر سەرگنیتش پۆشکین (١٧٧٩ - ١٨٣٧) بەیەکەم هەنگاوی رسکاندن و گەشەسەندنی مێژووی ئەدەبی روسیا دادەندرێت ، چونکە ئەم مرۆڤە مەزنە ، توانی تێکرای چالاکی یە ئەدەبیەکانی روسیای سەدەی هەژدەهەم لێکتر ببەستێتەوەو بە هونەرێکی ئێجگار بالاوە ، تێکەڵ بە رێبازو تەوژمە ئەدەبی یە ئەورووپیەکانی بکات .

هەر ئەو مرۆڤە مەزنە بەبلیمەتی و لێهاتوویی خۆیەوە توانی ، ئەدەبی رووسی لە قۆناغی نەش و نووما کردنی نەتەوایەتیەوە ، بۆ قۆناغێکی فرەوانترو بالاتر بگوازێتەوە ، کە ئەویش قۆناغی تەعبیرکردن بوو لە خواست و پێداویستیەکانی مرۆڤی رووسی .

بەمە پۆشکین ، ئەدەبی رووسی گەیاندە ئاستێك کە جێگەی دیاری خۆی لە نێوان ئەدەبە جیهانیەکان دا هەبێت .

پۆشکین .. شیعرو داستان و چیرۆك و شانۆشی نووسیووە ، لەپاڵ ئەوەش دا هاوبەشیەکی کاریگەری خۆی هەبووە ، لە جوڵانەوەی ئەدەبی و رۆژنامە نووسی ئەدەبیدا ، بەم چەندان داهێنانە جۆراو جۆرانە ، هەوڵی ئەوەی داوە کەوا بنچینەیەك بۆ زمانی هاوچاخی رووسی دابمەزرێنێت ، بەشێوەیەکی ئەوتۆ کە تاوەکو ئەمرۆکەش بە سەرچاوەیەکی زیندووی زمانی ئەدەبی دادەندرێت .

بۆیە (گۆرگی) دەڵێ : پۆشکین مرۆڤێکی بلیمەتی ئەوتۆ بوو، لەو ژیانە کورتەی خۆیدا توانی بنچینەیەکی وا دابمەزرێنێ کە کەسێ لەدووای ئەو نەتوانێ ، لەبواری هونەردا ئەو پایەی ئەو بلەقێنێ .

نەك هەر گۆرکی بگرە ، گۆگول ، تۆلستۆی ، تۆرگنێف ، دۆستۆیفسکی ،هەموو ئەمانە ، ئەو بلیمەتانە دانیان بە بلیمەتی پۆشکین ناوەو بە باوکی ئەدەبی روسییان لە قەڵەم داوە

**پوشکـین و شانۆ** خوشکی پوشکین لە یاداشتەکانی خۆیدا دەست نیشـانی ئەوەی کردووە کەوا پوشکـین هەر لەتەمەنی منـاڵیدا ئارەزووی لە شانـۆ هەبووە ، بەرهەمە شانۆییەکانی گەیشتۆتە نزیکەی (٢٥) شانۆگەری ، کۆمەڵێ لەو شانۆگەریانە بلاوکراونەتەوەو نیشان دراون ، کۆمەڵێکی تر ، پوشکین لەکاتی خۆیدا بە نیوەچڵی بەجێی هێشتوون کۆمەڵێکی تریش تەنها ناونیشـانـەکـانیـان دۆزراوەتەوەو دەقەکانیان دیار نین ، لەو نامـانـەدا دۆزراونـەتـەوە کە بۆ دۆست و هاورێکانی خۆی نووسیووە ، دیارترین شانۆگەریەکانی پوشکین بریتین لە :

١. بوریس گۆدۆنۆف
٢. شۆرەسواری بەرچاوتەنگ
٣ مۆزارت و سالێری
٤. میوانی بەردی
٥. زەماوەندێ لەسەردەمی پەتایێدا .
٦. پەری دەریا
٧. چەند دیمەنێك لە سەردەمی سوار چاکیدا .
٨. ئای لەو چارەنووسە .
٩. فادیم .
١٠. بریاریان دا کە لە مۆسکۆ کۆچ بکەن .
١١. ئەو بانگم دەکا .
١٢. دووای هەفتەیەك لەپاریس دەبم .
١٣. بابیا ئەیونا .
١٤. تۆش لەوێ بوویت .
١٥. لەلایەن ئەو سواڵکەرە بەرێزانەوە .
١٦. سواڵکەر .
١٧. کار ئاوا لەجیهان دا بەرێوە دەچێ .
١٨. فەیلەسوف
١٩. رۆمۆل وریم .
٢٠. دەگەرێت .
٢١. بیرالد سافۆیسکی .
٢٢. بافلی دووەم .
٢٣. دیمتری و مارینا
٢٤. کورسکی .
٢٥. ئەهریمەنی ئاشت .

دووای ئەوەی کە پوشکین خوێندن تەواو دەکات ، لەجاران زیاتر روو لەشـانـۆ دەکـات و پەیـوەندیەکی زیاتر لەگەڵ دیارترین ناودارە شانـۆییـەکـانی ئەو کاتـە پەیـدا دەکات و بەردەوام شانۆگەریەکانی ئەوکاتەی بەسەر کردۆتەوە ،هەر لەو کاتەش دا پەیـوەنـدی لەگەڵ کۆمەڵەیەکی ئەدەبی پەیدا دەکات بەناوی کۆمـەڵەی (چـرای سەوز)و لەو کۆمەڵەیەدا چەندان راپۆرتی شانـۆیی لەلایـەن ئەنـدامانی ئەم کۆمەڵە پێش کەش کراوەو دەمەتەقێی لەسـەر کراوە پوشکین سوودێکی زۆری لەم هەلە وەرگـرتـووە ، هەر لەو کاتــەش دا سەرنج و تێروانینەکانی ، دەربارەی کۆمەڵێ مەسەلەی شانۆییەوە نووسیووە بەناونیشـانی (هەندێ سەرنج و تێبینیم دەربارەی شانۆی رووسی) .
لە ساڵی ١٨٢٤ ـ ١٨٢٥ ـ پوشکـین شانۆگەرییە شیعرییە بەنـاوبـانگـەکـەی (بـوریس گۆدۆنـۆف) بلاو دەکاتەوە ، کە بەگـەورەتـرین بەرهــەمێکی شانـۆیی پوشکین دەژمێردرێت و جێگەیەکی دیاری خۆی هەیە لەمێژووی شانۆی روسیادا .
لەو بەرهــەمەدا پوشکین چەندان رێبازی شانۆیی جیا جیای ئەوروپای بەسەر کردەوە ، بەتایبەت رێبازە گەشەسەندووەکانی فەرەنساو ئینگلتەرا ، تا گەیشتە ئەو بروایە کە یەکیەتی کات و شوێن ، باوی نەمـاوەو ئەو رێبـازە شانۆییەی کە شانۆیستە فەرەنسیـیـە کلاسیکیەکان لەسەری رۆیشتوون و کردویانەتە دروشمی خۆیـان ، کارێکـە تەگـەرە لەبـەدەم سەربەخۆیی نووسەری شانۆییدا دروست دەکات .
پوشکین لەم شانۆگەریەدا هەوڵی ئەوەی دا کەوا شانۆی روسیا لەو بازنەیەدا دەرباز بکات کەوا نەخشەی بۆکێشرابوو ، هەموو ئەو تەوق و پێوەندانەش بشکێنێ کە لەئەستۆو گەردنی شانۆی روسیـا ئالابـوو ، ئەوەبـوو شانـۆگـەریـەکـانی لە کۆشـك و تەلارەکانەوە خزاندە سەرشەقام و لەناو جەرگەی شارەکانەوە ، بۆ بەرەکـانی جەنگ و لەوەندەش زیاتر سنوورە ئەقلیمەکەی خۆی شکـانـدو لەروسیاوە کشایە پۆلۆنیا ... مەسەلەی پێنج بەشـە دیاری کراوەکەی شانۆی بەلاوەناو شانۆگەرییەکانی خۆی دابـەشی سەر بیست وسێ دیمـەن کردو نزیکەی (٦٠)

کاراکتەری لە تێکرای چینەکانی کۆمەڵ هێنایە ناو شانۆگەریەکەی. پۆشکین ـ پێشکەوتنی خۆی لەچاوی ئەو تەقینەوە گەورەیەدا دەبینی، کەوا لەو کاتەدا لەئەوروپادا، پەل وپۆی خۆی بۆ کون و کەلەبەرەکانی تری جیهان دادەکوتا... تارا دەیەك سوودی لە شێوازی شانۆیی (شکسپیر) بینیوە، بەتایبەت شانۆگەرییە مێژووییەکانی، سەرباری دووری مێژوویی نێوان هەردوکیان، چونکە یەکەمیان رەگەزە مێژوویی‌و ئەفسانەیی‌و خەیاڵیەکانی بەکار هێناوە، بەڵام لای پۆشکین، گرنگیەکی تایبەتی دراوەبە بەسەرهات و رووداوە واقیعیەکانەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا، ئەمە ئەوە ناگەیەنێ کە پۆشکین بەشکسپیر کاریگەر نەبووە، نەخێر لەهەندێ حاڵەت دا پۆشکین بە ئاشکرایی دانی بەمەدا ناوە، چونکە وەکو خۆی پەنجەی بۆ ئەوە راکێشاوە کە رێنماییە میلل‌و نەتەوایەتیەکانی شکسپیر لەگەڵ شانۆی ئێمەدا دەگونجێن.

بەڵام بەگوێرەی ئینگلیزەکان (پۆشکین) زۆر بە (بایرۆن)ی شاعیر کاریگەر بووە ـ وەك شاعیر ـ بەڵام وەك شانۆ نووس... نا.. چونکە پۆشکین خۆی لەنووسینێکیدا بەناونیشانی (دەربارەی شانۆگەریەکانی بایرۆن) دەڵێ: (بایرۆن لەشیعرو داستانەکانیدا گەورە بووە، بەڵام بە شێوەیەکی لاسایی کەرەوە هاتۆتە جیهانی شانۆ).

دووای تاقیکردنەوە سەرکەوتووەکەی (بۆریس گۆدونۆف) پۆشکین زیاتر هەوڵ و تەقەللای خۆی بۆ شانۆ نووسین تەرخان کرد، ئەوەبوو دووای ئەم بەرهەمە چوارشانۆگەری تری نووسی کەبریتی بوون لە (شۆرەسواری بەرچاوتەنگ، مۆزارت و سالێری، مێوانی بەردی، زەماوەندێ لەسەردەمی پەتاوە).

پۆشکین ـ لەبواری ئەدەبی شانۆییدا هەر بەردەوام بوو، بەڵام کۆتایی نەهێنا بەو شانۆگەریەی کەوا دەربارەی ژیانی نەتەوایەتی روسیا نووسیبووی، تا لەپاش ماڵ ئاوایی کردنی، دەستەی نووسەرانی گۆڤاری (هاوچاخ) ناونیشانی (پەری دەریا) یان ناو لێنا.

دیسان هەر پۆشکین شانۆگەریەکی تریشی نووسیوە، دەربارەی راپەرینی جوتیاران دژی دەرەبەگەکان و هەمان گۆڤار ناوی (چەند دیمەنێ لەسەردەمی سوارچاکی) لێناوەو بڵاوی کردۆتەوە.

ئەوەی دەربارەی شانۆگەریەکانی پۆشکین گرنگ بێت ئەوەیە کە پۆشکین بەردی بناغەی شانۆی روسیای دامەزراندووەو بۆتە سەرچاوەیەکی پرشەنگدار لەمێژووی بەرەوپێشەوە چوونی شانۆی رووسی.

**مۆزارت و سالێری**: پۆشکین لەم شانۆگەریەدا چیرۆکی سەردەمێکی تاریکی روسیا دەگێرێتەوە کە لەناو جەرگەی نیگەرانی‌و دوو دڵیدا بەدووای دۆزینەوەی چارەنووسی خۆیدا دەگەرێت، هەموو دەوروبەر بۆنی سامناکی‌و خامۆشیەکی کپ وبێ دەنگی لێوە دێت..

پاڵەوانەکان لەیەکتر دڵنیانین و مردن بۆتە ئاوازێکی بەردەوام و خەمناکی سەر زاریان، پۆشکین ـ لەم شانۆگەریەدا دەیەوێت مەرگەساتێك بۆ مرۆڤایەتی بگێرێتەوە، لەو مەرگەساتەگەورانەی کە ویژدانی هەموو سەردەمەکان بهەژێنێ، مل ملانێ ئەزەلیەکانی مرۆڤ قوڵتر دەکاتەوەو مانایێکی تر لەنێوان تاریکی‌و رووناکی، پاکی‌و بۆگەنیەتی.. بەمرۆڤایەتی ببەخشێت.

مۆزارت و سالێری هەردوکیان زادەی ئەو سەردەمە تاریکەن و نموونەی بەردەوام بوونی ئەو مل‌ملانێ هەمیشەییەی نێوان بوون و مرۆڤن.. کە هەرگیزاو هەرگیز کۆتاییان بۆنییە، سالێری ـ لەبەردەم بلیمەتێکی وەکو مۆزارت خۆی لەکورتە بالاییێك بەنزمتر دەزانێ، چ دەسەڵاتێکی بەرامبەر بەبەهرەی گەورەو شکۆمەندی مۆزارت نییە، تەنیا ئەوەندە نەبێ کە ئەشکەنجەو ئازارە دەروونیەکانی خۆی بخواتەوە، یا بیان کات بەرقێکی ئەستوور لەسنووری خوو رەوشتی ئاسایی مرۆڤ بەدەری خەن و ببێت بەتاوانبارێکی بێ‌دەسەڵات.. چونکە مانای بلیمەتی‌و گەورەیی مۆزارت لای سالێرییە بۆیە دەڵێ: مۆزارت گیان تۆنرخی خۆت نازانی.. لەهەمان کات دا دان بەو جیاوازییە گەورەیەی نێوان هەردووکیان دەنێ، بۆیە گلەیی لەمۆزارت دەکات کە چۆن گوێ بۆ پیرە کوێرێکی کەمانجەژەن شل دەکات و پێی کاریگەر دەبێت، لە کاتێکا کە خۆت باوکی مۆسیقاو باوکی هونەریت!

بەلای سالێریـەوە ئەم کاریگەر بوونەی مۆزارت بە پیرە کوێرە کەمایەتی‌یەو دەبێ سەرچاوەی هەموو هونەر هەر تەنیا لەلای مۆزارتـەوە هەڵقوڵێ، ئەگەر سالێریش لەجێگەی مۆزارت بوایە ئەوە هەر تەنهـا خۆی لەسـەر کورسی پادشـایەتی مۆسیقادا دادەنیشێت و دەبوو بەو خواوەندەی کە مۆزارتی پێ ناوزەند کردووە.

مۆزارت ـ کە مۆسیقا بەخۆراکێکی رۆحی خۆی دەزانێ و لەپێناو تەنیـا هەست و ویـژدان و حەسانەوەی گیانی خۆی مۆسیقا دەژەنێ رۆژێ لەرۆژان بیری لەوە نەکـردوەتەوە کە بە مۆسیقا ببێت بەخـواوەند، بۆیە خواوەندیش لەپەنای خۆپەرستی و خۆ هەڵ کێشان و ناوبانگیەتی، بەلای مۆزارتەوە بەشتێکی گەندەڵ و هیچ و پووچ هەڵ دەکەوێتەوە، ئەم گەورەیی و خواوەندیەش هەر بە شایەستەی سالێری خۆی دەزانی، لەلاییکی تریشەوە سالێری نرخ و بەها بەپیاوی گەورەی مۆسیقاژەن دەدا و لەلای خۆیـەوە بەگـەورەتـرین مانـاییکی پیرۆزی لەقەڵەم دەدا کە خواوەنـدەو لەسـەر مرۆڤـایـەتیش دەسـەپێنێ کەنـرخی شکۆمەندەکان بزانن، چونکە ئەوان لە ئەوەی ئادەمی نین، وەکو سالێری دەڵێ: لەفریشتەیەکی پاك دەکەن. سالێری خۆی بەر لە هەر کەسێکی تر هەست بەوەستان و مردن و بەجێمانی خۆی دەکات، کاتێکیش کە (کلیۆك)ی سیحراویش سەر هەڵ دەدا، ئەو کاتـە بەجـارێ لەخـۆی یاخـی دەبێـت و بەرهـەمـە هەڵبەوکاوەکانی خۆی دەسوتێنێ. لێرەوە کاتێ چاو لەجیهانی گەورەی مۆسیقـادا دەکـاتـەوە، فێری رژدی و بەرچـاو تەنگی دەبێت، دووچـاری بێ‌هیـوایی و هەنـاسە ساردی و شکستی، نازانی کلیـلی شکـۆمەندی و گەورەیی لای کێیە ؟! بۆیە بەگژ ئاسمان دادێت و هاواری بێدادی دەکات لەپەخشینی بەهرەی پیرۆزو بلیمەتی ئەمر ...

---

سالێری کە لەناو گەرداوی رەش بینی و دەستە پاچەییدا دەژی ، رق و قینەو ئازارەکانی زۆر زیاتر دەبن ، کە مۆزارت بە پیرە کوێـرێکی کەمـانچـە ژەن کاریگـەر دەبێت و دەیهێنێتە لای سالێری بۆ ئەوەی گوێ لە مۆسیقا سیحراویەکەی بگرێت ، کە بەو پەری بێ هێـزی و وورەی روخـاوەوە گوێ لە پیرە کوێـرە دەگرێت، هەقی خۆیەتی کە لە وەدەرنان زیاتری پێ بکاو هەموو رق و قینەو بوغزێکی خۆی بەسەر ئەودا بتەقێنێتەوەو دووچاری هیستریاییکی شێتانە بێت .

سالێرییەك كە لەگەڵ لەرینەوەی هەر تەلێکی مۆسیقادا مردنێك بۆ خۆی دەخوازێ ، تووشی کوێرە گرێیەکی دەروونی ئەوتۆ بووە کە هەژدە ساڵە بەدەستیـەوە دەناڵێ و بەهـۆیەوە هەموو دەوروبەرێکی خۆی بەرەش و تاریکی دەبینێ ، بۆیە چاوەروانی ئەوە دەکـرێت ، مرۆڤێکی نەخۆش تاوانێك بکات و تینوویەتی خۆی بە مەرگی پیرۆزی مۆزارت بشکێنێ ، لەهەمان کات دا تۆڵەی چەنـدان ساڵی ئەشکـەنجەو ئازاری دەروونی ئاڵۆزی خۆی لە ئاسمان و مرۆڤایەتی بسێنێتەوە .

سالێری ـ دەبوا بەهەر رێگەیەك بێت ئەو رقە ئەستوورو گرێ دەروونیەی خۆی بکاتەوە ، سا یا بەکوشتنی خۆی بووبێت (کە پۆشکـین نەی ویستـووە ئەم ئەمـرییە بداتە سالێری) یا بە کوشتنی مۆزارت ، گرنـگ هەڵرشتنی کوێـرە گرێکـانی ئەم مرۆڤەیە .

سالێری . مۆزارت و هونەرو مۆسیقا بەیەکەوە دەبەستێتەوە ، وای بۆ دەچێ ، ئەگـەر مۆزارت خۆری ئێـواران ئاسا لەکەلی هونەر ئاوابوو . ئیتر مۆسیقا ، هونەر ، هەمووی لێك دەترازێ و هەموو شتێ لەگەڵ وون بوونی مۆزارت وون دەبێت و گۆرەپان بۆ سالێری دەمێنێتـەوە ئەسپی خۆی تێـدا تاو بداو ببێ بە شۆرەسواری تاقانەی مۆسیقاو ئەو مرۆڤە شکۆمەندەی کە بە درێژایی تەمەنی خۆی خەونی پێوە دەبینی ، بۆیە سالێری لەناو گەرداوی ئەو بێ‌هیواییە ژیانی لەبەرچاو کەوتووە و دەڵێ :(من ژیـانم زۆر خۆش ناوێ) هەتـا هەنـدێ جار مەرگ بۆ خۆشی دەخوازێ و دەڵێ : (ئارەزووی مەرگ چەند ئازاری دام) یان تا ئەو رادەیە وەك ئینسان نەفرەت لەخۆی دەکات بەجۆرێ کە ژیان و مردنی بەلاوە یەك مەبەست بێت ، ئەوەتا دەڵێ : (جا چییە گەر ئادەمیزاد بمرێ) ؟!

پۆشکین لەم شانۆگەرییەدا دەیەوێت پەنجە بخاتە سەر ئەوە کە بەهـرەو بەخششی مرۆڤ بۆ ژیـان ، هۆیـەکە لەبەتاڵ کردنی غەریـزە دەروونیەکانی مرۆڤ و هەڵرشتنی پاشماوەکانی ، بە پێچـەوانـەشـەوە مرۆڤی دەستـە پاچـەو بێ هیوا ، هەمیشە پرۆژەیـەکە بۆ روخان و مردن و نزیك بوونەوە لەتاوان .. لەم

تێروانینەش دا سوودی لەواقیع وەرگرتووە ، وێنەی مۆزارت و سالێریش یەکێکە لەوان .. هەرچەند کە رووداوێکی مێژوویی بەبەڵگە نی‌یە لە مەسەلەی کوشتنی مۆزارت لەلایەن سالێری‌یەوە ، بەڵام هەندێ وای بۆ دەچن کە پۆشکین لەم بارەیەوە پشتی بەزانیاری کۆمەڵێ گۆڤاری ئەڵمانیەوە بەستووە کە هەندێ بیروڕایان لەم رووەوە بڵاوکردۆتەوە ، لەگەڵ ئەوەش دا (پۆشکین) خۆشی بڕوای بەڕاستی رووداوەکە هەیە ، چونکە تێکڕای بەسەرهاتەکانی ئەم شانۆگەری‌یە پاشماوەیەکی مێژوویی‌یان هەیە ، وەکو ئەو مۆسیقا شیوەناوەیەی کە مۆزارت بەر لەمردنی خۆی دایناوەو سەرچاوەکەی لەم شانۆگەریەدا بۆ ئەو پیاوە دەگەڕێتەوە کە داوا لە مۆزارت دەکات مۆسیقایێ بۆ مەرگی ژنە خۆشەویستەکەی دابنێ .

مۆزارت ـ هەموو تواناو بەهرەی داهێنەرانەی خۆی لەچاوی مەرگی ئەو ژنە نادیارەدا دەتاوێنێتەوە .کەژانی تێکڕای سەردەمە ژان گرتووەکانی تێدا زاوە ، ژانی کۆمەڵێك کە مەرگ تیای‌دا دەبێتە میوانێکی هەمیشەیی ، مۆزارت هەست دەکات کە بەم پارچە مۆسیقایە هەموو ئەو ئامانجەی گەیاند کە خەونی درێژی تەمەنی بوو ، بۆیە لەگەڵ لەدایك بوونی ئەم پارچە مۆسیقایە ، مردن بەشتێکی زۆر ئاسایی تێ دەگات .

پۆشکین ـ ویستوویەتی پاکانەیەك بۆ ئەو مۆسیقا شیوەنی‌یە دابنێ کە مۆزارت بۆ مەرگی خۆی‌و ماڵ ئاوایی دوایی خۆی دایناوە ، بۆیە پاڵەوانێکی نادیار دەخاتە نێوانیان و دەیکاتە تارماییەك ، یان سێبەرێکی بەردەوامی مۆزارت بۆ لەدایك بوون و بەئامانج گەیشتنی ئەو ئاوازە .

**هۆڵ یان شانۆ ؟**

وەك تاقی‌کردنەوەیەکی نوێ دەرهێنەر (کەریم عثمان) تەختەی دیار کراوی شانۆ بەلاوە دەنێ‌و ئەکتەرو بینەر لەهۆڵێك دا تێکەڵ بەیەکتر دەکات ، بەبێ شوێنی دیارکراوی دانیشتن، بینەر تا کۆتایی نیشان دانی نمایشەکە دەوەستێت ، یا لەسەر پەیژەکان دادەنیشێ‌و دەبێتە بەشێك لە پێك هاتووەکانی تری ناو هۆڵەکە .. کە بێگومان دەرهێنەر لەم کارەی‌دا ئامانجی هونەری‌و تایبەتی خۆی هەیەو لەوانەیە ئەم کارە خزمەتی زیاتری نمایشەکەو خزمەتی بینەرانیش بکات .. بەوەی کەواهەر لەسەرەتاوەسەربەخۆیی جوڵانەوەی دەداتێ بۆ ئەوەی بەهاو هەوەسی خۆی بەدووای ئەکتەردا بگەڕێ .. گرنگترین ئەو ئامانجانەکەوا دەرهێنەر لە پێناوی دا ئەم شێوازە بەکاردێنێ بریتین لە:

١. بینەر ئاوێتە بوونێکی کاریگەر پەیدا دەکاو دووچاری ڕوو بەڕوو بوونەوەیەکی ڕاستەوخۆ دەبێت .

٢. ئەم گردبوونەوەیە یەکسانیەك لەنێوان بینەران دا پەیدا دەکات لە هۆڵەکەدا بەهەموو چین و نەژادەکانیانەوە ، یا بەهەموو پایەو پلەیەکی کۆمەڵایەتی خۆیانەوە .

٣. بەستنەوەی بینەر بەم شێوەیە ناچاری ئەوەی دەکات کەوا هەوڵ و تەقە للایێکی فیکری‌و ویژدانی قووڵ بەکاربێنێ ، بۆ ئەوەی تام و چێژێکی تەواو لەبیرو ڕووی جوانکاری‌و ستاتیکیانەی نمایشەکە وەربگرێت .

٤. جێگەو شوێنی نمایشەکە هەلێکی چاك بۆ دەرهێنەر دەخوڵقێنێ بۆ دروست کردنی ئەو حاڵەتانەی کە لەگەڵ حاڵەتی دەروونی کاراکتەرەکانی دا یەکتر بگرنەوە لەلایێك، لە لایێکی تریشەوە یاریدەی فرەوان بوونی بواری گواستنەوەی ئەکتەر دەدات ، بۆ ئەوەی بەهاوهەوەسی خۆی جەستەو دەنگی خۆی بەکاربێنێ بەو شێوەیەی کە پێویستە .

٥. بینەر دەرفەتێکی وای بۆ دەلوێ کەوا ئەکتەر لەچەندان باری جیاجیادا ببینێ .

لەگەڵ یەکەم هەنگاوی دابەزینی‌دا بۆ ژێر زەمینەکە ، بینەر هەست بە لێك داپچڕانی خۆی دەکات لەگەڵ ـ وجود ـ لەگەڵ جیهانی یەکەم داو دەخزێتە ناخ جیهانێکی‌تر کە پێشتر خەونی پێوە دەبینی، جیهانێکی‌تر کەتیای‌دا هەموو گیان و جەستەی بە هەموو تەل و دەمارەکانی مێشك و هەست و بیریەوە دەکەوێتەوە ژێر ڕەحمەتی نمایشێك کەوا بۆ چەند ساتێك لە جیهانی یەکەمی پاك دەکاتەوە ، بۆ ئەوەی کاتێ کە بەسەر پەیژەکان سەرکەوتەوە تەنیا ئەو کاتە لە هەموو کاتێکی تر زیاتر هەست بە تام و چێژو بەهای ئەو دونیا نا ئاساییەی دووەمەوە بکات .

بینەر لەم جیهانە تایبەتیەدا دووچاری نیگەرانی و دوو دڵیەکی نائاسایی دەبێت ،نیگەرانی لە چوونە ژوورەوەو دابەزینی بە پەیژەکان دا، نیگەرانی لە شوێنی وەستانی ، لە کەل وپەلەکانی شانۆ ، لەو رووناکیەی دەپرژێتە سەری . لە روو بەروو بوونەوەی راستەوخۆی ئەکتەرەکان .. ئەم نیگەرانیەیە بینەر دەکات بە بەشێکی زیندوو لە نمایشەکە .. یان بە کاراکتەرێکی نادیار ، کەوا هەر لە سەرەتاوە بیروژێنێو چەندان چەندان نیشانەی پرسیارو سەر سورمانی لەبەردەم دا هەڵقوڵێنێتەوەو داوای وەڵام دانەوەی لێ بکەن ..بینەر بەشێکی زۆری ئەرکی سەرکەوتنی ئەم تاقیکردنەوەیەی کەوتۆتە سەر شانی بۆ ئەوەی وەك ئەکتەرێکی هوشیار بزانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ دەوری خۆیو ئەو سەربەستیەیە دا دەکات کە دەرهێنەر پێی دەبەخشێت ..لەم بەرهەمەدا بە پێچەوانەوە هەندێ لە بینەرانی نمایشەکە ببوونە بەربەستێك لە بەرچاوی ئەوانی ترو بەناوی سەربەخۆیی دانەوە کۆمەڵێکی زۆری خەڵکیان بێ بەش کرد ، لە گەلێ دیمەن و جوڵانەوەی گرنگ، بەتایبەت سەرەتای دەست پێکردنی رووداوی ژوورەکە ، دەرکەوتنی سالێری و گواستنەوەی ، دەرکەوتنی زەلامە رەش پۆشەکە ، کە لەوانە تاوەکو ئێستاکەش هەندێ لەبینەران هەستیان بە بوونی ئەو چەند دیمەنانە نەکردبێ .

بۆیە ئەم تاقیکردنەوەی ژێر زەمین ، تاقیکردنەوەیەکی ترسناك و نوێ بوو ،چەند ئەوەندەی کە جێگەی بڕوای دەرهێنەر بوو بۆ سەرکەوتنی ئەم تاقیکردنەوەیە ، ئەوەندەش مەترسی لەبارچوونی لێدەکرا ، ئەوەبوو لەئەنجام دا بەشێکی زۆر لە خواست و ئاوات و تێروانینی دەرهێنەر ، بوو بە قوربانی ئەو تاقیکردنەوەیە .

**راهێنان**: دەرهێنەر لە شێوازی هەڵس وکەوت کردن و مامەڵەکردنی لەگەڵ ئەکتەردا (وەك لە رۆژانی پرۆ ڤەکردن دا بۆم دەرکەوت) بەشێوازی راهێنانی ـ کرۆتۆفسکیـ یەوە مامەڵەی لەگەڵ ئەکتەردا دەکرد ، بەگوێرەی ئەم پەیرەوو پرۆگرامەوە ، ئەکتەر هەوڵی ئەوە دەدات کەوا خەیاڵی داهێنەرانەو شارەزایی خۆی بەکاربێنێ تا دەرهێنەر بتوانێت سوود لەبەهرەی تایبەتی ئەکتەر وەربگرێت ، بۆ ئەوەی سەربەخۆیی ئەوەی بداتێ ئەو شێوەیە بخوڵقێنێ کە خواستیەتی ، بەبێ نەخشەو کلێشەی داندراو .

وەکو (کرۆتۆفسکی) دەڵێ : دەبێ ئەکتەر خۆی ئەو گیروگرفت و کێشانە دیاری بکات کە دەبنە کۆسپ لەبەردەم تەقینەوەی داهێنانیدا ، کەبێگومان ، راهێنانی ، هۆیەکە بۆ زاڵ بوون بەسەر ئەو کۆسپانە لەناوەوەی ئەکتەر خۆیدا ، چونکە هەرکات ئەکتەر توانی خۆی لەگەڵ ئەو جۆرە راهێنانەدا رابێنێ ، ئەوە بێگومان دەسەڵاتی ئەوەشی دەبێت کە بەسەر ئەو کێشەو گیروگرفتانەش دا زاڵ بێت کە رێگە لە داهێنانی دەگرن .

بێگومان ئامادە کردنی ئەکتەر لەسەر رێبازی کرۆتۆفسکی ـ پێداویستی بە ئەکتەری تایبەت هەیە ، ئەو ئەکتەرەی کە مەرجە بنەرەتیەکانی ئەکتەر تێدا دەدۆزێتەوە ، توانای ئەوەی هەیە کە بەهێزو لێهاتوویی خۆیەوە لەسەر قاچەکانی خۆی بوەستێت و بزانێت چۆن مامەڵە لەگەڵ شانۆو دەورەکەی خۆیدا دەکات

دروست بوونی ئەم جۆرە ئەکتەرە ـ جیاوازانە ـ کە قاڵ بووی تاقیکردنەوەو تەمەنێکی هونەری دەوڵەمەندن ، کارێکی ئاسان نیەو تاوەکو ئێستاکەش بەدەگمەن لەکۆڕی شانۆیی کوردیمان دا ئەکتەری وامان تیادا هەڵ دەکەوێت ، کە دەرهێنەر متمانەیەکی تەواوی بکاتە سەرو لەوە دڵنیا بێت کە توانای هەڵگرتنی پەیامی دەرهێنەری هەیە ، یاخود توانای ئەوەی لەبەردایە بزانێت چۆن لەهەندێ حاڵەت دا پشت بەتوانای تایبەتی خۆی دەبەستێت وەك ئەکتەر ، بۆ ئەوەی شتێکی تازە بە دەرهێنەرو بینەر ببەخشێت ، لەو شتانەی کە هەردوولا چاوەروانی ناکەن .

بۆیە دەرهێنەری ئێمە هەر لەسەرەتاوە کێشەیەك بۆ خۆی دەنێتەوە ئەگەر مەسەلەی ئەکتەر بە مەسەلەیەکی سەرەکی کاری شانۆیی تێنەگات و بەگوێرەی واقیعی ئەکتەر نەك خواستی بۆ ئەکتەر ، هەڵس و کەوت نەکات .



## ئەکتەر لە مۆزارت و سالیری‌دا

هۆی هەرە سەرەکی گەیاندن لەلای دەرهێنەر ئەکتەرە ، لەچوارچێوەی ئەو تەکنیکە تازانەی کەوا لەخزمەتی ئەکتەردان، چونکە ئەرکی دراما لای (ئارتۆ)ش هەر تەعبیر کردنە لەو شتانەی کە ناتواندرێت بەزمان تەعبیر بکرێن .
ئەکتەر لە قوتابخانەی نوێی شانۆییدا بەتواناو لێ هاتوویی خۆیەوە جێگەی گەلێ هۆو کەرەستەی باوی شانۆیی دەگرێتەوە، وەکو ئارایشت ، دیکۆری چەسپاو ، جل و بەرگ ، مۆسیقاو کەرەستەی شانۆیی ، چونکە هەر ئەکتەرە بەجوڵانەوەی خۆیەوە دەبێتە خاك ، دەریا ، مێز ، کورسی ، ئەوەی مەبەستە ، هەروەك دابەش کردنی دەنگ و تێهەڕژانی شتەکان و بێ‌دەنگی شانۆ جێگەی مۆسیقای تۆمار کراوو داندراو دەگرێتەوە .
ئامانجی بنەرەتیش لە هەموو ئەمانە ، ڕزگارکردنی شانۆیە لە شتە ناجەوهەرییەکان ، یا ئەوانەی کەوا لە دەرەوەی توانای ئەکتەرە .

ئەکتەری سەرەکی ئەم بەرهەمە (سلام کۆیی - سالیری)یە ، کەبێ گومان تاقی‌کردنەوەیەکی تازەی ئەزموونگەریانەی وەك مۆزارت وسالیری بۆ ئەکتەرێکی وەك (سلام) تاقی‌کردنەوەیەکی ئاسان نییە ، لەبەر ئەوەی ئەم ئەکتەرە لەوانەیە یەکەم جار بێت لە تاقی‌کردنەوەیەکی ئاوا تازەدا خۆی بدۆزێتەوە ، ئەم جۆرە تاقی‌کردنەوانەش پێداویستیان بە کۆمەڵێ پرۆڤەو ڕاهێنانی سەختی لەش و دەنگ هەیە ، بەگوێرەی پەیرەوو پرۆگرامێکی تایبەتیەوە کە بۆ ئەم مەبەستە دادەندرێت ، جگە لەو خۆ ئامادەکردنە دەروونییەی کە ئەکتەر ئاوێتەی ناخی کاراکتەرو ئەو دەوروبەرو ئاوو هەوایە دەکات کە خۆی لەگەڵ دا ڕادێنێ ، خۆ ئەرك و کاری ئەکتەرێك لە ئەرکی وەرزشە وانێك کەمتر نییە ، کاتێ بە ، لەیاری کردن خۆی لە گۆرەپانێکی یاری کردن ڕادێنێ .. لەلایێکی تریشەوە ئەو گۆڕانە کت و پڕییە بۆ ئەکتەرێك کە قاڵ بووی کۆمەڵێ شێوازی لاسایی کەرەوە بێت ، دیسان هەر کارێکی ئاسایی نییە ، خۆی لەپایەك دا بدۆزێتەوە تیای‌دا هەست بەبڵندی خۆی بکات و وەك ئەکتەرێکی بەرەڵڵاو سەربەست تەعبیر لە هەست و دەروون و خەیاڵی ڕاستەقینەی خۆی بکات ، لەچەنگ هەموو ئەو کۆت و پێوەندانەی دەخرێتە گەردنی ئەکتەرو هەموو وزەو توانایێکی لێ‌بەند دەکەن ، ئەکتەر لەناو سەربەخۆیی ناوەوەو دەرەوەی خۆی‌دا دەتوانێ داهێنان بخولقێنێ‌و شەختەی کۆمەڵێ قالبی داڕێژراو بشکێنێ .
دەرهێنەر لە هەڵبژاردنی ئەکتەرێك بۆ کاراکتەرێکی وەك سالیری ، هەر تەنها ڕەچاوی توانای هونەری دەربڕینی نەکردووە ، بەڵکو ئاگاشی لەوە هەبووە کە بەژن و باڵای ئەکتەرێکی وەك (سلام) بۆ سالیری لەبەرامبەر مۆزارت (کەریم عثمان) دژایەتیەکی دیار دەردەخات بۆ بەرزی ونزمی جیاوازی گەورەیی نێوان هەردوو کاراکتەر - سالیری - بەجووڵەو هەڵپەی سەر شێتانەی پڕ لە ڕق و قینەی خۆیەوە ، پەلاماری دارو دیوارو هەموو شتێ دەدات کە بوونەتە گرێ کوێرەیەکی دەروونی، بەلای ئەوەوە مۆزارت - وەك کاهینێکی پیرۆز بەهێمنی‌و دڵ سپیاتی خۆیەوە ، ڕووناکی و گەش بینی بە دەوروبەری خۆی دەبەخشێ .
جگە لەوەندەش دەرهێنەر لەگەڵ وێنەی تردا تاریکی‌و ڕووناکی‌و ڕەش و سپیاتی نێوان هەردوو کاراکتەری دەربڕیووە ، لە دووری مەودای نێوان هەردوو کیان لە هۆڵەکەدا ، لە چەقی وەستانی هەردوو ئەکتەرو ئاستی بەرزی‌و نزمیان ، لە پەخشینی ڕووناکی‌و ڕەنگی تایبەتی بۆ سەر هەر یەکێکیان ، هەتا لەکۆتایی هاتنی هەردوو کاراکتەر ، دەرهێنەر چارەنووسی سالیری وەك تارماییەك (شبح)ێك لەناو گێژاوێکی ڕەش و تاریك دا وون دەکات و لەژێر قاچەکانی مۆزارت دا لەبیر دەچێتەوە ، بەڵام مۆزارت هەر ئەو مەسیحە پیرۆزە دەمێنێتەوە کە کۆتایی

هاتنی بۆ نیـیـە ، ئەوەتـا سالێری لەچ کونـج و کەلەبـەرێکی مێـژوودا چ بوونێکی نیـیـە ، مۆزارتیش بەتەمەنی ٣٥ ساڵی گەنجیـەتی خۆیـەوە لە گۆرێکی نادیـارو لە گۆرستـانێکی خێرومەندان دا دەنێژرێ ، بۆیە دەرهێنەر چارەنووسی مۆزارت و مەسیحی بەیەکەوە بەستۆتەوە ، مۆزارت حەقی خۆیەتی ببێ بەو مەسیحـەی کە هەتا هەتایەو لەگەڵ دەرچوونی ئێمەش لە هۆڵەکـە داو دووای ئێمـەش هەر ئەو مەسیحە بمێنێتەوە کە ئانـەوەی لەگـەڵ مانـەوەی بوون بەنـد بێت و مرۆڤـایـەتی چاوەڕوانی گەرانەوەی بکات .

ئەوەی پێـویستـە دەربارەی هەردوو ئەکتەر (سلام کۆیی) و (کـەریم عثمان) پەنجەی بۆ ڕابکێشرێت ئەوەیە کە مەسەلەی بەرەو پێشەوە چوون و گۆرانی سەرکەوتووانەو داهێنەرانەی ـ سلام کۆیی ـ شتێکە نکۆڵی لێوە ناکرێت، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا لە ئەنجـامی کاریگـەر بوونی زۆری (سلام) بەدەورەکەی خۆی‌و بەسالێریش دووچاری هەندێ حاڵەتی هەڵچوون هات ، کە‌ ێگـومان ئەو هەڵچوونە لەهاوسەنگی نواندن و جوڵانەوەی ‌ەنگی ئەوی گۆری ، بۆ ئەوەی نوانـدنەکە ئیقاعێکی بەپەلەو بە‌ ـهقی وەربگرێت هەر چەند کە (سلام) پەنای بۆ دەربڕینی ‌ و قیـنـەی سالێری دەبـرد بە هاوارو گرژ کردنـەوەی ‌ـمارەکانی ، ئەوەند لەنرخی دەربڕینە بەهێزەکانی خۆی کەم دەکردەوە ، چونکە شتێکی دیارە کە دەربڕینی دڵ ڕەشی و ڕق و قینـەو بەرچـاوتـەنگی بەمانا هاوارو خۆ پچڕینەوەو چاو زەق کردنـەوە نیـیـە ، بەقـەد ئەوەنـدەی دەربڕینێکی ئاسایی لە جوڵانـەوەو دەنـگ لە حاڵەتێکی پڕ لەدرامـا شتێکی گەورەتر دەگەیەنێ لە هەڵچوونێکی سەرکەشیانە ، بینەر بۆ ئەوە ناگەرێ کە کاری نوانـدنەکە بۆ سەر ئەکتەر چەندە ، ئەوەندەی وێڵی وێنەیەکی تازەی درامیانە دەبێت ، وێنەیەکی ئەوتۆ کە پێشتر هەستی پێنەکردبێ و نەیدیبێ ، هەمان ئەو هەڵچوون و ئیقاعە بەپـەلەی کەوا لایێکی هۆڵەکـەی گرتـۆتەوە، لای سالێری، بە پێچەوانەوە لای مۆزارت ـ کەریم عثمان ـ هەڵ دەکەوێتەوە، کە لاسـەنگی دووەمی نوانـدنـەکـە دەگـرێتە خۆی ، بەوەی کە (کەریم) بە نواندنێکی واقیعیانە ، بە ئیقاعێکی خاو ، بەخۆی‌و چراکـەی دەستی لەژووره تاریکـەکە دەردێت و بە ئەسپایی بەسـەر پەیـژەکـەدا هەڵ دەگـەرێ ، دووای ئەوەی کە دایەلۆژەکانی هەموو هەڵدەرێژێ ، بەهەمان شێوەو بۆ هەمان شوێـنـی پێـشـووی دەگـەرێتـەوە ، بێ ئەوەی هەست بە جوڵانەوەیەك ، یان وێنەیەکی درامی تازە بکەین .

ئەم ساردوسڕیـەی کەریم ـ لەچـوارچێـوەی ڕێبـازی گشتی نمـایشـەکـە دەرمان دێنێ و دووچاری دژایەتیەکمان دەکات لەگـەڵ نوانـدنی لای دووەمی نمـایشەکە ـ سالێری ـ کە بە شێـوازێکی تازەوە ئەکتـەر مامـەڵە لەگەڵ دەورەکەی خۆیدا دەکـات ، جگـە لەوەش هاوسـەنگی ئیقاعی نمایشەکە لەنگ دەکات بۆیە بینەر هەست بەوە دەکات کە سالێری ـ لەرووی نواندنەوە بەسەر مۆزارت دا زاڵە .

گەلێ هۆ هەن لەبەردەم ـ کەریم عثمان ـ ی ئەکتەردا بوونەتە تەگەرە بۆ ئەوەی خۆی لەم بارە نائاساییەدا رزگار بکات ، بەر لە هەمـووشیان ئەوە بوو کە دەرهێنەر خۆی دەوری مۆزارتی دەبینی ، ئەمەشیان بۆ دەرهێنەر شتێکی ئاسان نیـیە ، نمایشێ بگرێتە ئەستۆی خۆی ، بەرژێتە سەر ڕاهێنانی ئەکتەرو دیکۆرو ڕووناکی‌و پێـك هێنانی ئێکسسواری تری شانۆیی ، خۆشی نوانـدن بکـات ، ئەمە جگە لەوەی کە پەرش و بڵاوی توانای دەرهێنـەر دەردەخـات ، لەهەمان کات دا دەرهێنەر ناتوانێت بەتـەواوەتی دەست نیشـانی کەم و کوریـەکانی خۆی بکات لەکاتی نواندن دا یا بە دووای وێنەی جوانتردا بگەرێ ، بەڵکو بەگـوێـرەی پلانێکی دیـارکـراوی دەرهێنان مامەڵە دەکات ، لەهەمان کات دا جۆری کارەکتەرەکە ـ وەك کاهنێکی پیرۆز کە تیایدا دەرهێنەر نیشان دانی ڕۆحی مۆزارتی مەبەست بوو، هەروەهـا ئەو چرایـەی کە بەدەستیـەوە بوو ، هۆیەك بوو بۆ خۆبەستنەوەی ئەکتەر بەچراکەو جووڵەنەکردنی لەترسی شکان و کەوتنی کە خۆی لەخـۆیدا هەڵگـرتنی ئەم چرا ئاگـرییە کێشەیەك بوو لەبەردەم ئەکتەردا .

هەمـان ئەکتـەر (کـەریم عثمـان) هەوڵی ئەوەی دابـوو کە بۆشـاییـەکـانی خۆی وەك ئەکتـەر بە دەنـگ پرکاتەوە ، یان ئەوەنـدەی کەپشتی بەدەنـگ بەستبوو ، ئەوەندە بایەخی بە نواندنەکەی خۆی نەدابوو ، کە بێگومان ئەمەشیان مەترسیەك بۆ (کەریم) پەیدا دەکات ، چونکە خەریکە بینەر لەم بەرهەمەو لە بەرهەمەکانی تردا ، تێری شێوازی دەنگ هەڵبرین و ئیقاع و ئاوازی دەنگی کەریم بێت و پێویستی بە گۆران هەیە ، جگە

لەوەی نابێ ئەکتەر تەنیا پشت بەو بنچینانە ببەستێ کە هەیەتی ، بەڵکو دەبێ لەگەڵ ئەو شتە نادیارانەدا هیلاك و ماندوو بێت کە هەست بکات نەدۆزراونەتەوە ، یان پێداویستیان بە دووادا گەڕان هەیە .

**دەرهێنان :**

لەم بەرهـــەمـــەدا دەرهێنـــەر تێڕوانینی تایبەتی خۆی هەیە لە هەڵبژاردنی ئەو ئامانجەی کەوا لەدەقەکەدا هەڵی دێنجێ ، بەو شێوەیەی کەوا گیانێکی تازە بە بەر دەقێکی دیارکراو دابێنێ ئەوەی ـ کەریم عثمان ـ خواستیەتی لە دوو تەوەری گرنگ دا بۆی چووە :

یەکەمیان : مۆزارت وەك مۆسیقا ژەنێکی گەورە و هەموو خەون و ئاواتەکانی ، لەرێگەی ئەو دیکۆرەی کە سەراپای هۆڵەکەی گرتبۆوە ، بەشریتی مۆسیقاو کەمانی هەڵواسراوو قاوغە کەمان و چەندان نۆتەی هەڵواسراوو قەوانی شکاو ، هەموو ئەو جیهان و دەوروبـــەرە دەگـــەیـــەنن کە هەردوو کاراکتـــەری مۆزارت و سالێری تێدا ژیاون ، لە هەمان کات دا دەربڕینێکی ناوەوەی کاراکتەرەکان دەگەیەنێ .

لێرەدا دەرهێنـــەر ئەوەنـدە بەگەورەیی دەروانێتە ئەو جیهانەو ئەوەندە پێی کاریگەرە ، دووچاری هەڵچوونێکی ئەوتۆی کردووە کە زێدەکاریەکی دیار ، لەزۆر کەرەستەی وا بکات ، چریەکی سەختی پێـــوە دیـــار بێت و وابکـــات کەرەستـــە شانـــۆییـــە زیندووەکانی تریش هەڵپڕوکێنێ .

هەروەها بەکارهێنانی کەرەستەی زۆر ، بەمانا دەوڵەمەند کردنی شانۆییە ، بەقەد ئەوەندەی کە لاوازی شانۆگەری دەگەیەنێ ، بەتـــایبـــەت لای ئەزمـــونگـــەرەکان ، کە دەتواندرێت بەتەنیا کەرەستەیەك هێزی دەربڕینی هەموو کەرەستەکانی تر پرکاتەوە دەرهێنـــــەر هەوڵی ئەوەی دابـــوو ـ فەزای فرەوانی هۆڵەکـــە ـ پرکاتەوە ، بەوەی کە بۆ هەر سوچێك کە ئەکتەری دەچێتە سەر شانـــۆیـــەکی تایبەتی پێك بێنێ ، کەچی ئەم پەرش وبڵاوییە لەبەر گەلێ هۆ کە پەیوەندی بە بینەرو دەرهێنەرەوە هەبوو ، بە ئەنجام نەگەیشت و بوو بەمایەی لێك داپچڕان و بڕینی گەلێ پارچەی زیندوو لەجەستەی نمایشەکە ..

بۆیـــە دەرهێنـــەر دەســـەڵاتی ئەوەی نەبوو کە دەست بەسەر پانتایی فرەوانی هۆڵەکەدا بگرێو لەگەڵ ئەکتەردا بێت ،بەڵکو لەمەدا گرنگی دابوو بە گواستنەوەی ئەکتەر لە گۆشەیەکەوە بۆ گۆشەیەکی،تر نەك وورد بوونەوە لە جولانەوەو ئەدای ئەکتەر، ئەگەرچی لە بازنەیەکی دیار کراویش دا بێت .

ئەوەی بە شێوەیەکی گشتی لەم بارەیەوە لای ـ کەریم عثمان ـ دەردەکەوێت ئەوەیە کە دەرهێنەر گرنگیەکی تایبەتی بەلایەنی جوانکـاری و تەکنیکی شانۆیی داوە ، بەشێکی زۆری هەوڵ وتەقەللای خۆی بۆ ئەم لایەنە تەرخان کردبوو ، زیاتر لەوەی کە پشت بە ئەکتـەر ببـەستێت ، دیارە ئەمەش وەك ئەنجامێکی سلبی ، دووای کۆتـایی هاتنی نمـایشەکە هەڵ دەکەوێتەوە ، چونکـە هەمـوو ئەو جوانکاریەی کەوا لە شانۆدا بەکاردێن ، پێویستە پەیوەندیەکی توند و تۆڵیان لەگەڵ ئەکتەردا هەبێت و لە خزمـەتـی ئەو دابـن ، نەك ئەکتـەر لە خزمـەتـی ئەو جوانکاریانەدا بێت .

تەوەری دووەم : مۆزارت و سالێری وەك مەســەلەیـــەکـــی مرۆڤایەتی :

دەرهێنەر لەم روانگەیەوە هەوڵی داوە ، بیری نووسەرو تێڕوانینی بەرامبەر بە مەسەلە مرۆڤایەتیەکان بگەیەنێ ، ئەو مەسەلانەی کەوا هەر لەگـەڵ بوونی مرۆڤـایـەتی ، شان بەشـانی مرۆڤ تەشەنەی کردووە ، هەوڵی ئەوەی داوە کەوا دژایەتیەکی تیژ لە نێـوان کاراکتـەرەکـان دا پەیـدا بکـات و بەشێوەیەکیش بە ئەنجـامیان بگەیەنێ کە هەرگیز بەیەك نەگەنەوە هەتا دووای مردنیشیان .

رەنـگ: جگـە لە ئەکتـەرو زمـانی دایـەلۆژ ، دەرهێنەر گەلێ کەرەستەی تری دەربڕینی بەکار هێنابوو ، کە دیوی ناوەوەو دەرەوەی کارەکتەرەکانیو دەروبەری تێڕوانینی ئەوانی روون دەکردەوە لەوانە تیشك ، رەنگ ، مۆسیقا ، چرای ئەفسوناوی ، دەمامك ، و چەندان کەرەستەی تر .. لەهەموو ئەمانە دیارتر دەرهێنەر وەك ئاشقێکی رەنگ هەوڵی بەرجەستە کردنی نواندنی ئەکتەری دەدا بە رەنگ ، لە لایێکی تریشەوە ، هەمان ئەو تیشك و رەنگانەی بەکار دەهێنا بۆ دروست کردنی چەند تابلۆیەکی نیگـار کێشی وەك حاڵەتی سینـۆگـرافی بۆ دەرخستنی گیـانی کاراکتـەرەکـانی بە شێـوەیەك کە لەقالبی سروشتی و دیاری کراوی خۆیـانـەوە نەبن و بە وێنەیەکی خەیاڵیو ئەفسوناوی پێش کەشیان بکات ..

هەر دیسان دەرهێنەر لە رێگەی تیشك و رەنگەوە ـ تارمای ـ بۆ

كاراكتەرو كەرەستەكانی خۆی دروست دەكرد ، بۆ ئەوەی ئەو كاراكتەرو كەرەستانە مانای گەورەتر لە خۆیان ببەخشن ، یان ئەو كەرەستە بێ گیان و مردووانە بە رەنگ ببن بە كەرەستەی زیندووی بێزمان ، گفتوگۆ لەگەڵ گیان و هەستی بینەردا بكەن، بە تایبەت تابلۆی دەمامك و مارە هەڵواسراوەكە ، هەروەها تابلۆی مۆسیقا لێدانی مۆزارت لەسەر دیواری هۆڵەكە .

لێرەدا پەیوەندی هونەری نیگار كێشی بە هونەرمەندی درامی روون دەبێتەوە ، بۆ ئەوەی هەردوولا سوود لە تێروانینی یەكتر ببینن ، بەرامبەر بە جوڵانەوە ، دابەش كردنی رەنگ و رێك و پێكی یەكەی بابەتەكان و ئاوێتە بوونیان لەگەڵ یەكتری دا و ، ئەو هێما هاوبەشانەی كە دەری دەبرن ، بۆیە دەرهێنەر ـ بەتایبەت لە شانۆی ئەزمونگەری دا یان شانۆی وێنەیی ، پێویستە لێك نزیك بوونەوەیەكی توندو تۆڵی هەبێت بە نیگار كێشیەوە .

لەهەمان كات دا ئێمە دووبارەی ئەوە دەكەینەوە كە (ئەكتەر) سەرچاوەی راستەقینەیەو ئەكتەر دەتوانێت لە رێگەی تەكنیكی خۆیەوە ببێتە سەرچاوەی ئەو تیشكەی كە لەناخی دا هەڵدەقوڵێت ، گەلێ جاریش ئەگەر تیشك لە چوارچێوەی پێداویستی خۆی دەرچوو بۆ ئەكتەرو بۆ شانۆ ، بەمانا دەبێتە هۆیەك یان كەرەستەیەك بۆ هەڵ خەڵەتاندنی بینەر ، هەروەها دەبێتە پەردەیەك بۆ داپۆشینی توانای راستەقینەی ئەكتەر .

دەرهێنەر بەپلەی یەكەم ئامانجی لە هەڵبژاردنی ژێر زەمینی تیپی شانۆی هونەری نوێی كوردی لەوە دابوو كە لەناو تاریكی یە رەشەكەی ئەم ژێر زەمینەدا سوود لە رەنگ و لە تیشك ببینێ. بەڵام ناشێ هەرگیز شوێن ببێتە پێوەر ،یان هۆیەك بۆ پشت بەستنی دەرهێنەر ، بەڵكو توانای ئەكتەر و تێروانینی دەرهێنەر بنچینەی راستەقینەی هەر كارێكن ، پێویستە ئەو كارەی كە لەژێر زەمین دا پێش كەش دەكرێت ، لە هۆڵێكی تری ئاسایش دا هەمان ئاستی هونەری خۆی هەبێت ، بەڵام ئاخۆ ئەگەر بەرهەمێكی وەك مۆزارت و سالێری لە دەرەوەی ئەم شوێنەدا پێش كەش بكرێت ، هەمان كاریگەری خۆی دەبێت ؟! لە پێودانگی ئەم پرسیارە و ئەم تاقی كردنەوەیە دا دەتوانین توانای راستەقینەی هونەری و بری داهێنانی دەرهێنەر و ئەكتەر دیاری بكەین .

ئەوەی گرنگە بە گوێرەی رەنگەوە ئەوەیە كە هەر رەنگێ مانای فەلسەفیانەی خۆی ببەخشێ ، لەگەڵ رووداو دیوی ناوەوەی كاراكتەرەكان دا یەكتر بگرنەوە ، بۆ نموونە رەنگی سەوزی فەزای نمایشەكە ئەو گەش بینی یە هەمیشەییە دەگەیەنێ ، كە كاراكتەرێكی وەك مۆزارت هەیبووە بەرامبەر بە كارەساتەكانی دەوروبەری خۆی ، هەروەها بەكارهێنانی رەنگی شین بۆ سەر كاسە ژەهرەكەو كەمانە هەڵواسراوەكەی نێوان مۆزارت و سالێری ، لەكاتی ژەهر خواردنەكە ، ئەو دەوروبەرو ئاوو هەوایە پڕ لە خەم و نیگەرانی یە دەگەیەنێ كە باڵی بەسەر كارەساتە سامناكەكەدا كێشابوو ، بەڵام مەسەلەی تاوانە گەورەكە كە كوشتنی مۆزارتە بە رەنگ ، بەشێوەیەكی سەرەكی دەرنەخسترابوو ، بۆ ئەوەی رەنگیش بەشداری لە دەربڕینی تاوانەكە بكات ، كە دیارە رەنگی سووری تێر ، باشترین رەنگ دەبوو بۆ بەرجەستە كردنی ئەو حاڵەتە لەو دیمەنەدا .

لە هەندێ حاڵەت دا رەنگ زیاتر رۆڵی خۆی لە دەرخستنی هەندێ لایەنی هونەری و جوانكاری شانۆیی دا دەبینێ ، ئەگەر رێكەوتنێك لە نێوان رەنگ و جل و بەرگ دا هەبێت ، هەروەهاش بۆ ئەوەی كە جل و بەرگیش وەكو هەر سەرچاوە و رەگەزێكی دیكەی شانۆیی گرنگی خۆی لەم بوارەدا ببەخشێت ..

هەرچەند كە ئێمە لەگەڵ ئەوەدا ین كە دەرهێنەر هەقی خۆیەتی بۆ ساكار كردنی نمایشەكەی و لە پێناو ئەوەی كە بینەر تا رادەیەكی زۆرتر لەكاری نواندنی ئەكتەرەكان وورد بێتەوە ، مەسەلەی جل و بەرگی فەرامۆش كردووە ، كە ئەم ساكاری یە لە بەشەكانی دیكەی وەكو دیكۆر و رەنگیش دا هەر شتێكی چاك دەبوو ئەگەر رەچاو كرابوایە ، بەڵام بۆ كارێكی وەك ئەم بەرهەمە و هەڵبژاردنی ئەم تەكنیكە هونەری یە تێرو تایبەتە ، ئەوەی دەخواست كە دەرهێنەر جل و بەرگی شانۆیی بەكار بێنێ ، بۆ ئەوەی رێكەوتنێ لە تێك ئاڵانی رەنگ و جل و بەرگ و ئەو تیشكانەدا هەبوایە ، كە دەپڕژانە سەریان ، لەهەمان كات دا دەرهێنەر بەو چاوە دەروانێتە سالێری كە مرۆڤێكی رووت و قووتە ، لە مرۆڤایەتی خۆیو لە هونەرەكەشی دا وەكو درەختێكی رووتی بێ گەڵا وایە ، لەوەندەش زیاتر ئەم رووتی یە سالێری زیاتر لە توند و تیژی و رژد بوون و نەفرەت لێكردنەوە نزیك دەكاتەوە .

**چرای ئەفسوناوی و كەل و پەلە شانۆییەكان:**

لە سەرەتاوە پەنجەمان بۆ ئەو چرەو پرییە راكێشا كە سەراپای هۆڵەكەی گرتبۆوە ، گەلێ كەرەستەی وا كەبوون و

نەبـوونیـان وەك یەك بوو ، لەوانـەبوو بەکەم کردنەوەیان ئەو ئالۆزیـیـە لە دیکـۆردا پەیـدا نەدەبـوو ، بۆ نمـوونە پەت و شریتەکان کەوا سنووریکی دیار کراویان بۆ بینەر دانابوو ، لە هەمان کات دا دووچاری تەنگەبەریەکی کردبوون .
دەمامکەکان کە بێجگە لە دروست کردنی وێنەیەکی نیگارکێشی بە تیشـك ، جێگەی دیاری خۆیان نەبوو لە نمایشەکە ، جگە لەوەی کە بەکـارهێنـانی دەمـامکـەکـان خەریکـە دەبێتـە مەسەلەیەکی دووبارە کراوە .
قاوغی کەمـانەکان وەك کەرەستەیەکی ووشك بۆ پرکردنەوەی هەندێ بۆشاییو شاردنەوەی دیوارەکان داندرابوون .
پەیژەکان ـ لە رەسەن دا بۆ ئەوە داندرابوون کە هەر پەیژەیەك و کۆمەڵە بینەرێکی بچێتە سەر بۆ دانیشتن ، کەچی جێگەی تەنیا کەسێکی لێ نەدەبۆوە ، هەموو ئەم کەرەستە زێدانە ، وەك کەم و کوری ناو نمایشەکە دەردەکەوتن .
کەریم عثمـان ـ خولیـای چرای ئەفسوناوی و بەکار هێنانی سینەمایە لە بەرهەمەکانیدا ، وەکو لە بەرهەمی رابووردووشیدا (کەمانچەی رۆچێلد) دیسان هەر سینەمای کردبووە لایەنێکی سەرەکی شانۆگەریەکەی .
من بەلای خۆمەوە ، ئەم شێوازەی دەرهێنەر بە مەترسیەك تێ دەگەم بۆ سەر دەرهێنەرو لەبارچوونی هەندێ لایەنی گرنگ لە بەرهـەمەکانی ، چونکە سینەماو چرای ئەفسوناویش دیسان هەر یەکێکن لەو هۆیـانـەی کەوا لە نرخی گەورەی ئەکتـەرو نواندن کەم دەکەنەوە و ئەم ئامێرانەش لەگەڵ هەست و خەیاڵی ئەکتەرو بینەریش دا یەکتر ناگرنەوە ، بەڵکو هۆیەکە بۆ دەست لێ بەردانی بینەر بە ئەکتەرو شانۆو خزانە ناو جیهانێکی تری بێگیـان کە مەودایەکی دوورو جیاوازیەکی بنەرەتیان لەگەڵ شانۆدا هەیە .
لەم بەرهەمەدا (کەریم عثمان) لەگەڵ تێپەڕ بوونی دیمەنەکان ، دەستی بینـەر دەگـرێت و لەگـەڵ بەرز بوونـەوەی ئیقـاعی شانـۆگـەریـەکـەی خۆی دەبیات ، تا دەیگەیەنێتە بەرزترین لوتکـەی تام و چێژ وەرگرتن ، لە دیمەنی دواییدا ، دیمەنی مردنـی مۆزارت و سالێری و دەسـت پێکـردنـی مۆسـیقـا شیوەنیەکە ، کە هەموو تەقینەوە درامیەکە لەوێوە دەست پێ دەکات و بینەر بە هەموو هەست و یەکە یەکەی دەمارە ووردو درشتەکانیەوە ، لەگەڵ سووتان و دامرکانەوەی خۆیدا دەژی .
ئالەو کاتەدا چرا ئەفسوناویەکە لە دیوارو بانی هۆڵەکە دەدرێت و وەکو ئاو بەگڵپە ئاگرێکەوە دابکەن ، دیمەنەکە سارد دەکاتەوە، بەچەنـد تابـلۆیـەکی مردوو ، بینـەر لە خەیـاڵی قووڵی خۆی دادەپچـرێنێ ، دیمـەنێك کە هەموو هەوڵ و تەقەللاو ماندوو بوونێکی ئەکتەری تێدا کۆ دەبێتەوە ، بەم شێوەیە بینەر دەستی لە ئیقـاعی نمـایشـەکـە بەردەبێ و تێکـەڵ بە رەسم و دارو دیـوارێـکی ساردو سر دەبێت ، تویکـڵی هەمـوو خواست و ئامـانجێـك لە ناو گێـژەڵوکەی تابلۆکان دا وون دەبێت و لە خەیاڵی بینەردا سارد دەبێتەوە .
دەرهێنـەر دەبێت زیرەك بێت لەوەی کە بزانێت چ فروفێڵێ ،یا چ هۆیەك بەکاربێنێ بۆ ئەوەی سەرنجی بینەر بۆ ئەو دیمەنە ، یا ئەو خاڵە دیـارکـراوە راکێشێ کە مەبەستیەتی ، بۆ نموونە کاتێ دەرهێنـەر دەیـویست لە سەرەتـای دەست پێکـردنی نمایشەکە سەرنجی بینەر بۆ ئەو جوڵانەوانە راکێشێ کە لەژوورە تاریکـەکـەی دوواوە دەکـرا ، دەبوا هەموو رووناکیەکی تری کوژانـدایەوەو تەنیا رووناکی ژووری دوواوە داگیرسێنێ ، بۆ ئەوەی بینـەر ناچاری ئەوە بێت سەرنج بپرژێنێتە سەر تەنیا ژوورەکـە ، نەك چرای ژوورەکـە لەگەڵ چرای گۆشەکانی تر داگیرسێنێ و ئەم دیمەنە بەبێ هەست پێکردن بەسەر بینەردا رابورێ .

## دەنگ وبێ دەنگی لە مۆزارت و سالێری دا:

لە کاری شانـۆییدا سیمفـۆنیـاییـك هەیـە پێی دەوتـرێ سیمفۆنیای دەنگ و بریتییە لە (دایە لۆژو مۆسیقا و بێدەنگی) کە دیـارە ئەم هاوکێشـە سیمفۆنیە لەسەر هەرسێ ئەم بنکانە وەستاوە ، یان هەریەکێ لەوان تەواوکەری ئەوی تریانە، گەلێ حاڵەتی واش هەڵ دەکەوێتەوە کە هێزی بێ دەنگی بەسەر دایە لۆژدا زاڵ دەبێت و دەربرینی گەورەتریش دەبەخشێ . بە تایبەت ئەگەر لەناو ئەو بێ دەنگیەدا دەنگی سامناکی خشپەو چرپەو ئیقاعی هێمنانە هات ، لەو ئیقاعانەی کەوا خەیاڵی دوور بۆ بینەر دەرسکێنن ، هەروەها دەبنە ئێستگەیەك بۆ حەسانەوەی بیرو تام و چێـژ وەرگرتن لە چرکە نائاساییەکانی ژیان . ئەم بێ دەنگیە چۆن لای چیخۆف دەکاتە پۆپەی داهێنان و تام وچێژ؟ لەنـاو جیهـانی بێدەنگی شانـۆدا ، گوێت لە ئیقـاعی هەڵ قوزینەوەو چەقانی رێك و پێکی گۆچانی ـ لالۆفانیا ـ دەبێت بۆ

سەر تەختەی شانۆو لە (باغی گێلاس)یش دا لەمدیو شانۆوە
گوێت لە نرکە نرکی تەور وەشانی برینەوەی باغەکە دەبێت ،
ئاواش لە شانـۆی وێنـەدا ، لای (صـلاح القصب) لە مدیو
شانـۆوە گوێت لە دەنگی پێی کۆمەڵێ کەسی نادیار دەبێت ،
گوێت لە ترپەی دڵێکی گەورە دەبێت لە ناخەوە دەت هەژێنێ ،
بۆ ئەوەی دەست بخـەیتـە سەر دڵت ، شتێـك دەبیستی و
بەدووای بینینی دا دەگەڕێی .

ئەم بێ دەنگیـانـە و ئەم دەنگـانە ، ئەم ئیقاعە مرۆڤایەتی‌یە
دەروونیانە ، نهێنی گەورەی لایەنێکی شاراوە لە ژیانی پڕ لە
جەنجاڵ و ئاژاوەی مرۆڤایەتی دەردەخەن ، کە بینەر لە هەموو
شوێنێـك دا ئەم بێ دەنگی‌یـە درامیـەی دەست ناکەوێت بۆ
ئەوەی تیـای‌دا بەناخ جەرگ و پلاشی ژیان دا شۆڕبێتەوە بۆ
جیهانێکی جیا لەو جیهانەی کە تێیدا دەژی .. ئەوەی گرنگ بێت
لە شانۆدا ئەوەیە کە بینەر لە چوارچیوەی ژیانی ئاسایی خۆی
دوور کەوێتەوە بۆ جیهانێك کە لەخەون بچێت نەك لە واقیعێکی
سواو مامـەڵە لەگـەڵ ڕۆحی دووای کۆتایی هاتن بکات ، لەو
شتانەی کە دەیبیستین و هەستی پێ دەکەین ، نەك ئەوانەی
چاومان لە بینینی تێرە ، بەمە لە واقیعیەت دەردەچین و شانۆ
دەکـەینـە هۆیـەك بۆ دەست پێ‌کردنی سەرەتای دووای هەر
کۆتاییەك ، بۆیە بەلای (بیتر بروك)ەوە شارەزا بوونی ئەکتەر لە
ئیقـاع هەمان گرنگی ڕاهێنانی ئەکتەری هەیە لەنواندن دا ،
هەروەهـا (بروك) وای بۆ دەچێت کە ئەکتەر دەبێ هەست بە
گرنگی دەنگ بکات و مەسەلەکە تەنیا وەك تیۆرێك لەمەڕ ئیقاعی
دراماوەتێ نەگاو بەس ...

لە مۆزارت و سالێری‌دا ، ئەم بێ‌دەنگی‌یـە لەنـاو گێژەڵوکەی
ئاژاوەیەك دا لە ئیقاعی بەپەلەو لە یەك دەقی‌دا وون دەبێت ،
تەنیا لەسەرەتای دەست پێ‌کردنی نمایشەکە نەبێت کە بینەر
لەگـەڵ تەلی لەرینـەوە ئامێری مۆسیقای چەلۆوە ، ماوەیەك لە
بێ‌دەنگی‌دا چاوەڕوانی شتێکی نادیار دەکات ، ئیتر هەر لەگەڵ
دەست پێ‌کردنی نمایشەکە تاکۆتایی بواری ئەوەی بۆ نارسکێ
هەنـاسـەیـەك هەڵ کێشێ یا لەبنـاپێچی ئیقـاعـە توندەکە لە
ئێستگەیەك دا خەیاڵێك بیگرێ ، بە تایبەت لەگەڵ سالێری‌دا ،
چونکە دەرهێنەر وەك درندەیەك سالێری پێش کەش کردین ، نەك
وەك مۆسیقا ژەنێك کە هاو دۆستی مۆسیقا ژەنێکی گەورەی وەك
مۆزارت بووە ،کە بێ‌گومان دیارە زێدە ڕۆییەکی زۆر کراوە لەو
کاراکتەرە ، ڕاستە کە سالێری مرۆڤێکی دڵ ڕەش و چاو چنۆك
بووە ، بەڵام هونەرمەندیش بووە .

**تاقی کردنەوەیەکی تر** :

بێ‌گـومان لەبەر تیشکی ئەو پێشکەوتنە فرەوانەی کەوا
ئەمـڕۆکـە کاری داهێنـانی شانـۆیی بەخـۆیەوە دەبینێ‌و لە
ڕوانگـەی ئەو بارو دۆخـەی کە شانـۆی کوردی‌مـان پێ‌دا
ڕادەبورێ ، هەست بەگۆڕانێکی ئیجابیانە دەکەین بۆ تەکان و
هەنگـاو نانی شانـۆی کوردی‌مـان ، بەتـایبەت دووای هاتنە
پێشەوەی چەند شێوازێکی تازە لە دەرهێنان دا کەوا یاریدەی
ئەوە دەدەن کەبـاری شانـۆیی‌مـان هەر تەنهـا لەچـوارچیوە
واقیعیـەکەی خۆیەوە نەخولێتەوە ، بەڵکو هەوڵی ڕەنگاو ڕەنگی
(تنوع)ی خۆی بدات ، بۆ ئەوەی لە نێوان ئەو ڕەنگاو ڕەنگی‌یەدا
بەرهـەمی تازەتـرو بەتام و چێژتر ببەخشێ ، هەروەها دەرباز
بوونێکیش بێت لە چوارچیوەی بەرهەمە باوو سواوەکانیش دا .
ئەوەی لە هەموو شتێك زیاتر مایەی دڵ خۆشی‌و گەش بینی‌یە
بەرامبەر بەمرۆی باری شانۆیی‌مان دیاردەی هاتنە پێشەوەی
کۆمـەڵە دەرهێنـەرێکی لاوە ، کەوا بەر پرسیـاریەتی گۆڕینی
خوێنی شانـۆیی مانیـان گرتـۆتـە ئەستۆ ، بۆ ئەوەی لەسەر
ڕێبازێکی تازە و زانستیانە هەوڵی دارشتنی بناماکانی شانۆی
کوردی‌مان بدەن ، بە دروست کردن و پێ‌گەیاندنی ئەکتەری
لێ‌هاتوو ، بە هوشیارکردنەوەو ڕاهێنانی بینەری تازەی شانۆیی،
بە ڕسکاندنی ئەو بار و دۆخە لواوەی کە یاریدەی دروست بوونی
بۆربـۆریـن و پێش برکـێـیـەکـی پیرۆز دەدات لە نێـوان
هونەرمەندانی شانۆیی ، بۆ ئەوەی بە بەرهەمی پێ‌گەیشتوو ،
بە تاقی‌کـردنـەوەی گەورە بیسـەلمێنن ، کە قۆنـاغێکی تازەی
شانـۆیی لە ئارادایەو داهێنانی پێ‌یە ... بینەر لەڕێگەی ئەم
بەرهەمانەوە دەبێتە ئەو بینەرەی کە هیوای بۆ دەخوازین ..

• د . عونی کرومی دەڵێ : گرنگ لەو تاقی‌کردنەوانە ئەوە نی‌یە کە
مرۆڤ شتێ بزانێ کە نایـزانێ بەڵکـو گرنگتر لەوە ئەوەیە کە
هوشیـار بێتەوە و هەست بە پێداویستی ئەو شتانە بکات کە
دەبێ لە شانۆ و لە ژیان دا فێری بێت ، چونکە هەر تەنها هەست
کردنـە مرۆڤ لە مرۆڤـایـەتی خۆی‌دا بۆ قۆنـاغێکی بڵندتر و
پێشکەوتووتر بەرز دەکاتەوە .

کەریم عثمان ـ یەکێکە لەو هونەرمەندە لاوانەی کەوا بەدرێژایی
تەمـەنی هونـەری خۆی چوار شانـۆگەری دەرهێناوە (ئاسك

١٩٨٠) (كـەللەسـەر ٩٨٢) (كـەمـانـچـەى رۆچێلد ١٩٨٧)
مـۆزارت وسـالێرى ٩٨٨) كە بێگومان ئاستى هونەرى هەر يەكێـك لەو بەرهــەمـانــە ، بە كۆمەڵى هۆى تايبەتى و گشتى بەستـراوەتــەوە ، ، هەر يەكێك لەوان تام و چێژى

قۆنـاغى خۆيـانيـان پێوەيەو ئاستى تواناو تێروانينى تايبەتى دەرهێنــەر لەو قۆناغانەدا هەڵى دەگرن ، بەلام هاوكێشەيەكى چەسپـاو هەيە دەڵێ چەند ئەوەندەى كە مرۆڤ بەهەرم بێنێتە كايـەوە ، ئەوەنـدە زيـاتر هەست بە پێويستى زياترى خۆى دەكات بۆ شارەزابوون و هوشيار بوونەوە ، بۆ ئەوەى برى تواناو بەخششى خۆى هەڵ سەنگێنێ ، هەر كاتێكيش كە مرۆڤ ، يان دەرهێنەر هاوسەنگى خۆى وون كرد ، سەر لەنوێ ، جارێكى تر پێداويستى بە هەوڵ و تەقەللا و كۆمەڵە بەخششێكى تر دەبێت، تا دەگاتەوە ئاستى هاوسەنگى جارانى خۆى .

بەم شێوەيە هونەرمەند بەردەوام دەبێت لە بەدووادا گەران دا ، لە قۆنـاغى ئەم بەدووادا گەرانــە هونــەرمەند هەست بە نوێ بوونــەوەى ووزەو توانــاى داهێنــانى خۆى دەكــات ، نوێ بوونەوەش هەر تەنها شەختە شكاندن نىيە ، بەقەد ئەوەندەى كە بريتىيە لە دۆزينەوە و دانانى چەند ياسايێكى نوێ ، بۆ دياردە هونەريەكان .

لەبـەر تيشكى ئەم بۆچـوونە هەست دەكەين كە هەر كارێكى هونــەرى لەلاى دەرهێنــەرەوە پرۆژەيــەكى تايبــەتىيــە، ئەم پرۆژەيــەش بە چەند بارو دۆخێكى تايبەتيەوە بەندە لەوانەيە گەلێ دەورو بەرو ئاوو هەواى وابرسكێن ، كاريگەريەكى سلبى بەســەر كارێـكى شانــۆيىدا بەجێ بێلن ، لە دەرەوەى ئەو نەخشەو پلانەى كە دەرهێنەر بۆى دەچێت و چاوەروانى دەكات ، چونكە كارى شانۆيى هەر تەنها لەسەر دەرهێنەر نەوەستاوە ، ئەگەر رەگەزە بنچينەييەكانى شانۆيى لەگەڵ دا نەبێت .

دەرهێنەر لە (كەمانچەى رۆچێلد)دا بەم شێوازە نوێيەش خۆى پێش كەش نەكردين كە لە مۆزارت و سالێرى دا هەڵى بژاردبوو، كەچى گەلێ هۆى هونەرى وا هەبوون كە ببوون بە كۆرمگە بۆ سەرنەكــەوتنى بەرهــەمــەكــە ، چونكە سەركەوتنى هەر كارێكى شانـۆيى بەند نىيە بەشێوازێك يان رێبازێكى ديارى كراو ، بەقەد ئەوەندەى كە پەيوەندى بە تواناى داهێنەرانە و تێروانينى گشتى دەرهێنەرەوە هەيە .

## ئەنجام

١. كەريم عثمان ـ بەم بەرهەمە رەنگێكى تازەى لەتواناى هونەرى خۆيەوە پێش كەش كردين ، بەرهەمێك كە كۆمەڵێ تاقىكردنەوە بەخۆيەوە هەڵ دەگرێو دەبنە گەواهيەك بۆ سەلماندنى بەردەوام بوون و بەدووا گەرانى ئەم هونەرمەندە بەجيهانى لەبن نەهاتووى شانۆدا .

٢. دەرهێنەر لەم بەرهەمەدا هەموو هەوڵ و تەقەللاى خۆى بۆ ئەوە بەكارهێناوە كە بينەر لە كەژو ئاوو هەوايەكى جياوازو تازەى وا رابێنێ كە تيایدا هەست بكات رەگەزێكى گرنگە لەرەگەزە سەرەكيەكانى شانۆو فێرى ئەوەشى دەكات چۆن مامەڵە لەگەڵ ئەو شوێنە پيرۆزە بكات كەوناوى شانۆيە، ديارە ئەمەش تاقىكردنەوەيەكى ترە بۆ پێگەياندنى بينەرى شانۆيى هوشيار .

٣. دەرهێنەر لەم تاقىكردنەوەيەدا تواناى شاراوەى ئەكتەر دەتــەقێنيتــەوە بە شێـوەيەك كە وێنەيەكى تازە لەوێنەى داهێنان بە ئەكتەر ببەخشێ .

٤. وەرگێر (محمود زامدار) توانيويەتى زمانى پاراوى دەقەكەو مۆسيقاو ئيقاعى دايەلۆژەكان بەشێوەيەكى ئەوتۆ بپارێزێ كە تام و چێژە شيعرىو دراميە رەسەنەكەى خۆى هەر پێوە بمێنێ .

٥. جارێكى تر مۆسيقاى زيندوو ، ئاوێتەى گيانى نمايشەكە دەبێت و (ئامانج غازى) هونەرمەند هەوڵى ئەوە دەدات بۆشاييەكى گەورە لە مۆسيقاى شانۆيى زيندوو پر كاتەوە .

٦. ئەم هەنگاوەى دەرهێنەر سەرەتايێكە بۆ برينى هەنگاوى گەورەتر لە رێگەى نەش و نووما كردن و گەشە سەندنى شانۆى كوردىمان ، بەووزەى هەميشە داهێنەرانە .

**سەرچاوەكان:**

١. تراث الموسيقى العالمية ـ تاليف كورت زاكس
ترجمة د. سمحة الخولي
تقديم ومراجعة د. حسين فوزي
٢. مسرحيات بوشكين د. حياة شرارة
٣. المألوف واللامألوف في المسرح العراقي ـ عواد علي
٤. تجارب جديدة في الفن المسرحي د. سمير سرحان
٥. الاقلام عدد خاص نيسان /١٩٨٧ .
٦. مجلة (بەيان) العدد ٤/١٩٨٨
٧. مجلة الفن مع الدكتور عوني كرومي

٥

زانیاری

# لێك ترازان و جوولانەوەی کیشوەرەکان

عز الدين بابان
مامۆستای کۆلێجی زانستی زانکۆی سەلاحەدین

تاکو ساڵی ۱۹۱۲ی زاینی ، زانا جیۆلۆجی یەکانو جیۆفیزیکەکان لەو

باوەڕەدا بوون کە زەوی لە ماددەیەکی تواوەوە دروست بووە پاش ساردبوونەوەو کرژبوونەوەی (کە تا ئێستاش هەر لە کرژ بوونەوەدایە) . لە

هەمان کاتدا ئەو توخمە قورسانەی وەکو ئاسنو نیکل بە زەوی‌دا ڕۆچوونو توخمە سووکەکانیش وەکو سلیکاو ئەلەمنیۆم سەرکەوتوونەتە

سەر زەویو توێکلێکی تەنکی ڕەقیان پێك هێناوە . لە ئەنجامی کرژبوونەوەو پەستانی ئەو ماددانەدا چیاکانی سەر زەوی پێك‌هاتوون . ئەم

کرژبوونەوە یەش بووە هۆی بەریەك کەوتنو داچوونی چەند ناوچەیەکی سەر زەوی کە ئەوانیش بوونە هۆی دروست‌بوونی گۆمە دەریالوشەکان

(Oceanic Basin). هەرچی ناوچەکانی تریش کە لە سەروو ئاستی دەریاوە بەرزو دیارو دەرکەوتوو بوون کیشوەرەکانیان دروست کرد

یەکەمین کەس کە هەستی بە جولانەوەی کیشوەرەکان کرد پیلیگرینی بوو . کە لە ساڵی 1808ی زاینی‌دا پێش‌نیارێکی پێش‌کەش کرد لەو




وێنەی (١ - A)

دوو بارە پێك‌هێنانی پانجیا کە پێش 200 ملیۆن ساڵ لەمەو پێش بووە .

وێنەی ( ١ - B )

دابەش بوونی پانجیا پێش 180 ملیۆن ساڵ لەمەوبەر بۆ لوراسیا و گوەندوانا .

وێنەی ( ١ - C )

کرانەوەی دەریالوشی هیندیو ئەتلەنتی پێش 135 ملیۆن ساڵ لەمەو پێش .

...ڕەیەوە . بەڵام کۆنترین بیروباوەڕ داهێنانەکەی ئیسحاق نیوتنە کە لە سەدەمی نۆزدەهەمدا دایهێنا . نیوتن لەو باوەڕەدا بوو کە زەوی پێش 155 ملیۆن ساڵ لەمەوبەر بریتی بوو لە تۆپەڵێکی تواوە . لە ئەنجامی سارد بوونەوەیدا چەند هێزێکی پەستان دروستبوون کە ئەوانیش بوونە هۆی دروستبوونی پاڵەپەستۆ لەسەر ناوچە پەستانی یەکان (قەراغە بێ‌هێزەکانی کیشوەرەکان ، وە ئەو گۆمە قووڵانەی کە پڕ بوون لە نیشتە نەرمەکان . بەڵام لە ساڵی ١٩١٢ی زاینی ئەلفرید ڤاگنەر Alfred Wagner پێش نیارێکی نوێی داهێنا تێیدا دەڵێت کە گوایە لە بنەرەتدا گشت کیشوەرەکانی ئێستای زەوی بریتی بوون لە کیشوەرێکی گەورە کە بە پانجیا (Pangaca) وە گشت زەوی ناو دەبری، دەریالوشی تیسیش Tethyکەوتبووە ڕۆژهەڵاتی (وێنەی ١-A) . لە کۆتایی چەرخی ترایاسیکدا (Triassic) پێش 200ملیۆن ساڵ لەمەوبەر ئەم کیشوەرە بە هۆی هێزی کشانو کشانەوە Tidal) وە بە هۆی هێزی خولانەوە (Rotational) بۆتە دوو بەشەوە ، بەشی باشوور کە بە گوەندوانالاند (Gondwana land) ناو دەبرێ پێکهاتبوو لە ئەفریقیاو مەدەغەشقەرو هیندستانو ئوستراليا و نیوزیلاند لەگەڵ کیشوەری تەوەری خواروو . وە بەشی باکووریش بە لوراسیا (Laurassia) ناو دەبرێ، لە ئەمەریکای باکوورو گریندلاندو یوراسیا (ئەوروپاو ئاسیا) پێك هاتبوو ، (وێنەی ١-B) . ئەم دوو پارچەیەش وەکو خۆیان نەماوون بەڵکو لە پڕ گۆڕانێك بەسەریاندا رووی‌داوە . لە سەرەتادا گۆمی دەریالوشی ئەتلەنتی باکوور کرایەوەو بووە هۆی جیابوونەوەی ئەو دوو پارچەیە . بەریەك کەوتنی ئەفریقیای گوەندوانالاند لەگەڵ بەشی ڕۆژهەڵاتی ئەمەریکای باکوور بووە هۆی دروستبوونی زنجیرە چیاکانی ئەپەلاشیانی خواروو (Appalachian Mountain) . هەروەها بەریەککەوتنی ئەوروپا لەگەڵ سیبیریا بووە هۆی دروستبوونی چیاکانی ئۆرال (Ural) و چیاکانی باشووری ئەوروپا .

لە کۆتایی چەرخی جوراسیکدا (Jurassic) نزیکەی 135ملیۆن ساڵ لەمەوبەر سەرەتای کرانەوەی دەریالوشی هیندیو ئەتلەنتی دەستی‌پێ‌کرد بارستایی هیندستانو تەوەری باشوورو ئوسترالیاش بەیەك جاری لە یەك جیابوونەوەو جووڵاون بەرەو دەریالوشی تیسس ، ئەمەش بووە هۆی سەرەتای داخستنی ئەم دەریالوشە (وێنەی ١-C) .

هەروەها لەم کاتەدا سەرەتای جیابوونەوەی کیشوەری ئەفریقیاو ئەمەریکای باشوور دەستی‌پێکردو بارستایی لوراسیاش بووە دوو بەشەوە . بەشی یوراسیا (Urassic)و بەشی ئەمەریکای باکوور .

لە ماوەی چەرخی تەباشیری (Cretaceous) : سەرەتای جیابوونەوەی مەدەغەشقەر لە ئەفریقیا دەستی پێ‌کرد . وە لە کۆتایی ئەم چەرخەشدا (نزیکەی 65 ملیۆن ساڵ لەمەوبەر) ئەمەریکای خواروو بە تەواوی لە ئەفریقیا جیابووەوەو گۆمی دەریالوشی ئەتلەنتی دروستبوو لە نێوانیاندا (وێنەی ١ - D) .

لە سەرەتای‌چاخی سینۆزویکدا (Cenozoic Era) پێش 50ملیۆن ساڵ لەمەوبەر سەرەتای کرانەوەی گۆمی تەوەری باکوور دەستی پی‌کرد . هەموو کیشوەرەکان بە تەواوی لە یەك ترازان . ئەفریقیا نزیك بووەوە لە باشووری ئاسیا (تورکیاو بەشێکی کوردستانو ئێرانو لەوانەیە چینیش) .

لە ناوەڕاستو کۆتایی سینۆزویك دەریالوشی ئەتلەنتیو هیندی بەفراوانی کرانەوە . ئوستراليا بە یەك جاری لە تەوەری باشوور جیابووەوەو بەرەو باشووری ئاسیا جووڵاو لە خوارووی ئەندەنۆسیا لە گەڵ ئاسیادا بەریەککەوتن . دەریالوشی تیسسیش بە تەواوی داخرا بە هۆی بەریەککەوتنی پارچەکانی ئەفریقیاو هیندستانو پارچەکانی تر لەوانەیە پارچەی چینیش. ئەم بەریەککەوتنە بووە هۆی دروست بوونی چیاکانی ئەلپی (Alps) لە ئەوروپاو چیاکانی کوردستانو زاگروسو تۆرۆسیش لە ئاسیادا . بەریەککەوتنی بارستایی هیندستان بە بارستایی ئاسیا بووە هۆی گۆڕینی پێکهاتنی بارستایی ئاسیاو پاڵنانی نیمچە پلێتی چین بەرەو ڕۆژ



65 Million Years Ago (Cretaceous Period)

وێنەی ( ١ - D )

جیابوونەوەی ئەمەریکای خوارووی لە ئەفریقیا نزیکەی 65 ملیۆن ساڵ لەمەوبەر .




وێنەی (2)

دروست بوونی چیاکانی هیمالایە و کوردستان و زاگرۆس و تۆرۆسیش

هەڵات و دروست بوونی چیاکانی هیمالایاش .

(وێنەی ١ –E) وە (وێنەی 2) .

ڤاگنەر پەنای بردە بەر چەند ڕاستی‌یەك بۆ دانانی پێش‌نیارەکەی و پشت‌گیری لێ‌کردنی . لەوانەش دۆزینەوەی جووت بوونی کەناری دەریالوشی ئەتلەنتی لە دیوی ئەمەریکای باشوورو ئەفریقیا . جگە لەوەش لێك‌چوونی بە بەرد بووەکان و کەڤرو پێك‌هاتنە جیۆلۆجی‌یەکانی (Geological Structures) هەر دوو دیوی دەریالوشەکە ،

هەروەها ڤاگنەر بوونی تلیشێکی گەورەی لە توێکڵی زەوی لە دوو ڕێکی بیژاو بەدی کرد . یەکێکیان جووتە لەگەڵ ڕووی کیشوەرەکان کە لە کەڤری سووك وەکو گرانایت (Granite) پێك‌هاتووە . ئەوەی تریشیان دەکەوێتە قوڵایی ژێر دەریاکان پێك هاتووە لە کەڤری قورس وەکو گابرۆ (Gabbro) و بازەلت (Basalt) و پیریدۆتایت (Peridotite) کە ژێری دەریالوشەکان پێك‌دێنن . هەروەها لێك‌چوونی بە بەرد بووەکانی (Fossils) وەکو میزۆساوروس (Mesosaurus) لە ڕۆژ هەڵاتی بەرازیل و ڕۆژ ئاوای خوارووی ئەفریقیاو چەند شوێنێکی تری جیهاندا . ئەم لێك چوونە هاوجۆرانەش گەڕێنرایەوە بۆ بوونی چەند پردێك لە نێوانی کیشوەرەکاندا لە دوایی‌دا نوقوم بوون . بەڵام ڤاگنەر ئەم لێکدانەوەی بە درۆ خستەوە بە هۆی گریمی ئایزۆستاتی‌یە وە (Isostaty) کە بە پێی ئەم گریمەش ماددەی ئەو پردانە سووك ترن لە ماددەی ژێری دەریا بۆیە ئەم پردانە نوقوم نابن و ناچنە خوارەوە . جگە لەوانە بوونی بە بەرد بووەکانی درەختی گلۆسۆپترس (Glosso pteris) لە هەموو زەوی‌یەکانی گوەنداوانالاندو بەڵاو بوونەوەی بە شێوەیەکی ئاوا زۆر بە ڵگەیەکی گەورەیە بۆ بوونی یەك کیشوەری گەورە .

**دژایەتی و لایەنگیری لە پێش‌نیارەکەی ڤاگنەر :–**

دەرکەوتنی پێش‌نیارەکەی ڤاگنەر ساڵی 1912ی زاینی دەربارەی پێك‌هاتن و پەرەسەندنی زەوی لە کاتی خۆیدا پێش‌نیارێکی نەگونجاو بوو بۆ




وێنەی (3) .

بوونی بەرزاییە درێژەکانی ناوەڕاستی دەریالوش و بەرز بوونەوەی تەوژمە هەڵگرتووەکان .

ترازان و لیك‌دابرانی کیشوەرەکان . چونکە ئەو پێش‌نیارە نەدەگونجا لەگەڵ بۆچوونی ئەو سەردەمەی جیۆفیزیك و جیۆلۆجی‌یەکاندا کە گوایە زەوی لە ماددەیەکی تواوە پێك‌هاتووە پاش ساردبوونەوەو کرژ بوونەوەی .

چەند مەکۆیەك سازکرا بۆ لێکۆڵینەوەی ئەم پێش‌نیارە لەوانە ئەو مەکۆیە بوو کە بۆ کۆمەڵەی جیۆلۆجی‌یەکانی نەوتی ئەمەریکا سازکرا . لەو مەکۆیەدا دژایەتی‌یەکی تایبەتی‌یان بەرامبەر ئەم پێش‌نیارەدا کرد . چەند پرسیارێك کرا لەوانە بۆچی پانجیا نەگۆڕە (نەبزۆکە) لە زۆرترین کاتی جیۆلۆجی‌دا کەچی کت‌وپڕ لە ماوەی چەند ملیۆن ساڵێکدا ئەشکێت و ئەبێتە چەند پارچەیەك و دەست ئەکات بە جووڵانەوە .

لەڕاستی‌دا دژایەتی ئەم پێش‌نیارە ئەگەڕێتەوە بۆ :–

1– هاتنە کایەی ئەم پێش‌نیارە کەوتە پێش کاتی هاتنی . بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا توانی پێش نیاری بوونی پردەکان لە نێوان کیشوەرەکان بەرپەرچ بداتەوە بە هۆی گریمی ئایزۆستاتی (Isostaty) . چونکە ئەو پردانە چڕێکی کەمتریان هەیە لە چڕی بارستەکانی خوارەوە . لەبەر ئەمە نوقوم نابن .

2– لە هەمان مەکۆدا یەکێ لە جیۆلۆجی‌یەکان ڕای‌گەیاند گوایە ئەگەر ئەم پێش‌نیارە ببێتە جێگای متمانەی هەموو لایەکمان ئەوا ئەبێت هەموو زانیاری (70) ساڵ لەمەوپێش بسڕینەوەو سەر لەنوێ دەست پێ بکەینەوە .

3 هەروەها جیۆلۆجی‌یەکانی ئەو سەردەمە ڤاگنەریان بە دوور زانیووە لە جیۆلوجیا چونکە پسپۆری ئەو جیۆلۆجی نەبووە . بۆیە بایەخیان بە پێش‌نیارەکەی نەداوە . بەڵکو دژیشی وەستان . وەنەبێ لایەنگیری ئەم پێش نیارە کەس نەبووبێت لە جیۆلۆجی‌یەکان دۆتویت و هۆڵمز (DoToit and Holmes) بە تەواوی لایەنگیری‌یان لەو پێش‌نیارە کرد . وە تەنانەت هەستان بە چەند گۆڕانێك لە پێش‌نیارەکە . ئەو بڕگەیەی کە لاواز بوو لایان برد . هەروەها هۆی لێك‌ترازان و جووڵانەوەی کیشوەرەکانیان گەڕانەوە بۆ تەوژمە هەڵگرتووەکانی ناو ناوپۆشی زەوی (Mantle) .




وێنەی (4) . بەرز بوونەوەی تەوژمەکان لە ناو ناوپۆش بە هۆی بەرزاییە درێژەکان و دابەزینیان بە جارێکی تر .

**پێش‌نیاری تەوژمە هەڵگرتووەکان :-**

زانایان هۆڵمزو گریگس (Holmes and Griggs) بوونی تەوژمە هەڵگرتووەکانی‌یان بە پێویست زانی بۆ گواستنەوەی گەرمای ناخی زەوی‌دا . وە کەندەکە درێژ ڕۆکانیشیان (Trenchs) بە شوێنی دابەزینی ئەم تەوژمانە بۆ ناو ناوپۆشی زەوی‌دا دانا . کە ئەمیش ئەبێتە هۆی ڕاکشانو ژێربوونەوەی توێکڵە زەوی دەریالووشەکان بۆ خوارەوە . ئەمڕۆ پێش‌نیاری تەوژمە هەڵگرتووەکان دەستێکی باڵای هەیە لە لێکدانەوەی تیۆرەتی جووڵانەوەی کیشوەرەکان . چونکە دەرکەوتووە کە ئەم تەوژمانە پتر ئەبن بەرەو ڕووی زەوی ئەمەش گەورەترین‌و نوێترین دۆزینەوەی لێکۆڵینەوەکانی ژێری دەریا . (وێنەی 3)

بە بەکارهێنانی شێوە تۆپۆگرافی‌یەکانی ژێر دەریا بە درێژایی (40000) میدا دەرکەوت کە بەرزایی‌یە درێژرۆکانی ناوەڕاستی دەریالوش (— Mid Oceanic Ridge) لایانداوەو درزی بردووە بە هۆی هێزی شەتەکەوە (Tension) بە گۆشەیەکی وەستاو لەسەر تەوەری بەرزایی‌یە درێژرۆکان (وێنەی3) . هەروەها آ . بولارد ڕایگەیاند کە ڕۆیشتنی گەرمایی لە نێوانی بەرزایی‌یە درێژرۆکانی ناوەڕاستی دەریالوش زۆرو ناسروشتی‌یە . ئێستا زۆربەی زانایانی دەریالوش ڕێك‌کەوتوون لەسەر پێش‌نیاری بەرز بوونەوەی تەوژمەکان لەناوناوپۆشەوە بەهۆی بەرزایی‌یە درێژرۆکانو ڕاکێشانی ژێری دەریا بۆ ناو ناوپۆشدا بە هۆی دابەزینی ئەم تەوژمانە بۆ جارێکی تر پاش سارد بوونەوەیان. (وێنەی 4) . ئەگەر دانمان بە بوونی کیشوەرێکی گەورە داناو پارچە پارچە بوونی لە ماوەی‌میزۆزویکدا ئەوا جیۆلوجی‌یەکان دەتوانن میژووی ئەم شکاندنانەمان بدەنێ سیستەمی ئێستای تەوژمە هەڵگرتووەکانی جێگیربوونی شێوەی گشتیان تاکو میزۆزویك پێشان ئەدات لەکۆتایی‌دا لێکۆڵینەوەکانی کۆنە مەگنەتێك دەریان خستووە کە کەڤرە ئاگرینی‌و نیشتەجی‌کان دەنگە مەگنەتیکیان تێدا ماونەتەوەو پارێزراون لە ناو ئەو کەڤرە ئاگرینانە پێش سارد بوونەوەیان وەلەناوئەوکەڤرە نیشتەجی‌کانیش پێش ڕەق بوونیان . ئەو دەنگە مەگنەتی‌کانە شێوەیەکی ڕێك وەرئەگرن بەگوێرەی مەگنەتیکی زەوی لەو شوێن‌و کاتدا . وە بەراورد کردنی ئەو کۆنە مەگنەتی‌کانەی ناو کەڤرەکانی لێواری کیشوەرەکان دەری‌خست کە هەمان شێوەو ڕێڕەویان هەیە ئەمیش سەلماندنێکی بەهێزە بۆ یەك‌بوونی ئەو کیشوەرانە لە کاتی ساردبوونەوەی کەڤرە ئاگرینەکان وە یان‌لە کاتی ڕەق‌بوونی کەڤرە نیشتەجی‌کان .

o

# نەخـۆشـی ترس

# Phobia

o

**دکتۆر عادل حسین عبدلله**

o

**نەخـۆشی ترس نەخـۆشیەکی دەروونی‌یە کە بەشێکە لە کۆمەڵە نەخۆشی نیوروسز (Neurosis )و بریتی‌یە لە ترسان لە شتێك ـ مرۆڤێك ـ ئەندیشەیەك ـ ئاژەڵێك یان کارێك . ترس زۆر جۆری هەیە وەکو :ـ**

**ترس لە شوێنی داخـراو (Claustrophobia )تـرس لە شوێنی کراوە (Agarophobia )کە پێشی ئەووترێ ترسی کۆمەلایەتی Social Phobia**

**ترس لە شتی چەپەڵ و . بچووك (Mysophobia ) ترس لە ئاژەڵ (Alorophobia ) ترس لە نەخۆشی لوەپیسە (Can cerophobia ) ترس لە نەخۆشی سیفلس (Syphilophobia ) ترس لە ئازارAlgophobia) هەروەهـا گەلێك جوری تری ترس هەن وەکو :ـ**

**ترس لە مردوو ـ ترس لە خوێن ـ ترس لە شوێنی بەرز ـ ترس لە شوێنی قووڵ ـ ترس نە تاریکی ـ ترس لەچەك ، کە لێرەدا بواری باس کردنیان نی‌یە .**

**لە نەخـۆشی ترسدا کەسایەتی (الشخصیة Personal ) ناشێوێ و ناگۆڕێ .**



## هۆیەکانی ترس

ترس گەلێـك هۆی هەن ، هەندێکیان هەر لە منالّیەوە دەست پێئەکەن و هەندێکیشیان لە گەورەکاندا ، لەم هۆیانەش :ـ

**١ ـ هۆی دەروونی (Psychogenic )** ئەم هۆیە زۆر گرنگە وەهەر لە منـالّیـیەوە ترس دروست ئەکـات وە هەندێ جاریش وا لە گەورەکان ئەکات کە تووشی ترس بن . ئەم هۆیە گەلێك تەنگ و چەڵەمەی دەروونی ئەگرێتەوە وەکو نارەحەت کردنی دەروونی و مانـدووکـردنی دەروونی منـالّ ئایـا لەبـەر نەهێنـانـەدی پێویستەکانی منالّەکە خۆی ، یان لەبەر نارێکی رەووشتی دایك و باوك لەگـەڵ منـالّدا ، یان ناکوکی لەناو خێزاندا و ئەنجام نەدانی ئاواتەکانی منالّ وای لێئەکەن کە بۆ تۆڵەسەندنەوە لەم هەڵوێستە بە شێوەیەکی نائاگا(لاوعي Involuntary )تووشی ترس بێت و ئەم ترسە هەر لە منالّیەوە دەست پێئەکات و لەگەڵیدا گەشە ئەکات و رەنگە بە درێژایی ژیانی لە ژێر سێبەری ئەم ترسەدا بژی و هەردەم هەست بکا بە نائاسایشی (Unsafe ) و نائارامی (Insecurity ) .

**٢ ـ هیستیریا (Hysteria )**

هیستیریا بریتی‌یە لە نەخۆشیەکی دەروونی کە بەزۆری تووشی ئافرەت دەبێت‌وتاکو ئافرەت بێهۆش دەبێت بۆ ماوەیەکی کەم سەرنجی خەڵکی تر رابکێشێت لەبەر پەستیەك کە لە ناخی دەروونیدا هەیە بۆیە ئەم نەخۆشانە سەرەرای هیستیریا تووشی نەخۆشی ترسیش دەبن.

**٣ ـ فێربوونی ترس (Learning Phobia )**

فێربوونی ترس بە شێوەیەکی سەرەکی لە منالّدا بەدی ئەکرێ . دایك و باوك زۆر جار لەبەر بەرژەوەندی منالّ و خێزان، منـالّ ئەتـرسێنن بە چیرۆك یان چەنـد شتێکی ترسناك وەکو درندەو کارەساتی سامناك ، لێرەدا ئەم هەستە لەناو دەروونی منالّدا ئەمێنێتەوە و منالّ لەگەڵ ئەم ترسەدا ئەژی وە بەدرێژایی ژیانی لێی رزگار نابێت ئەگەر زوو چارەسەر نەکرێ .

دەورووپشت (دەورووبەر ) بەدەوری خۆی کارێکی زۆر ئەکـاتـە سەر چاندنی ترس لە دەروونی منالّدا کە لە باری گەشەکردندایە .

**٤ ـ بەزۆر ترسان (Obssessional Phobia )**

گەلێـك کەس دوچـاری ئەوە ئەبن کە بیروبـاوەرێکی تایبەتی بەسـەریاندا زالّ بێ کە ناتوانن لەم بیروباوەرە رزگاریان بێ بەهیـچ جۆرێك ، هەرچەندە ئەم بیروباوەرەش جێگای ترس و گومـانـە ئایا بۆ هەموو خەڵك یان تەنها بۆ ئەو کەسانە . ئەم نەخۆشانە خۆیان باش ئەزانن کە مرۆڤ نابێ لەم بیروباوەرانە بترسێ بەلّام لەهەمان کاتیشدا لە ترسی ئەم بیرانە رزگاریان نابێ واتە وەکو شتێکی بەزۆری وایە .

## نیشانەکانی نەخۆشی ترس

نەخۆش جگە لە هەست کردن بەترس لەکاتی بەرەنگار بوون بەو روخسارەی کە لێی ئەترسێ گەلێك نیشانەی تری لێ دەرئەکەون کە مەرج نی‌یە هەموویان
بەیەکەوە و لە هەموو نەخۆشێکدا دەربکەون ، لەم نیشانانەش

- زیاد کوتانی دڵ (Tach Cardia)ـ تەنگ بوونی هەناسە هەناسە سواربوون (Dyspnoea)ـ هەست کردن بە کوتانی دڵ (Palpitation) ـ بەرزبوونەوەی تەوژمی خوێن ـ ڕەنگ زەرد هەڵگەران ـ ئارەقە کردن (Sweating)و نەخۆش ئەشێوەیٚ و بریاری نامێنیٚ و تەوژمێکی گەرم بەلەش دائەروات و ماندوو ئەبێت تووشی پەستیەکی زۆر ئەبێت و هەموو لەشی ئەلەرزیٚ .
گەلێك جاریش نەخۆش تووشی ئەوە ئەبێت کە نازانی لە کوێیەو ؟ کاتێکەو ناوی خۆی لە بیرئەچیٚ ، واتە کات و شوێنی لە بیر ئەچیٚ یان لێی تێك ئەچیٚ (Depersona lization And Derea liza-tion)

## چارەسەرکردنی ترس

چارەسەرکردنی ترس جێگای ڕەزامەندی نیە لەبەر ئەوەی ئاسان نیە وەکاتێکی زۆریشی ئەویٚ ، هەندیٚ جاریش مەحاڵە ، بۆیە گەلێك لەم نەخۆشانە ناچار تامردن لەگەڵ ترسدا ئەژین . هەنگاوەکانی چارەسەرکردنی پزیشکی بریتین لە چارەسەرکردنی دەروون و ڕەوشت و هەندێك دەرمان :ـ

## چارەسەرکردنی دەروون (Psychotherapy)

چارەسەرکردنی دەروون بوارێکی فراوان پێکدێنی لە چارەسەرکردنی زۆربەی زۆری نەخۆشی‌یە دەروونیەکان ، لێرەدا نەخۆش ئەبیٚ هەفتەی دووسیٚ جار بچێتە لای پزیشکی دەروون (Psychiatrist) کە هەڵئەسیٚ بە ڕوونکردنەوەی جۆری ترس و هاندانی نەخۆش بۆ بەرەنگاری کردنی ترس تا بەرە بەرە نەخۆش خۆی لەسەر ئەم ترسە رابێنێو بەرەو چاکتر بچێتە. چارەسەرکردنی دەروون ئەکریٚ بە دوو بەشەوە :ـ

چارەسەرکردنی دەروونی یاریدەیی (Sup – Portive) کە ماوەیەکی کەمی ئەویٚ ، چارەسەرکردنی دەروونی قوڵ (Deep Psycho therapy) کە ماوەیەکی دوورو درێژی ئەویٚ . زۆر جار نەخۆش سوود لەم چارەسەرکردنە وەرناگریٚ چونکە بێزار ئەبیٚ لە چونە لای پزیشك بەبەردەوامی .

## دەرمان

دەرمانی ئارامکەر (مهدئ Tranquillizer)
تا ڕادەیەك یارمەتی نەخۆش ئەدات لەمانەش وەکو :ـ ڤالیوم (Valium) (٥)ملغم ڕۆژی سیٚ جار بەشێوەی حەبیان.ناردیل (Nardil) (٥) ملغم ڕۆژی سیٚ جار بەشێوەی حەب گرنگی دەرمان کەمترە لە چارەسەرکردنی دەروون و ڕەووشت بۆ نەخۆشی ترس .

## چارەسەرکردنی ڕەوشت (Behaviour therapy)

لێرەدا نەخۆش ئەبیٚ بە بەردەوامی بچێتە لای پزیشکی دەروون، ئاواتی پزیشك بریتی‌یە لە کەم کردنەوەی نیشانەکان یان نەهێشتنی ترس زیاتر لە چارەسەرکردنی هۆی ترس. ئەم چارەسەرکردنەش ئەکریٚ بە دوو بەشەوە :ـ

### ١ ـ لابردنی ترس (Desensitization)

لابردنی ترس ئەکریٚ بە نیشان دان و نزیك کردنەوەی شتی یان ڕوخساری ترسناکی تایبەت بە نەخۆش لەلایەن پزیشکی دەروون تا بەرەبەرە نەخۆش بتوانیٚ ڕاهاتنێك بەرامبەر بەو شتەی کە لێی ئەترسیٚ پەیدا بکات و بەئاسانی بەرەنگاری بیٚ .
ئەم چارەسەرکردنە تا ڕادەیەکی زۆر یارمەتی نەخۆش ئەدات و زۆریان چاك ئەبنەوە .

### ٢ ـ چارەسەرکردنی ڕەووشتی بەزۆری (Flooding)

ئەمەش بریتی‌یە لە پێچەوانەی لابردنی ترس ، لێرەدا نەخۆش نزیکەی (٢) سەعاتی ئەویٚ بۆ ئەم جۆرە چارەسەرکردنە نەخۆش بە تەنیا دائەنریٚ لە ژوورێك دا ، وە ئەوشتەی کە لێی ئەترسیٚ لە پڕێکەوە ئەخرێتە نزیك نەخۆش و دەرگای ژوورەکە دائەخریٚ ، ئینجا نەخۆش وای لێدیٚ کە ئیتر ترسی نەمێنیٚو چاك بێتەوە ، هەنگاوەکانی ئەم چارەسەرکردنەش بە نەخۆش ناووتریٚ ، بۆیە ئەم چارەسەرکردنە زۆر سوود ـ بەخش نی‌یە . گەلێك جاریش نەخۆش ئەبردرێتە ئەو شوێنەی کە لێی ئەترسیٚ وە لەویٚ بە تەنیایی جیٚ ئەهێڵریٚ بۆ ماوەیەکی کورت پاشان بەرەبەرە بۆ ماوەیەکی زۆرتر تا چاك ئەبێتەوە .

سەرچاوەکان


1– Psychiatry By K . L johnson 1983 .

2– Psychiatric Emergencies by Dr . F . Aldabag .

3– Postgraduate medicine 1982 – Page 502 .




شانوگەریی ژمارە

بەشی دووەم و کۆتایی

# مەت .. شتێ بکە

نووسینی : عەزیز نەسین
وەرگێڕانی : سەعید یەحیا



## دیمەنی سێیەم

شتەکان وەکو خۆیانن .. دیوارەکە نەبێ رەنگی بۆرە .. مەت لەبان کەنەپە پاڵی داوەتەوە ، وەك چۆن لە دیمەنی یەکەمدا بوو .. کلێر لە تەنیشتی دانیشتووە . نلك مەتاڵە دەکاو بەتەك رادیۆوە دانیشتووە گوێ لە مۆزیقا دەگرێ .. دەتواندرێ لەسەر شانۆ نامە بەردەوام بن بێئەوەی رەنگی دیوارەکان بگوردرێ»

نلك : «وادیارە لە مەتاڵە کردن بێزارە .. کتێبەکەی دەستی فرێی سەر مێزدەدا» مەسەلە هەڵەی تێدا نەکراوە ؟ مرۆڤێك ئەم شیعرانە هەڵبەستێ چۆن دەمرێ ؟ سەرەرای ئەوەیش کەلەگەڵ ئەو بۆرە پیاوانەی دەرەوەدا دەژێ ؟

رێ : «رادیۆ دادەخا» دادو یەکسانی نیە .. ئەوانەی دەرەوە بژین و خاوەنی ئەم مۆزیقا دڵگیرەش بمرێ ؟

مەت : من خەوم دێ

رێ : بنوو

مەت : لەوەتەی دکتۆرتان بانگ کردووە خەوم بزرکاو

نلك : باشە .. مەنوە ..

مەت : دەڵێم خەوم دێ .. دەمەوێ بنووم «بێ دەنگی» بۆچی ئەم دکتۆرە تان بانگ کرد ؟

نلك : بانگیشمان نەکرادیە ، هەر دەهات

مەت : بۆ ئەوەی بمکوژێ .. وانیە ؟ دکتۆرتان هێناوە بمکوژێ .. دەتانەوێ بمکوژن !

رێ : ئێمە دەتکوژین ؟ تۆ خۆت بە دەستی خۆت ، خۆت دەکوژی .. بەپێچەوانە ، ئێمە دەمانەوێ بژی

مەت : بۆ ؟ چ قازانجێکی ئێوەی تێدایە ؟

نلك : کورم لەبەر خاتری ئێمە لەبەر خۆت

رێ : تۆ نەبی ئێمەش ژیانمان نابێ .

کلێر : ئێستا تێگەیشتم .. منیش ئەگەر بەژنو باڵام نەش و نەما نەکا دکتۆر فەحسم دەکا .

رێ : کچم تۆ هێشتا زۆرت ماوە

کنیز : مەت .. بۆ ناتەوێ تێ بگەی ؟ پێویستە شتێ بکەی ..
مەت : «توورەیە» هیچ ناکەم .. ئەوەی شتەنایکەم .. وازم‌لێ بێنن ..
ـیەو بمرم ئێوە چکارێکتان بەمنە .. بۆ دکتۆرتان هێنا ؟ ئەوە ئەم هەستەی
ـە نێوانماندا بڵاوکردەوە ..

ـث : نەخێر ئەمەمان پێشتر بیستووە
مەت : ـبیستوومانە بەڵێ .. بەڵام ناومان لێ‌نەناوە .. ئەم هەستەبێ ناوە ..
هەرشتێ ناوی نەبێ بوونیشی نیە .
ـث : شتێکی هەبێ ناویشی هەیە
مەت : بەرلەوەی دکتۆر بێ ناوی نەبوو .. مانای بیرو هۆش لە ئەوەوە فێر
ـبووین

کنیز : «لەبەر خۆیەوە» ئێستا بەتەواوەتی تێ‌گەیشتم .. «بۆمەت» مەت ..
پێت وایە شت هەبێ ناوی نەزانین ؟
مەت : «بۆباوکی» ئێوە ئەگەر حەز بەژینی من دەکەن ، رۆژێکی تەمەنتان
. یا تەنها سەعاتێکی تەمەنتانم پێ ببەخشن ..

نك : ئەگەر یەك ملیۆن ساڵیش بژیم دەقیقەیەك چیە نایبەخشم .. نەك تۆ ..
بەکەسی نادەم
ری : دەمانەوێ بۆ ئێمە بژی
مەت : «راکشاوە هاوار دەکا» بۆ دکتۆرتان بانگ‌کرد ؟ بۆ «شانۆ تاریك
دادێ .. دکتۆرو مەت لەژێر تیشکی رووناکی دان »

دکتۆر : «بەزەردەخەنەوە» خاتر جەم بە مەت .. من بەرلەوەی بانگ
بکرێم ، لە خۆمەوە دێم .. دەزانم کەی دێمو بۆکوێ دەچم ... ئەوە
نەبوو کە بەژنو باڵات لەنەش‌و نما کەوت هاتم ؟!
مەت : « هاواردەکا » هەموومان دەمرین .. ئەی تۆ ؟
دکتۆر : کورێژگە .. من بوونم نیە .. بوونی من بە بوونی ئێوەیە .. لەگەڵ
ئێوەدا دەژیم .. ئەگەر ئێوە نەبن منیش نابم . وەکو خۆر .. وەکو مانگ ..
وەکو ئاو .. وەکو هەوا .. تۆ ئەگەر خۆت بوونت نەبێ ، ئەم شتانەیش
سەبارەت بەتۆ بوونیان نیە .. تا تۆ بژی ، منیش دەژیم ..
مەت : بەڵام خۆرو رووناکی وئاوو هەوا هەرگیز هەن ..
دکتۆر : ئەگەر نەدەبووی ، هەستت بەبوونیان نەدەکرد.. منیش‌هەر لەو
شتانە دەکەم .

مەت : بۆ .. بۆ هاتووی ؟ چۆن خۆت کوتایە نێوانمان ؟ بۆ خۆمان بەکرو
بێ‌دەنگی دەمردین .. بێ ئەوەی هەست بەجەنابت بکەین کۆچمان دەکرد
..
دکتۆر : رەنگە مردووبی

مەت : مردنم ناوێ .. نامەوێ بمرم .. بەر لەوەی بمرم
دکتۆر : «لەسەر خۆ» بێگومان بەرلەوەی بمری .. ئەگەر مردووبای
نەدەترسای .. ئەگەر هەستت بەترس کرد مانای ئەوەیە هێشتا زیندووی .
مەت : ئەوانەی دەرەوە ناترسن ؟

دکتۆر : ئەوان هیچ نازانن .. ئەوان نەدەژین و نە دەمرن .. هێشتا تامو
چێژی ژیانیان نەچێشتووە .. ئەوان لە نێوان مردنو ژیان دان .. لە تاریکی
دەژین بەڵام هەستی پێ ناکەن ..
مەت : بۆ ؟

دکتۆر : لە تاریکیدا لەدایك‌بوون .. تێیدا دەژین .. تاریکی لە دەروونیان
دایە .. هەموولایەکیان تاریکە . چاونوقێنێك چیە لەتاریکی دوور
ناکەونەوە .. ئەگەر لەتاریکی رزگاریان بێ ئەوانیش داوای ژیان دەکەن .
مەتـم : «هاوار دەکا» ژیانم دەوێ .. دەمەوێ بژیم «وەك بگری وایە »
دەمەوێ بژیم
دکتۆر : دەزانم .. دەزانم دەتەوێ بژی ، ئەگینا دەرو دیواری
ئاودەسخانەو چێشتخانەت نەدەنووسی !
مەت : «بەترسەوە» دەتزانی منم ؟ کێ پێی گوتی ؟
دکتۆر : تۆ بێ ئەوەی هەستی پێ بکەی ، ئارەزووی ژیانت هەیە .. مەت
.. من دەزانم تۆ چیت دەوێ

مەت : چۆن دەتوانم بژیم ؟ یارمەتیم بدە «لەبان کەنەپە ئەژنۆ دەداتەوە »
دکتۆر:بەمە دبێ ، هەر کە بیر لە ژین‌و مردن بکەیتەوە ..
مەت : چۆن بیریان لێ بکەمەو ؟ من هیچ نازانم
دکتۆر : کەمێ لە دەروونی خۆتدا بمێنەوە
مەت : ناتوانم .. لە خۆم دەترسم
دکتۆر : دەستت بخەرە سەر نێوچەوانت
مەت : ناتوانم .. ماندووم

«شانۆ تاریك دەبێ .. پاشان رووناك دەبێتەوە .. مەت دێتەوە وۆخی جاران‌و هەر وەك لە هەوەڵی دیمەنی یەکەمدا لەبان کەنەپە پاڵ کەوتووە .. کلێر بەتەکیەوە لە بان عاردەکە دانیشتووە»

ری : کلێر .. بۆ وا مەلولی ؟ لەبەر ئەوەیە چونکە لە ژوورەوە مایتەوە ؟

کلێر : نەخێر .. بە ئێرە ڕاهاتم ..

ری : ئەی چۆن دەچیتە دەرەوە ؟

کلێر : نامەوێ بچمە دەرەوە .. نەخێر نارۆمە دەرەوە ..

مەت : « بەتوورەیی» کەس ئارەزووی دەرچوونی نیە .. ئەوانەی دەرەویش نایەنە ژوورەوە .. لەیەکتر نزیکن .. کەچی زۆریش دوورن .. «تەماشای باوکی دەکا» دەترسن .. هەمووتان دەترسن ..

نلك : تۆ بۆ وا توورەی ؟

مەت : ژیان .. ژیان .. بۆچی دەژیم ؟

نلك : بۆ خۆت دەژی .. تا قەرزەکانت بدەیتەوە .

«هەڵدەستێتە سەرپێ‌و پەنجەکانی درێژ دەکا» شت هەیە ، باپیرانم لە پەنجەکانمەوە وەری دەگرنەوە .. چاوەکانم قەرزارن .. پێ‌و دەم‌و گوێم ، قەرزاری کەسانێکن دەیانناسم‌و نایانناسم .. بۆیە دەبێ منیش بژیم و قەرزەکانم بدەمەوە

مەت : منیش بەقەرزاری دەهێڵیەوە .. وانیە؟

نلك : بەهەر حاڵ تۆش قەرزاری .. لەو کاتەی لەدایك بووی قەرزت کەوتە سەر .. یا دەبێ بژی‌و قەرزەکانت بدەیتەوە . یانیش دەبێ بمری .

مەت : «هاوار دەکا» بەسە .. بەس .. باسی مردنم بۆ دەکا ! . من بە ئەندازەی مردن حەز بەژیان دەکەم ..

نلك : شتی چاکە .. زۆر چاکە .. ترسی گەیشتێ «بەکەیمەوە» بۆ ئەوەی بژی ، دەبێ شتێك بکەی .. تۆ دەترسی .. رۆڵەگیان دەترسی وانیە ؟ مانای ئەوەیە شتێك دەکەی شتێکی زل دەکەی ولەبەر ئەو شتە دەژی .. بەیەکەوە دەژین .. مەت ئەو کاتە هەموو کەس دەتناسن .. نێوت دەچێتە ناو کتێبەوە .. پەیکەرت بۆ دەکەن .. تۆ دەترسی وانیە ؟ لەمردن دەترسی .. کەواتا بۆ تۆڵە لەمردن ناسێنیەوە ؟ بۆچی بەرەنگاری نابێتەوە ؟ دەی مەت دەی .. هەر چەندەی بیر لە مردن بکەیتەوە ئەوەندە ژیانت دەوێ .. دەی مەت .. دەی ..

کلێر : دەی مەت .. دەی

مەت : «هەڵدەستێتە سەرپێ» بۆبژیم ؟ راستە دەترسم .. پێشان نەدەترسام .. بەڵام ئێستاکێ دەترسم‌و تادێ ترسەکەم پتر دەبێ .. بۆ ؟ قەرزی ئەو کەسە بدەمەوە کە پێش سەدان ساڵ سفری دۆزیەوە .. پێیەکانم قەرزی ئەو کەسە دەدەنەوە کە بەر لە بیست هەزار ساڵ هاتە دنیاوە .. کە قەرزە دانەوە ، ئەوانەی دووای خۆم قەرزارم دەبن .. قەرزاریان دەکەم .. قژی یەکێك .. چاوی یەکێکی دیکە قەرزی منیان تێ دەکەون ، بمناسن‌و نەمناسن .. قەرزێکی درێژی وەك گوریس . باشە هیچیان بەمن گوت : مەت بزانە چمان بۆکردووی ؟ گوتیان : ئەم شتانەت دەوێن یانا ؟ هیچیان گوت ؟

نلك : هەڵدەستێ‌و بەرامبەر کوری دەوەستێ» تۆ دەترسی ..

مەت : منیش تەبای ئێوە .. بەلاّم خۆ ئەوانەی دەرەوە ناترسن ..

نلك : ئەوانی تێ‌ناگەن

مەت : بۆتێ ناگەن ؟

نلك : ناهێڵن بچینە دەرەوە .. زانستیان گەرەك نیە .. نایانەوێ فێری‌بن .. هیچیان ناوێ .. ئەوان توانای ژیانیان نیە چونکە هیچیان گوێ لێ نابێ .

مەت : «بیردەکاتەوە» باشە ئەگەر پەیکەرێکیان بۆ دامەزراندم کەلله

سەرێك خۆی لە تاق هەور بدات و قاچەکانی لە ناو دەریابن .. پاشان چ ؟ باوکە من لەوە چ سوودێك وەردەگرم ؟ من نەبووم .. من ئەوکاتە دەبم .. بەخوا هیچی تێ‌نەگەیشتم ..

نلك : مەت .. تۆ هەی دەژی .. بەر لەوەی بمری هەست بەژیت دەکەی

مەت : نامەوێ ..

نلك : ترست گەیشتێ .. تۆڵە لە مردن دەسێنیتەوە .. تۆ بتەوێ‌و نەتەوێ ناچاری بژی .. پێویستە قەرزەکانت بدەیتەوە خەڵکی دیکەیش قەرزارت بن .

مەت : «تەماشای دەست‌و پێی خۆی دەکا» ئەمانە دەستی کێن ؟ ئەم پێیانە ملکی چەند سەد هەزار کەسن ؟

نلك : تۆ لە پێشبرکێ دابەشداری ..

ری : ژیان گەلێ خۆشە .. کوانێ مرۆڤ لەمە گرنگتری هەبێ ؟! ژیان

لایەنە بەرزەکەی هیواو ئاواتمانە .. (شۆ لە پلیکانە دادەبەزیێو لە شوێنەکەی خۆی دادەنیشیێو سنووقەکەی دەخاتە سەر مێزوخەریکی کەرکردن دەبێ»

ری : کلێرگیان ، ئەو دوگمانەی پێویستت بوون ، رەنگە لە کۆنە جلەکانی من‌دا هەبن ..
کلێر : «پێشی دەکەوێ» نەخێر .. نەخێر .. سپاس نامەوێ

ری : شینی ئاسمانی
کلێر : قوربان نامەوێ
ری : دوگمەکان دوو کونەن
کلێر : جاقەی چی‌یەکا ..

ری : ئاخر شەش پەرن
کلێر : نام گەرەکە
ری : دوگمەی هەلأشن
کلێر : زۆر سپاست دەکەم .. بەخوا نامەوێ ..
ری : «بۆنك» ئەریێ نك ئەوە تۆ نانووی ؟

نك : «هەڵدەستێتەوە» بابنووین «نك‌وری بەرەو پلیکا نەکەدەچن»
ری : «بۆمەت» تۆ دەمێنی ؟
مەت : بەڵێ
نك : ئەی تۆخەوت دەهات !
مەت : خەوم نایێ .. نانووم
ری : ئەی تۆ کلێر ؟

کلێر : منیش خەوم نایێ
ری : کچم ژوورەکەت ئامادەیە .. شەوتان باش رۆڵەکانم ..
کلێر : شەوباش

«ری‌و نك دەچنە دەرەوە .. کەمێ بێ دەنگی .. شۆ سنووقەکەی لە دەست دەکەوێ .. دەستی دەگێڕیێو بەهۆی پەتەکەی بەملیەوە ، دەیدۆزێتەوە»
کلێر : خۆشەویستەکەم «مەت دەستێکی لە قژی کلێرەو دەستی دیکەی

لەسەر شانیەتی» خۆشەویستەکەم کە دەرەوە بووم هەمیشە بیرو هۆشم لای تۆ بوون ..
مەت : ئەی لای دوگمەکانیشت نەبوون؟

کلێر : ئەوەی چوو .. چوو . دوگمەم هەر لەبیر نەماون .. بۆ ئەوەم بوون بەکراسەکەمی بدرووم‌و لەبەر چاوی تۆ دەبەری کەم‌و جوانبم .. کەچی دوگمە کانی دەرەوە تەنها یەك کونیان هەبوون ..
مەت : ئەی ئەوانی ئێرە ؟ سەیرە ..

کلێر : دەستە خوشکێکم دوو ساڵی تەواو بە دووای یەك ئانە دەرزی‌یە .. دەستە خوشکێکی‌ترم بۆیەی رەنگ سەوزی قژی دەست ناکەوێ ..
مەت .. من ئێستا تێ‌گەیشتم .. بۆ ئەوەی مرۆڤ بژی ، دەبێ شتێك بکا .. من ئەوەندەم بەسە لە تۆ نزیکم .. کە زەماوەندمان کرد ..
مەت : کە زەماوەندمان کرد ، منداڵمان دەبن

کلێر : کۆمەڵێ منداڵ «مەت ماچی دەکا ، کلێر دەپەشۆکێ» مەکە . باپیرەت لێرەیە ..
مەت : باپیرەم نابینایە .. لەو رۆژەی من خۆم ناسیوە ئەویش هیچ نابینێ ..
کلێر : وریابە .. لەسەرخۆ ..
مەت : کەریشە

«ئەو کاتەی مەت کلێر ماچ دەکا کچەرووی وەردەگێڕیێو تەماشای شۆ دەکا»

کلێر : واهەست دەکەم باپیرەت گوێی لێمانە «مەت کلێر لەباوەش دەگریێو ماچی دەکا» بزانە چۆن سەیرمان دەکا ؟ .. وامەکە .. باپیرەت دەما نبینێ .. وا مەکە «سەری دەخاتە سەر شانی مەت» مەت :: باسی ماڵەکەی خۆمانم بۆ بکە ..

مەت : وەکو ئەو ماڵانەیە ، کە بەسەر کارتی جەژنانەوە چاپ کراون .. ماڵێکی بچووکی خنجیلانە ..
کلێر : «لەسەر شێوەی ئەو» دەکەوێتە سەر روبار ؟
مەت : ئا بەڵێ .. روبارێکی زێوینی ساف‌و بێ‌گەرد .. ئاوەکەی لەبەر

مالی ئیمەدا کۆ دەبێتەوەو دەبێتە دەریاچەو مراوی تێدا مەلە دەکەن ..
کلێر : «شنسی» یش مراوی روا دەکا وانیە ؟ «وەك لەگەڵ منداڵ بدوێ»
وامەکە شنسی وامەکە .. ئەو دارەی دەستت فڕە بدە .. مراوی ڕاو مەکە
مەت : «بەپەشۆکاوی» شنسی کێ یە ؟
کلێر : ئۆە .. نازانی ؟ شنسی کوری نۆبەرەمانە
مەت : «کلێر ماچ دەکاو ئەویش بانگی کورە دەکا» شنسی گیان واز لەو
مراویانە بێنە .. بەگوێی دایکت بکە .. «جارێکی تریش کلێر ماچ دەکا»
کلێر : ئێ وامەکە .. ئاخر باپیرەت دیارە ..
مەت : کچی هیچ نابینێ ..
کلێر : واهەست دەکەم بما نیبنێ .. گوڵ بەبەر پەنجەرەکانمان دەروێ «وەك
بانگی منداڵ بکا» لیمی .. وامەکە .. گوڵ مەوەرێنە ..
مەت : کێ ؟ لیمی کێ یە ؟
کلێر : خۆ تۆ هیچ کامیان ناناسی ! لیمی کچی گەورەمانە .. «هەردووکیان
دەدەنە قاقای پێکەنین .. مەت کڕ دەبێتەوە کەچی کلێر بەردەوامە ..
مەت دیقەتی کلێر دەدا کەچی هەر پێدەکەنێ»
کلێر :«حەز بەدیقەتەکەی مەت ناکا» هاچیە ؟ چ ڕووی داوە ؟
مەت : هیچ ..
کلێر : چیبوو پێم بڵێ.. تۆ لە دەروونتدا ئازاردەدەرێی ..
مەت : «بیری بڵاوە» نازانم تۆش وای یان نا ؟ ئەو دەمو چاوەی پێدەکەنێ
وا دەزانم پەیکەری کەللە سەرێکی زلەو وردە وردە گۆشتی لێ
هەڵدەوەرێو تەنها ئێسقانێکی رووت دەمێنێتەوە .. تۆش وای ؟ ئەگەر پێ
بکەنێ وای دەبینی ؟
شۆ : «لەناکاو هەڵدەستێتە سەرپێو دەست لە بۆشایی دەکوتێو هاوار
دەکا» هێی .. نك .. نك .. «مەتو کلێر ترسیان دەگاتێ . مەت
بەدەست ئیشارەت دەداتە کلێر بێ دەنگ بێ» ری .. کەس لێرە نیە ..

**مەت و کلێر هەڵدەستنەوە شۆ لەگەڵ خۆی دەدوێ وا دەزانێ کەس لێرە نیە.**

چاکە خۆم بە تەنهام «شێوەی دۆوانەکەی دەگۆڕێ» . دەستی چەپی
دەخاتە سەر سنگی ، وەك منداڵ لە باوەش بگرێو بە دەستی ڕاستی
دەیلاوێنێتەوەو دەست بۆ دەمو چاوی درێژ دەکا» دەستەکانم .. دەستە
جوانو خۆشەویستەکەم .. دەستە داهێنەرەکەم .. دەستی تاوانبار ..
دەستی ئازار دراو .. دەستی دروستکردن .. دەستی روخاندن .. بازووم ..
ئەنگوستم «دەست لە کولمەی دەکوتێ» من دکتۆرم ، من دڵدارم .. کەللە
سەری پیر لە بیرو هۆشم .. بازووم .. ئەنگوستە خۆشەویستەکانم . ئێوە
ئەنگوستی کێن ؟ هێ چەند ملیۆن ئادەمیزادن ، بەر لەمن هاتوون ؟ لەکێ
جیابوونەتەوەو تێکەڵاوی من بوون ؟ پێ یەکانم .. پێ یە جوانەکانم ، چەند
هەزار ساڵە لە خەڵکی ترەوە جیابوونەتەوەو لە گەڵ من یەکتان گرتۆتەوە ؟
قاچەکانم ، مایەی ژیانم .. «کەشۆ دەست لە ئەندامەکانی لەشی دەکوتێ ،
مەتو کلێریش هەمان جووڵانەوە دەکەن ، بێ ئەوەی هەستی پێ بکەن ..
لاسایی شۆ دەکەنەوە»
چاوەکانم .. چەند هەزار ساڵە تەماشای پێشەوە دەکەنو چەند هەزار ساڵە
ئاور لە دوواوە دەدەنەوە ؟
کلێر : «بەچرپە» مەت باپیرەت دەبینێ !
شۆ : گوێچکەکانم .. گوێچکەکانی دەبیستن .. پاش چەند ساڵ گوێتان لە
دەنگم دەبێ ..
کلێر : «بەچرپە» مەت .. باپیرەت شتی گوێ لێ دەبێ !
شۆ : ژیان چ خۆشە .. ئەم تەنە .. ئەم گەرمی یە .. وای چەند خۆشە
ژیان «وەك تامی شتێ بکا لێوەکانی دەجووڵێنەوە» مژبە دووای مژ تامی .
ژیان بچێژە .. با لەم ژیانە خۆم تێر بکەم .
کلێر : (بەچرپە) کورە مەت ، باپیرەت دەبینێ !!
شۆ : هەرچی دەنگ هەیە ، هەستیان پێ دەکەم .. هەست بە هەموو
شتێك دەکەم .. بەڵام قارسم بەو کەسەی لە دووای منەوە دێو دەژی
«دەست لە بۆشایی دەکوتێ» ژیان خۆشە .. ژینی نەمر ، مرۆڤ لێی تێر
ناخوا ..
مەت : «لەناکاو هاواردەکا» باپیرە ..
شۆ : «دەترسێ» مەت .. ئەمە .. بۆچی تۆ لێرە بووی؟
مەت : «بەگریان شۆ دەگرێتە باوەش» باپیرە ..
شۆ : «بەتوورەیی» کەی ئەمە راستە ؟ بەدەنگی بەرز پرسیارم کرد ، ئێرە
کەسی لێ یە ، بۆ نەتگوت لێرەم ؟
«بەشێوەیەکی ئاسایی قسە لەگەڵ یەکتر دەکەن»
مەت : دەمەوێ بژیم .. منیش ژیانم دەوێ !
شۆ : زۆر باشە .. فەرموو شتێ بکە .. شتەکە بچووك بێ زل بێ .. شتێك
بکە دەژی
مەت : ئەی ئەوانەی دەژین وهیچیش ناکەن ؟
شۆ : ئەوان دزن .. کاتو ساتی خەڵکی تر دەدزن
کلێر : ئەی ئەوانەی دەیانەوێ شتێ بکەنو ناتوانن ؟
شۆ : کچم ئەوانیش شتێك دەکەن .. ئەوان بە قۆناغی ئامادەکردندا تێپەر
دەبن «دەست بۆ وێنەی دەستە راست درێژدەکا» ئەوانەی سێ سەد ساڵ
ژیانو لە پێناو ژیانی «بیرب» هەوڵو تێکۆشانیاندا .. «دەست بۆ وێنەکەی

تر درێژدەکا» چەند سەر ساڵ ئادەمیزاد لەپێناو دابین کردنی کەرەستەو تفاق
ژەنرال «کیش» رەنجیان دا ؟ «دەست بۆ وێنەی سێیەم درێژ دەکا» لە
ماوەی دوو سەد ساڵدا جیهان «هن»ی هێنایە کایەوە .. تۆش شتێ بکە
دەژی ..
مەت : هەرکەسەی دەیگری ، دەڵێ شتێ بکە .. مەت شتێ بکە ..
کەچی کەسیش پێم ناڵێ چ بکەم ؟
شۆ : ئەوەی دەیزانی چ باشە ، بۆ خۆی دەکاو بە تۆی ناڵێ .. دەبێ خۆت
بزانی چ دەکەی .. ئەمەیە جەنگ‌و زۆرانبازێی ژیان . کەس ناتوانێ
یارمەتیت بداو کۆمەکت بکا . رۆڵە شیرینەکەم ، مەت گیان .. بەندە
ناتوانێ ساتە وەختێکی خۆت بداتێ .. بەدەست من نیە ناتوانم .. «کری‌و
بێ دەنگی » ئێرە شوێنی مرۆڤی بێ‌کەڵکی لێ نابێتەوە .. یەکێ مافی ژیانی
نەبێ ، بە چ‌مافێ چرۆی درەخت‌و لق وپۆپی بەهار ببینێ ؟ بە چ مافێك
تامی ئاو بچێژێ ؟ چۆن گوێ بداتە نەغمەو دەنگی بلبل‌و باڵندە ؟ ئەوەی
بێ‌کەڵك‌و گەندبێ ، کۆتایی دێ و تەواو دەبێ .. دەتوێتەوە .. تەنها ئەو
کەسانە دەمێنن کە شایانی ئەوەن بژین ..
مەت : ئەی تۆ باپیرە ؟
شۆ : من ئەم سنووقەم هەیە .. قوتوو پڕ دەکەم .. «بە دەنگی بەرز» ئەو
هەموو ساڵە لە پێناو ژیان کۆشش دەکەم . ئەم قوتووەم دروست کردووە ،
بۆ ئەوەی لەمردن رزگارم بکا . ئەگەر کەسێکی وا دەبوو لە مردنم رزگار
بکا .. توند هەردوو قاچەکانیم دەگرت‌و لێی دەپاڕامەوەو دەمگوت :
رزگارم بکە .. تکات لێ دەکەم رزگارم بکە .
مەت : نابێ .. ناکرێ .. بە هەر حاڵ تۆش دەمری .. ئا بەڵێ دەمری .
شۆ : بۆ ئەوەی نەدۆڕێنم .. پێویستە شەڕ بکەم .. شەڕێکی بێ پایان‌و
کۆتایی .
مەت : چۆن ؟ بێ کۆتایی‌یە ؟
شۆ : هەندێك دۆڕاندیان .. کەسی وا هەن لە دووری سێ‌یا پێنج هەزار
ساڵەوە گوێیان لە دەنگیانە .. ئەوانە سێ پێنج هەزار ساڵە دەژین .. کۆیان
نازی ؟ گۆشتەکانیان ؟ئێسقان‌و خوێن‌و دەمارەکانیان ؟ ئەوانیش بە ئاسنی
قەنارەی قەسابەوە هەڵواسراون .. ئەوەی ژیانی دەوێ‌منم‌و هەر دەژیم .
کلێر : دەمزانی تۆ گوێت لێ دەبێ .. دەمزانی دەبینی ..
شۆ : رۆڵەکانم یارمەتیم بدەن . مەت تۆ چاوم‌بە ، بابە چاوەکانی تۆ ببینم ..
کلێر تۆش گوێم بە . بۆ ئەوەی هەرچی تاریکی‌ی دنیا هەیە لەم قوتووەی
بکەم‌و خەڵك لێی رزگار بن . من بۆیە کەرم تا گوێم لە پاڕانەوەی کەس
نەبێ .. بۆیە کوێرم نەبادا ئەوانەی دەگرین ، بیا نبینم .. مەت ئەو کەسەی

شتێکی نەکردووە مافی ژیانی نیە .. وانیە ؟ کەی ڕاستە ئەوانەی دەرەوە
هەموویان هەر تێکرایی بژین ؟ وانیە ؟
مەت : کلێر .. پێویستە شتێ بکەم
کلێر : بەڵێ وایە ، پێویستە شتێ بکەی
«شۆ لە شوێن خۆی دادەنیشێ .. خەریکی قوتووەکەیەتی .. دەنوێ‌و بە
ئاگا دێتەوەو خەریك دەبێ‌و دووبارە دەنوێ‌و هەڵدەستێتەوە .. مەت‌و کلێر
بە جووتە لەسەر کەنەپەکە دادەنیشن»
کلێر : دەژین‌و خانوێکی قنجیلانەشمان دەبێ .. بەرپەنجەرەکانی یەکپارچە
گوڵ‌و گوڵزار دەبن‌و روباریشی لەبەردەم تێپەڕ دەبێ‌و مراوی تێدا مەلە
دەکەن . «شنسی» ڕاوە مراوی دەکاو «لیمی» گوڵ دەچنێ .: ئێمەش ..
مەت : «قسەکانی دەبڕێ» نە «شنسی» ڕاوی مراوی دەکاو نە «لیمی» گوڵ
دەرنێ ..
کلێر : بۆ ؟ منداڵ نین ؟ خۆ هەر ئەوان وانین .. منداڵ هەموویان بزێوو
عەجووڵن ..
مەت : نەخێر .. نەشنسی دەبێ‌و نەلیمی ..
کلێر : «پەشۆکاوە» مەت بۆچی ؟
مەت : «بەتووڕەیی» چونکە ماڵمان نابێ ..
کلێر : بۆ ؟
مە : «تووڕەتر دەبێ» چونکە ئەسڵەن زەماوەند ناکەین ..
کلێر : چ دەڵێی ؟ زەماوەند ناکەین ؟
مەت : ئابەڵێ .. زەماوەند ناکەین .. لەبەرچی ؟ چونکە دەمرم ..
کلێر : نەخێر پێویستە بژی ..
مەت : هیچی وام نەکردووە .. چیم کردووە ؟ شایانی چیم ؟
کلێر : «خۆی دەهاوێتە سەر مەت‌و دەگری» شتێ بکە .. مەت شتێ بکە

مەت : «هەڵدەستێتە سەرپێ‌و پیاسەدەکا .. شۆ هێشتا نوستووە» من
دەمرم‌و ئەم پیرەمێردەش دەژی .. من ؟ چاوم دەبینێ کەچی دەمرم‌و ئەم
پیرەمێردە ئاخر شەرە دەژی .. ئەمە ئەو مافەیە کە قسەی لێوە دەکەن ؟ ئەم
پەیکەرەی وا گیانی ووشك بۆتەوە .. ئەم پێستە ڕەقەی چەرمەو
بەئێسقانەکان نووساوە .. ئەو دەژی‌و منیش دەمرم ! ئەمەیە عەداڵەت ؟
«کلێر لەباوەش دەگرێ‌و ماچی دەکا» نەخێر دەبێ بژیم .. کلێر گیان دەژیم‌و
زەماوەند دەکەین‌و خانوێکی بچکۆڵانەمان دەبێ .. شنسی بەدووای
مراوی ڕادەکاو لیمی گوڵ دەچنێ .. تۆش وەکو دایك ڕەفتاریان لەگەڵ
دەکەی .. کلێر من دەژیم .

کلێر : چۆن ؟ .

مەت : چۆن ؟ «دەست بۆ شۆ درێژ دەکا » تەماشای ئەم پیرەمێردە بکە ، خەوی لێ کەوتووە .. ئێستاکێ قوتووەکەی لە چنگ دەردێنم ..

کلێر : «سەرسامە» نەخێر ئەوە ناکەی

مەت : «بڕیاری داوە» بەخوا دەیبەم .. تۆش پێت وایە دەبێ منی بیست ساڵان بمرم و ئەم گیان لەبەرە رەق و تەقەش بژی ؟

کلێر : مەت ، ئەوە نەکەی ... !!

مەت : ئەو ماوەیەی ژیا بەسیەتی .. بزانە چۆنی لە دەست دەردێنم .. ئینجا دکتۆر دێ و دەڵێ : مەت ی بەرێز ، چیت کردووە ؟ وەڵامی دەدەمەوەو دەڵێم : فەرموو ئەمە قوتووی رووناکی و تاریکییە دروستم کردووە ..

کلێر : دزی لە باپیرەت دەکەی ؟

مەت : بەزۆر دەیبەم .. مافی ئەوەم هەیە لەئەو زیاتر بژیم «پەتەکە لە ملی شۆ دەپچڕێنێ و قوتووەکە دەباو پەتەکە لە قاچی دەبەستێتەوە».

کلێر : «دەست بەگریان دەکا» مەت .. تکات لێ دەکەم ئەم کارە مەکە .. وا مەکە ، ، پاڵ بە کلێر دەنێ و دەکەوێ .. کلێر بەدەنگی پڕ لە ئاەو ناڵە دەگری» وامەکە مەت وامەکە .

شۆ : «بەئاگادێ .. بەدووای قوتووەکەیەتی .. نایدۆزێتەوە .. هەڵدەستێتە سەرپێ و هاوار دەکا» مەت .. بردت .. وانیە .. مەت .. قوتووەکەم بدەرەوە . «دەست لە شوێنی مەت دەکوتێ وەك .. بیبینێ وایە .. دەیەوێ بیخنکێنێ .. مەت ، بەترس و لەرز لە قوژبنی پەنجەرە نزیك دەکەوێتەوە» تۆ دزی .. «مەت شۆ پاڵ دەداو دەکەوێ» .

شۆ : «ئازاری پێ دەگا» بیبە .. بۆ تۆ بێ .. دەتوانی بیدزی بەڵام زەحمەتە من بدزی .. منێك بژیم بەتۆ نادزرێم .. با قوتوو بۆ تۆ بێ «نك و دکتۆرو ڕی و کنیاتا بە پەشۆکاوی دێنە ژوورەوە»

نك : ئەمە چیە ؟ مەسەلە چییە ؟

ڕی : ئەم هەرایە چییە ؟ ئەوانەی دەرەوەن هاتوونە ؟

شۆ : «سەری بەرزدەکاتەوە» هیچ نیە .. کەوتم .. خۆم لە مێزەکەدا و کەوتم ..

دکتۆر : «بۆمەت» جەنابی مەت .. پێویستە خۆت ئامادە بکەی .. بەرە بەری بەیان تاقیت دەکەمەوە .. ئامادەبە ..

***

## دیمەنی چوارەم

«هەمان دیکۆر .. تەنها دیوارەکان نەبن ، رەنگیان کراوەترن .. کات دووای نیوەی شەوە .. لە کۆتایی دیمەنەکەدا لە پەنجەرەوە رووناکی سپێدەی بەیان دەردەکەوێ و شانۆ رەنگی شینی ئاسمانیی ئاڵە .. دەرگای لێیان دیار نیە ، بە هۆی باوە دەکرێتەوەو دادەخرێ .. کلێر تەنهایە .. ئەگەر پێویستی نەکرد دیوارەکان رەنگیان کراوەتر بێ ، ئەوە شانۆنامە بەردەوام دەبێ و رەنگ ناگۆڕێ»

کنیاتا : «لەپلیکان دادە بەزێ .. پەشۆکاوە» کلێر خان .. ئەوەبۆ وازوو لەخەو هەڵساوی ؟

کلێر : نەنوستووم ..

کنیاتا : چۆن ؟ شەو نەنوستووی ؟

کلێر : نەخێر .. خەوم نەدەهات

کنیاتا : دڵتان تەرە .. جحێڵن .. ئەی مەت کوانێ ؟ «دەنگی داخستن و کردنەوەی دەرگا بێزاری دەکا .. دەنگ نامێنێ» لە داخی ئەم بایە وەختە شێت بم .. بەڵام چ دەکەی .. سبەینان زوو لەخەو رادەبم .. ئەمە حاڵە ؟ «دەیەوێ شتێ بڵێ» ئای کلێر خان .. تۆ نازانی مەت چەند کوڕێکی باش بوو .. ئێستاش کوڕی باشە .. بەڵام زوو هەڵدەچێ .. شتێکی کەم کاری تێ دەکا .. لە سیرەی دەرگا توورە دەبێ .. بزانە چۆن دژی باوکی دەوەستێ !

پێشان وا نەبوو .. نازانم بۆ گۆڕاوە ؟ لەوەتەی دکتۆر هاتووە ئەویش گۆڕاوە .. پێشان هەر لە فریشتەی دەکرد .. بەدەستی خۆم گەورەم کردووە .. خۆم پەروەردەم کردووە .. کلێرخان تۆ دەتوانی کارێکی وا بکەی مەت بێتەوە هۆش خۆی ..

کلێر : ئاخر منیش کلێری جاران نیم .. من لە دەرەوە کلێرێکی دیکەبووم .. منیش وەتەی هاتوومەتە ئێرە گۆڕاوم .. «مەت لە دەرگای چێشتخانەوە دێتە ژووری وبەپەلە قەڵەمەکەی دەخاتەوە گیرفانی»

کنیاتا : «بۆمەت» ئەوەندەی نەماوە کازیوە بدات و تۆ هێشتا نەنوستووی ! «مەت دادەنیشی و قسە ناکا» مەت لە بیرتە جاران هەقایەتم بۆ دەگێڕایەوەو تۆش سەرت دەنایەوەو دەنوستی .. ؟ چاوەکانت دەچوقاندن ؟ هەرکە من دەستم پێ دەکرد ، تۆش دەنوستی ؟ «بۆکلێر» تامن هەقایەتم بۆی نەگێڕابایەوە خەوی لێ نەدەکەوت ..

مەت : کنیاتا .. ئەوکاتە باوەڕم بە گێرانەوەت دەکرد .. ئێستا باوەڕ بەو هەقایەتانە ناکەم «بێدەنگی» باسی جیهانەکەی ترت دەکرد .. باسی بەهەشت و جەهەنەم «وەك حیکایەت بگێڕێتەوە » .. هەبوو نەبوو لە زوودا لە دەورانی پێشوودا .. وڵاتێك هەبوو .. هەنگوێن

بەروبارە زیوینەکانیدا هاژەی دەهات .. شەوان مانگ تریفەی لە نێو درەخت و گیاوگوڵان دەدا «کلێرو کنیاتا پێ کەنینیان دێ » لەبەر رووناکی

ـمنگە شەودا میوەی زێڕین هەڵدەوەرانو ستارەکان دەرژان .. تۆزی ڕێگەی «کا» دەبووە زێڕ .. «پێ‌دەکەنن» ئاو لە نێو پەنجەکانت هەڵدەقوڵاو نینۆکەکانت دەبوونە سەدەف .. هەبوو نەبوو لە زوودا «کنیاتاو کلێر پێ‌دەکەنن .. مەت توورە دەبێ» بۆ پێ‌دەکەنن ؟ کلێر پێ‌مەکەنە .. «کلێر زیاتر پێ‌دەکەنێ» خۆزگە بروایم دەهات .. خۆزگە باوەرم دەکرد .

کنیاتا : تۆ جاران وا نەبووی . لەبەر چاوی من هێشتا هەر منداڵی .. پێ‌کەوە ، با حیکایەتێکی دیکەت بۆ بگێرمەوە .. جاران بە سیرەی دەرگا قارس نەدەبووی ، کەسیش خەتو وێنەی لە بان دەرو دیوار نەدەکێشا . بنوە مەتە بچکۆڵانەکەم بنوە .. چاوەکانت بنوقێنەو گوێ بدەرە ئەم حیکایەتە خۆشە .. هەبوو نەبوو . «کا» لە بێژەنگ دابوو «کاتێ کنیاتا قسە دەکا شانۆ تاریك دادێ‌و هەرکە قسەکانی کۆتایی هاتن شانۆ دووبارە رووناك دەبێتەوە»شارێك هەبوو ، سەعاتەکان کاریان نەدەکردو مرۆڤ وەهەرچی گیان لەبەرە ، گەورە نەدەبوون .. هەموویان لە تەمەنێکدا دەمانەوە ، ئارەزوویان بکردبایە «دەنگی کنیاتا وردە وردە دوور دەکەوێتەوە .. لە ژێر تیشکی رووناکی‌دا مەتو دکتۆر دانیشتوونو مێزێکیان لە نێواندایە . دۆڵکەیەكو قاپێكو پیاڵە ژەهرێکی لەسەرە .. مەت قوتووی باپیرەی لە نێو دەستانە»

دکتۆر : کاتی موحاکەمەت نزیك کەوتەوە ..

مەت : ئەوە چیتە ؟ من نامەوێ بژیم .. تێ‌ناگەی ؟

دکتۆر : من تێ دەگەم ، بەڵام خۆت ناتەوێ تێ‌بگەی .. هەوڵ نادەی قەناعەت بەخۆت بێنی .. تۆ دەتەوێ بژی ..

مەت : بژیم ؟ نەخێر وانیە . پە .. ئەسڵەن‌ نامەوێ .. باشە ، دەتوانی چەند ساڵم بدەیتێ ؟

دکتۆر : بەپێی کردەوەی خۆتە

مەت : سێ ساڵ ، پێنج ساڵ ، دەساڵ ، یان سەد ساڵ .. پاشان ؟

دکتۆر : دووبارە موحاکەمە دەکرێتەوەو ماوەیەکی دیکەت دەدرێتێ .. بزانە پێنج ساڵ دەبێ .. دەساڵ دەبێ ..

مەت : من نامەوێ بمرم .. پێنج سەد ساڵو هەزار ساڵم بەش ناکەن .. ئەگەر بەر لەمن کەسێکی نەمر بووایە ، ئەوە منیش قیرسیام لێ‌دەکردو شتێکی وام دەهێنایە کایەوە هاوتای نەبێ .

دکتۆر : تۆ ژیانت بە دەستی خۆتە .. دەتوانی بژی

مەت : ئەوە ماوەیەك ژیام .. پاشان؟ جەنابی دکتۆر دەرمانی دژی مردنت هەس ؟ جا فەرق چیە پێنج ساڵ یا حەوت ساڵ پێشتر بمرم ؟ یا هەر نەمرم ؟ «هاوار دەکا» لەم وێنەیەی بەم ماڵەدا هەڵواسراوە بێزارم «بەهێزتر هاوار دەکا» مێژووتان پڕ لە درۆو دەلەسەو تۆکڵە مردوو کردووە .. ناهێڵن خەڵکی لە خۆشترین کاتدا بمرن .. واز لەو خەڵکە بێنن .. واز بێنن بمرن ، بەرلەوەی لە پێناو ژیاندا خراپە بکەن .. با لە خۆیانەوە بمرن .. ئەگەر ئەمەت دەکرد دەساڵ دەژیای .. ئەگەر ئەوت کردبا سەد ساڵ دەژیای .. کتێبو مێژووتان کردنە گۆڕستانی گوناه .. جەنابی دکتۆر تۆ منت فێری دزی کرد .. لەپێناو ژیاندا بوومەتە دز .. واز بێنە بابمرم .

دکتۆر : تۆ خۆت نامری .. پێم گوتووی .. تا تۆ بژی منیش لەگەڵتام

مەت : خەڵك خەڵات دەکەنو دەبنە پاڵەوان .. ئەی هەڵەکانیان ؟ ئەی گوناهەکانیان ؟ گوایە ژەنراڵ «کیش»ی نیشتمان رزگارکەرو «هن» ی خاوەن تۆپی ریشو «بێرب » ی‌مەزن گوناهیان نیە ؟

دکتۆر : بەڵێ .. گوناهیان هەیە .. ئەوانیش بەهۆی گوناهەکانیان دەمرنو بە هۆی کارە ترسناکەکانیانەوە دەژین

مەت : «هاوار دەکا» کەسانێکی ئەو کارانەیان پێ ترسناکە .. هەندێکی دیکە . نا .. من خۆم ئارەزووم نیە .. وازم لێ‌بێنە با بە ئەجەلی خۆم بمرم .

دکتۆر: دەستت لەسەر ملتە .. مێژوو دەستەو لە بان ئەستوی تۆیە ئەویش دەیەوێتەوە .. مەت تۆ قەرزاری‌و دەبێ قەرزەکان بدەیتەوە .. تۆ ژیانت دەوێ .. ئەگەر وانیە ، ئەی بۆچی وا تورەی ؟ «بێ دەنگی» ئەو کاتەی لێپرسینەوەت لە گەڵدا بکەم ، ناتوانی بەم‌شێوەیە بدوێ‌ی ..ئەو کاتەهاوار ناکەی . وازم لێ بێنن بابمرم . «بێ دەنگی» تۆ ناتەوێ بژی وانیە ؟ «بێ دەنگی» ئەم قوتووە چیە وا بە دەستتەوەیە ؟ «مەت وەك هەست بە تاوان بکا .. قوتووەکە لە بان مێزەکە دادەنێ ، چرکەی سەعات بە رێکو پێکی دەبیسترێ»

دکتۆر : «بەتیژی» مەت .. پێنج دەقیقەی دەوێ بۆ شەش .. ئێستا موحاکەمە دەکرێ‌ی .. هەڵسە سەرپێ «مەت پۆزی جارانی نامێنێ .. بەترسەوە هەلدەستێ‌و دوو هەنگاو دەگەرێتەوە دوواوە» دەتەوێ بژی ؟

مەت : «سەری داخستووە» بەڵێ .. دەمەوێ بژیم !

دکتۆر : چیت کردووە شایانی ژیان بی ؟

مەت : «دەستی لەرزۆك بۆ قوتووەکە درێژ دەکا» ئەمە .. ئەم سنووقە

دکتۆر : ئەم سنووقە چیە ؟

مەت : سنووقی تاریکی‌یە

دکتۆر : بە کەڵکی چ دێ ؟

مەت : «پەشۆکاوە» مەبەستم .. ئەم سنووقە .. رەنگ ئاڵە

دکتۆر : بەڵێ .. بەڵێ .. دەهینم .. بەڵام چ سوودێکی هەیە ؟

مەت : ئەم سنووقە .. هی تاریکی‌یە «دکتۆر پێ‌دەکەنێ» پری دەکەم لە

تاریکی .. بۆ ئەوەی پڕ بێ .. ئا .. تاریکی .. «دکتۆر زیاتر پێ دەکەنێ»
دکتۆر : ئەوە تۆ شێت بوی ؟ چۆن سنووق پڕ تاریکی دەکەی ؟
مەت : ئەمە .. ئەم سنووقە
دکتۆر : فەرموو .. بێژە .. بۆچی باشە ؟
مەت : تاریکی تێدا کۆ دەکەمەوە .. ئیدی ئەوەی ناوی تاریکی‌یە نامێنێ‌و هەمیشە رووناك دەبێ ..
دکتۆر : بەڵێ .. بەڵێ تێگەیشتم .. بەردەوامبە.
مەت : رووناکی .. پاشان ئەم سنووقە «بە گریانەوە هاواردەکا» دەمەوێ بژیم .
دکتۆر : کاکەمەت .. من تێ ناگەم تۆ چیت کردووە ؟ لەبەر ئەوە ناتوانم ژیانت پێ ببەخشم .
مەت : دکتۆر .. دکتۆر گیان ، روحمێ بە حاڵم بکە .
دکتۆر : روحم‌و بەزەیی ، مانایان نازانم .. تۆ خۆت دەتوانی روحم بە حاڵی خۆت بکەی .. تۆ لە شوێنی من بە .. وەرە موحاکەمەی خۆت بکە .. رەنگە من بەهەڵەدا چووبم .. رەنگە بەم قوتووە هەرچی قەرزە بیدەیتەوە .. ئەگەر خۆت بەمە باوەڕ دەکەی .. منیش مانیعم نیە «دکتۆرو مەت . شوێنیان ئاڵ‌و گۆڕ دەکەن‌و وتیشکی رووناکی باریکتر دەبێتەوەو دکتۆر دەرناکەوێ .. مەت تەنیایەو سنووقی بەدەستەوەیە»
مەت : «نیگەرانە» ئەمە سنووقی شۆی باپیرەمە لەوم دزیوە باسی سوودو قازانجی بۆ کردم ، کەچی تێ نەگەیشتم . رەنگە خۆی بتوانێ بەئاسانی قەناعەت بەخەڵك بێنێ .. بەڵام من ناتوانم قەناعەت بەخۆم بێنم ..
«گوێی لەدەنگی کلێر دەبێ .. لەگەڵ خۆیەوە هات‌و هەرایەتی»
کلێر : وامەکە «شنسی» وامەکە ، ئەو دارە فڕێ بدە . بەدووای مراوی رامەکە .. بەقسەی دایکت بکە .. وامەکە «لێمی».. گوڵ مەوەرێنە ..
مەت : بێدەنگ بە کلێر .. بێ دەنگ بە .. ناتوانم باوەڕ بە خۆم بێنم .. وس بە . «هاوارد دەکا» باپیرە .. باپیرە . «تیشکەکە فراوان دەبێ شۆ دێتە ژێر تیشکی رووناکی»
شۆ : «بەدڵنەوازی‌و دەنگی ناسك»ها .. مەت خێرە ؟ بۆ بانگت کردم ؟
مەت : باپیرە گوێت لەمنە ؟
شۆ : گوێم لێتە .. گوێم لە هەموو شتێکی ناو دەروونتە ..
مەت : «بەچرپە» باپیرە من دەبینی ؟
شۆ : دەبینم .. ئەوەی بەر لەتۆو ئەوەی دووای تۆ دەبینم .. من خۆشم دەبینم .. دە توانی قوتوو بدزی ، بەڵام ناتوانی من بدزی ئەمەت لە بیرنەچێ ..
مەت : لەبیرم ناچێ ..
شۆ : چۆن لەبیرت ناچێ ؟ ئەو کاتە دەمری .. دووای سەد ساڵ چۆن هیچت وەبیر دەمێنێ ؟ ئەم سنووقەم بدەرێ «سنووقەکەی بۆ رەوانەدەکا» تەماشای ئەم کونە بکە .. لێرەوە قوتوو پڕ تاریکی دەکەم
مەت : بۆ ؟ باپیرە ئەمە بۆچی باشە ؟
شۆ : رۆڵەگیان ، خەڵك لەتاریکی دەترسن
مەت : دەترسن ؟
شۆ : تاریکی مانای نەزانی‌یە .. مرۆڤ کەشتێ نەزانی دەترسێ .. منیش بۆ ئەوەی ترس لە دڵی خەڵك دەرکەم ، ویستم تاریکی حەپس بکەم .. بەڵام داخەکەم نەمتوانی
مەت : ئەی ئەم سنووقە ؟
شۆ: ئەمە تەنها هۆیەو بەس .. سنووق لە دەروونمدا دەژیا .. بەڵام داخەکەم ..
مەت : بۆچی باپیرە بۆچی ؟ تۆش نەزان بووی ؟
شۆ : ئا بەڵێ نەمدەزانی ، بەڵام دەترسام .. بەندە مرۆڤێکی ترسنۆکم .. دەرەوەم نەبینیوە .. مەت پێویستە بچینە دەرەوە .. ئەوانەی وا لە دەرەوەن نازانن لە تاریکیدا دەژین .. لەبەر ئەوە نایانەوێ رزگاربن . تاریکی بوویتە پێست وخوێن‌و ئێسقانیان .. بوونەتە تاریکی .. بۆیە ناهێڵن بچینە دەرەوە مەت ، تۆ برۆ دەرەوە .. لە مردن باکت نەبێ وبرۆ لایان .. ئەگەر هەڕەشەی مردنیشیان لێ کردی ، تۆ باسی ئەو شتیان بۆ بکە کەلێی دەترسن .. گرێ کوێرەی تاریکی‌ی دەروونیان بکەرەوە .. «بەمەلوولی»
من خەریکی ئەم سنووقەم «بەدەستی‌یەوە دەکەوێتە سەر مێزەکەو دەشکێ»
مەت : «بەگریانەوە» باپیرە .. باپیرە ..
دکتۆر : مەت .. تۆ دەمری
مەت : دەمەوێ بژیم
دکتۆر : «دەست بۆ دۆڵکەو قاپ‌و پیاڵەی ژەهر درێژ دەکا» ئەمە دۆڵکەی ئاوو ئەمە قاپ‌و ئەمەیش پیاڵەی ژەهر .. تەنیا بیست‌و چوار سەعات مۆڵەتت دەدەم ..
مەت : ئەگەر هیچ نەکەم
دکتۆر : ژەهری نێو پیاڵە دەنۆشی
مەت : ناتوانم بینۆشم
دکتۆر : ئەو کاتە ئەوانەی دەوەوە پارچە پارچەت دەکەن «شانۆ تاریك دەبێ .. پاشان وردە وردە رووناك دەبێتەوە» مەت وەزعی خەراپە .. کلێر تەماشای دەکا .. مەت قەڵەم لە گیرفانیەوە دەردێنێ‌و دەیەوێ شتێ

بنووسیّ بەڵام قەڵەمەکە کارناکا»
کلێر : گیانەکەم ، ئەوە چ دەکەی ؟
مەت : «قەڵەم فڕیّ دەدا» ئەم قەڵەمە نانووسیّ
کلێر : دیارە نووکی شکاوە
مەت : نەخێر نانووسیّ .. مخابن ، نێوم بەسەر دیوارەکانیشدا نامێنیّ ..
تۆش فەرامۆشم دەکەی ..
کلێر : «دێتە تەك مەتو دەستی لە مل دەکا» من ؟. من ؟
مەت : تۆش فەرامۆشم دەکەی .. چونکە بوونم نیە .. بەڵیّ بوونم نیە ..
«چاوەکانی دەنوقێنیّ» ئەمە مانای چیە ؟ نەخێر کلێر گیان من وجوودم نیە .
کلێر : تۆهەی .. تۆ بوونو جوودت هەیە «دەستی دەگریّو دادەنیشن»
ماڵێکی خنجیلانەمان دەبیّو دەریاچەی زیوی لەبەردەم تێپەڕ دەبیّو قازو
مراوی مەلەی تێدا دەکەن .
مەت : ئیدی تەواو .. بیستو چوار سەعاتم ماوە .. ئەم کاتەیش کۆتایی
دیّ .. ئێستاکیّ بیستو سیّ سەعاتو چەند دەقیقەیەکم ماون
«بەتووڕیی» خۆزگە ئەوانەی دەرەوە دەیانزانی چەندیان ماوە !
کلێر : لە بەرژەوەندی ئەواندایە بزانن ؟
مەت : ماسی لە ئاوداو مەل بە ئاسمانەوەو ئەوانەی دەرەوە لە تاریکیدا
دەژین ، هەر پیّ بنێنە ڕووناکییەوە دەخنکێن ..
کلێر : لەبەرچی ؟ لە تاو ڕووناکی ؟
مەت : نەخێر لە ترسی ئەو تاریکییەی تێیدا دەژین .. کلێر گیان ئاخۆ
مرۆڤی گێلو نەفام بەختەوەرە ؟ ئەگەر هەموومان دەمانزانی چەندێکمان لە
تەمەن ماوە ئەوە تیّ دەگەیشتینو خۆی لە خۆیدا بەختەوەرییە .. من وا
بچووك دەبمەوە .. یەك دێمەوە .. نازانم بۆچی تائێستا بیّ ئاگا بووم ؟
تەماشا .. دەسەکانم هیچیان تێدا نیە .. هیچم نیە لە گەڵ خۆمدا بیبەم یا
دووای خۆم جیّیان بهێڵم .. هیچی وانیە بیان بینم .. هیچی وانیە گۆیان
لیّ بگرم .. ئەوە خەریکە بچووك دەبمەوە ، دەتوێمەوە .. کلێر خەریکم
دەمرم .
کلێر : توخوا مەت باسی مردن مەکە
مەت : ئەگەر لە تاریکیدا دەبووم شتەکە ئاسانتر بوو .. بەڵام وا لە
ژوورەوەم .. دکتۆر موحاکەمەم دەکا .. ئاخ فەوتام ..
کلێر : تۆ دەژی
مەت : منیش هەوەڵ لەم بڕوایەدا بووم .. هەرکە خزمێکمان دەمرد ..دادو
فیغانوڕۆڕۆمان دەکرد . باوەڕمان نەدەکرد ئێمەیش ڕۆژێك ئەدیّو دەمرین
.. ئاخر چۆن باوەڕ بکەین ؟ ئاکلێر گیان نا چۆن دەتوانم باسی شتێکت بۆ
بکەم کە خۆم تیّی نەگەیشتووم ؟!
«بەئاسپایی گڵۆپ دادەگیرسێنیّو لە ڕووناکییدا بەدەردەکەویّ» من قایلم
بەوەی لەم تاریکییەدا بژیمو ئەم شەوە بەڵدایە ببرم .. ڕازیم چونکە چاوم
بڕیوەتە تێشکی هیواو ئاوات .. تەنانەت ئەمەش نیە .. ئەگەر بڵێم ئەمە
تاریکییە ، وا دەرناچیّ .. کەچی خەونیش نیە .. هیچ نیە .. دەتوانم
بیری لیّ بکەمەوە «بەدەستەکانی بەدووای کلێر گەڕ دەخوا .. دەیدۆزێتەوەو
دەیگرێتە باوەش» من دەتوێمەوە .. وردە وردە دەتوێمەوە .
کلێر : بێگومانە .. ڕزگار دەبی
مەت : ئەگەر خۆم ڕزگار نەکەم کەس ئەم کارە ناکا .
«کازیوە شوێنەکە ڕووناك دەکا .. ڕی لە پلیکانەوە دادەبەزیّ»
ڕی : منداڵینە بەیانیتان باش .. ئەوە بۆ لە تاریکاییدان ؟ «پەردە
دەکاتەوە .. شانۆ ڕووناکتر دەبیّ»
کلێر : بەیانیت باش خانم ..
ڕی : زوو لە خەو هەڵساون ! «بۆمەت» ئەمە چۆنە ؟ تۆ تا سەعات یازدەو
دووانزەی نیوەڕۆ خۆت لە ناو پێخەف دەگەوزێنی .. ئەمە چیتە ؟ بۆ قسە
ناکەی ؟ «چاوی بەقەڵەمەکە دەکەویّ .. دادێتەوەو قەڵەم هەڵدەگرێتەوەو
هاواردەکا»
کنیاتا «بەرەو دەرگای چێشتخانە دەڕوانیّ» کنیاتا ..
کنیاتا : «دێتە ژوورەوە ، گۆرەوی بەدەستەوەیە» بەڵیّ ڕیخانم ..
ڕی : تەماشای ئەم قەڵەمە .. لێرەم دۆزیەوە «سەر بۆ دوواوە وەردەگێڕیّو
بە دیقەت تەماشای دەکا»
کنیاتا : «قەڵەمەکە وەردەگریّ» بەڵیّ .. بەڵیّ .. قەڵەمە شینەکە .
ڕی : نووسینو وێنەکانی سەردەرو دیوار شین بوون ؟
کنیاتا : ئابەڵیّ .. «خەتێك لە دیوارەکە دەکێشیّ .. مەت زیاترلیّی نزیك
دەبێتەوەو بەترسەوە تەماشای خەتەکەدەکا» ڕاست دەکەی بەم قەڵەمە
دیوار نووسراوە .
مەت : کنیاتا ، خەتێکی دیکەیش بکێشە ..
کنیاتا : «خەتێکی دیکەیش دەکێشیّ» بەڵیّ خۆیەتی .. ئەم ڕەنگە بوو ..
مەت : «لەسەرخۆ» بەدەستی کنیاتەوە دەنووسیّ ! «بەدەنگی بەرز»
بۆچی لەم دنیای وا پانو بەرین تەنها یەك دانە قەڵەمی ڕەنگ شین هەیە ؟
«قەڵەمەکە لەدەست کنیاتا دەسێنیّو بەدیواریدا دەهێنیّ ، بەڵام قەڵەم
نانووسیّ ،قەڵەمەکە فڕی دەداو دەچیّ لەتەك کلێر دادەنیشیّ» قەڵەم
بەدەستی من نانووسیّ !
ڕی : خاوەنی ئەم قەڵەمە دیوار نووسە «تەماشای مەت دەکا» جنۆکەش

لەمماڵەدا نیە .

نلك : «لە سەرووی پلیکانەوە دادەبەزێ» بەیانیتان باش

کلێر : بەیانی باش گەورەم

ری : بەیانیت باش نلك

نلك : ئەمڕۆ گشتتان زوو لەخەو هەڵساون «شۆ لە پلیکان دادەبەزێو دەکەوێ .. کەس خۆی تێناگەیێنێ ، تەنیا مەت نەبێ بەپەلە خۆی دەگەیێنێو بەرێزەوە بەرزی دەکاتەوەو لە شوێن خۆی دایدە نیشێنێ»

مەت : باپیرە خۆ ئازارت نیە ؟«شۆگوێی لێ نیەو خەریکی قوتووەکەیەتی مەت پیاسە دەکا» خەریکە شێت دەبم

نلك : شێتی لە مردن باشترە .

مەت : راست دەکەی «لە ناکاو» تەماشای ئەمانە !! ڕانە بنیادەمێکن گاڵتەم پێ دەکەن !

نلك : لەهەوەڵەوە ئەمەمان پێ گوتووی

ری : بەدوورو درێژی باسمان کردووە

مەت : باوکە ، من بووم گوتم ئەم خانووەت بۆ دروست دەکەم ؟ بلێ .. من گوتم دایکم بخوازە ؟ ئەگەر مردوو لە دەروونی مندا بژین ، چ پێوەندی‌یەکی بەمنەوە هەیە ؟ بامردووەکان ئەوەی لای منیان هەیە بیبەنەوە

نلك : ئەوکاتە بەرووتو قووتی دەژیای

ری : ئەسڵەن نەدەژیای

نلك : بێدەست دەبووی

ری : بێچاو دەبووی

مەت : ئەمانە بە زۆر ئەوشتانەیان داوتە منو بە زۆریش وەری دەگرنەوە .. ئای کە کلۆڵو پەرێشانم .. ئای کە دەتوێمەوە

کلێر : «خۆی داوێتە سەر پێیەکانی» مەت ، تۆ ماوەیەکی تەواوت بەدەستە ..

مەت : جا چیم بۆ دەکرێ ؟ ووشەی خەڵکی دیکەیان فێر کردووم .. نیگای خەڵکی تریان خستووتە ناو پێڵوی چاوەکانم .. ئاخۆ رەوتم بە پێی کێیە ؟ ئەی ئەم کەللەسەرە ؟ ئەم شانو بازووە ؟ ئەم هەردوو قاچانە ؟ کامەیان هی خۆمە ؟ دیارە بێ ئەوەی من هەستی پێ بکەم ، هەمووم دزیون !

دکتۆر : «لەسەر خۆ دێتە ژوورەوە» مەت .. تۆ وردە وردە بەرەو نەمان دەڕۆی ..

مەت : بەزمە .. وانیە ؟ ئاهەنگو بەزمێکی دڵگیرە .. کۆتایی ژیانی من دەبینن .. چەند سەعاتم ماون ؟ بیستو سێ ؟ «دەنگی سەعات بەرز دەبێتەوە» من دەتوانم هەمووتان وەدەرنێم .. هەمووتان .

ری : لەسەرخۆ رۆڵە .. لەسەرخۆ

دکتۆر : مەت ، ئەم هەڵوێستە شایانی تۆنیە .. ئەم قسانە لە تۆ ناوەشێنەوە ... بیستو سێ سەعاتت نەماوە ، بەڵکو کەمترت ماوە «دەنگی سەعات بەرزتر دەبێ» .

مەت : «وەك لەگەڵ خۆی بدوێ» دەتوانم رابکەمو بۆی دەرچم بەڵام فایدەی بچیە ؟ بۆ هەرکوێ برۆم ئێوەو مێژووم بدوواوەن .. ناتوانم لە چوار چیوەی کەسانی بۆیان دیار کردووم رزگار بم . ئای کە لەژێر قەرزێکی قورس دەتوێمەوە ..

ری : مەتی کلۆڵو نەگبەت

کلێر : بەرەو نەمان هەنگاو دەنێو خەریکە بەجارێ نەمێنێ .. «دەنگی سەعات گەلێ بەرز دەبێتەوە»

مەت : ئەم سەعاتە لەکاربخەن .. بیوەستێنن «بەرەو سەعات رادەکا وزەمبەلەکی دەردەهێنێو فڕێی دەدا . میلی سەعات دەوەستێ بەڵام لە کارکردن ناکەوێو تادێ دەنگی بڵندتر دەبێو هەموویان ترسیان دەگاتێ . لە یەکتر نزیك دەکەونەوەو دەوری شۆ دەدەن .. دکتۆر دەستەکانی لەسەر سنگی‌یەتیو تەماشایان دەکاو پێدەکەنێ .»

## دیمەنی پێنجەم

« هەمان شوێنی جارانە .. رەنگی دیوار ئاڵترە .. کات بەرۆژێك دووای‌دیمەنی چوارەمە .. بەرە بەری بەیانە . لە کۆتایی دیمەندا خۆر هەڵدێ . کلێرومەت بەجلەکانیانەوە نوستوون . رووناکی کزە . لای چەپی شانۆ بە تەواوەتی تاریکە . دووای ماوەیەك ئەو لایەش رووناك دەبێتەوە یاریزانێکی تۆپی پێ دەردەکەوێ . وەك پەیکەر وەستاوەو ئامادەیە بۆچوونە یاریگە . یاریزان برای مەتەو مردووە . مەت لەسەر خۆ هەڵدەستێتەوە چاوی بەبرای دەکەوێ دەپەشۆکێ . دەتواندرێ بێ دەسکاری کردنی رەنگو بۆیەی دیوار شانۆنامە بەردەوام بێ »

مەت : کاکە «یاریزان وەکو پەیکەر وەستاوە » برام .. براڵە .. « دەست بەسەر نێوچەوانی برای دەهێنێو بازووی دەگرێ» کاکە «بێ دەنگیو کپی» تۆ زیندووی ؟

یاریزان : بەڵێ

مەت : ئەی لێرە چ دەکەی ؟

ـیرـن : من له بیرو هۆشی تۆدا دەژیم
ـت : باشه تۆ هەرواى ؟ ئەم بەرگە دەپۆشی ؟
ـیرـن : من هەر بەهەمان شێوەم کەلە بیری تۆ داهەم .. دووا جاریش
ـت هەر وا بینی ، وانیە ؟
ـت : بەڵێ وایە . ئەو کاتە دەچوویتە یاریگە .. تۆم بینی .. ئەم جل‌و
ـگەت دەبەردابوون ، ئاسەواری تۆزێك بە فانیلەکەتەوە بوو .
ـیرـن خۆی وەردەسوورێنێ ، هەمان پۆت‌و لەکەی پێوەیە » بە لێ ..
ـێ .. وابووی .
ـیرـ : تۆ چۆنت من بینیوه ، منیش وا دەژیم
ـت : بۆچی تۆ دەژی ؟
ـیرـن : ئەوە نیە دەمبینی ؟! بەڵام زۆر ناژیم ، دووای ماوەیەك تۆش
ـرمۆشم دەکەی
ـت : چەند دەژی ؟
ـیرـن : تا ئەو کاتەی لە مێشکت دا دەسڕێمەوە .. تا ئەوکاتەی ئەوانەی
ـگە لەبیرم دەکەن .. ئەوانەی لە کاتی یاری‌ی کردندا چەپڵەیان بۆ
ـدەمو ئافەرین‌و شاباشیان دەکردم .. تا ئەو کاتەی ناووێنەم بەسەر
ـگەو رۆژنامە وەرزشیەکاندا نامێنێ .
ـت : پاشان ؟!
ـیرـن : پاشان چش .. تەواو
ـت : براگیان ، تۆ چکارێکت بۆ ژیان کرد ؟
ـیرـن : دوو ساڵی رێك ، یەك بە دووای یەکەوە پاڵەوانی یاریــگە بووم
ـە دووا یاری‌ی دا «کە ئەو قسە دەکا هەراو هۆریای خەڵك دەبیسترێ»
ـێمە یاریزانی بەرگر سەندو چوارکەسم رەت کردن‌و «هەندێ حبووڵانەوە
ـەك وەك بەراستی یاری بکا » توانیم بگەمە نزیك گۆڵچی‌و بۆ دەستە
چەپ هێرشم بردو شەقم لە تۆپدا .. لە ناکاو لە دوواوە پێلاقەیەکیان
حێوندمێ «هەست بە ئازاردەکا» بەڵام من تۆپی خۆم حەواڵە کردو «لە نێو
هەراو هۆریادا وشەی گۆڵ .. گۆڵ .. دەبیسترێ » گۆڵم تۆمارکرد وئیدی
کموتم‌و هەڵنەستامەوە .
مەت : بۆ هەوڵت نەدا پتر بژی ؟
یاریزان : نەمدەزانی بەم شێوەیە دەمرم . هەر چەندەی باسی مردنمان
دەکرد . بەڵام باوەڕم نەدەکرد .. ئەگەر دەمزانی رۆژێك دێ ئەوە داوای
تەمەنێکی درێژو یاریگەیەکی فراوانم دەکرد . : تۆ باوەڕ بەمردنی خۆت
دەکەی ! مردن شتێکی دیکەیە «ماوەیەك بێ ڕەنگ دەبێ» دەست بۆ
کێری نوستوو درێژ دەکا» ئەم کچە کێیە ؟

مەت : دەزگیرانمە ..
یاریزان : «لە کلێر نزیك دەکەوێتەوەو تەماشای دەکا» شۆخێکی نازدارە ،
تەمەنی چەندە ؟
مەت : هەژدە ساڵ
یاریزان : کەواتا هێشتا زۆری ماوە موحاکەمە بکرێ .
مەت : هش .. کاکە لەسەر خۆ باخەبەری نەبێتەوە ..
یاریزان : «بەزەردەخەنە» گوێ لە هیچ نابێ .. بەئاگاش بێ گوێ‌لێ نابێ
.هێشتا دەنگی من نەچوویتە کونا گوێ ئەو ناشم بینێ «بێ‌دەنگی» ئەری
داربنێشتەکەی نزیك یاریگە هەرماوە ؟ . نەبڕاوە ؟

مەت : بەڵێ ماوە ..
یاریزان : چ لق وپۆپێکی هەبوون .. رۆژێکیان دووای یاری کردن
سەرکەوتمە سەر درەخت‌و بەچەقۆ وێنەی دڵێکم لێ هەڵکەند ..
بەزەحمەتی مەزانە سەیرێکی درەختەکە بکە بزانە ناوەکەم ماوە ..
«غەڵبەغەڵب‌و هەراو هۆریا دەست پێ دەکا » :
مەت .. ئێمە ئامادەین ..
مەت .. چاوەروانت دەکەین
مەت .. ئەجەڵت نزیکە
یاریزان : ئەم هەرایە چیە ؟
«هەراکە وردە وردە دوور دەکەوێتەوە »
مەت : ئەوانەی دەرەوەن .. رەش‌و رووت‌و بۆرە پیاوەکانی دەرەوەن ..
یاریزان : ئەوانن ؟ جا بۆ وا توورەن ؟
مەت : خوێنی منیان دەوێ .. دوێنێ فەحس کراوم .. دکتۆر بیست‌و
چوار سەعاتی داومەتێ .. کە ئەم کاتە تەواو بوو
یاریزان : تێ‌گەیشتم .. ژەهر دەنۆشی‌و خۆت دەکوژی .. یا ئەوانەی
دەرەوە دەتسووتێنن ..
مەت : ئاخر من ..
یاریزان : دەتەوێ بژی ..
تیشکی رووناکی دەکەوێتە سەر وێنەی دەستە چەپ ..
رووناکی‌یەکەی‌لای راست نامێنێ .. دەم‌و چاوی تابلۆکە بەقسە دێ ..
وێنەی (بێرب)ە تەمەنی سی ساڵە .. یاریزان لە تاریکی‌دا وون دەبێ »
بێرب : ئەگەر بەراستی دەتەوێ بژی‌و زۆرت مەبەستە ، ئەوە ئاسانەو
دەتوانی .
مەت : «پەشۆکاوە» تەماشای راست‌و چەپ دەکا»ئەمە کێ‌یە دەئاخێوێ ؟

بێرب : منم .. من
مەت : تۆ ؟
بێرب بەڵێ منم .. ناوم بێربە .. ناوی منتان لە کتێبەکاندا خوێندووتەوە ..
تەمەنم سیو پێنج ساڵە .. بەڵام چوار سەدو پەنجا ساڵ دەژیم .
مەت : مردووی ؟ چۆن مردی ؟!
بێرب : بە گوللە کوژرام
مەت : «بەترسەوە» گوللە بارانیان کردی ؟
بێرب : بەڵێ .. بۆ وا ترسای ؟
مەت : پێم نالێی گوللە باران چۆنە ؟
بێرب : دەستیان بە پەت لەدوواوە بەستم .. پارچە پەرۆیەکیان لە چاوانم قایم کردو بردمیانە نزیك درەختێکەوە ..
مەت : درەخت ؟ ئەوەی من بیزانم ، مرۆ بە پاڵ دیوار دەوەستێنن ئەوێ دیواری لێ نەبوو ؟
بێرب : بەڵێ .. شوێنەکە هەر چوار لای دیوار بوو .. ئەوانەی دەرەوە دیوارێکیان لە نێوان خۆیانو ئەوانەی ژوورەوە دروست کردبوو .. بەڵام کەڵکیان نەدەدا .. دەیانزانی وەکو سنگی من بەرگەی گوللە ناگرنو ڕەنگە لەوە ترسابن بڕوخێ ..
مەت : گوتت چاویان بەستایەوە ؟
بێرب : بەڵێ
مەت : «بەترسەوە» درۆیە .. درۆ دەکەی !
بێرب : بۆچی درۆیە ؟
مەت : تۆ دەڵێی چاو بەستیان کردی .. چۆنت زانی بە پاڵ درەختەوەی ؟
بێرب : بۆ ؟ قەی چی ئەکا ؟ بەرلەوەی چاوم ببەستنەوە ، درەختم بینی .. دەمتوانی ئەوانەی پشت دیواریش ببینم .. هەر لە بەرئەوەیش گوللە باران کرام ؟
مەت : گوللە باران کرای ؟
بێرب : بەڵێ .. تا حەز بکەی چاکەیان لەگەڵ کردم ..
مەت : چۆن ؟
بێرب : سوحبەتو گاڵتەیان دەکرد ، گوتیان : دووا ئارەزووت چیە ؟
مەت : دووا ئارەزوو ؟ خۆزگە دەتگوت : دەمەوێ بژیم .. دەمەوێ بژیم

بێرب : جا چۆن ئەم داوایە دەکەم ؟ من پیاوێکم وەکو ئەوان فشەو گاڵتە نازانم .. حەز بەم گاڵتەیە ناکەم .
مەت : ئەی داوای چیت کرد ؟

بێرب : بە درێژایی شەو جگەرەم نەکێشابوو .. سەرم دەسووراو چاوەکانم کز ببوون ، گوتم : دووا ئارەزووم ئەمەیە بەکەماڵی سەڵتە نەت جگەرە بکێشم .
مەت : «جێ بەجێ»یان کرد؟
بێرب : بەڵێ ، باش چاوەش بە فەرمانی لە خۆی گەورەتر جگەرەیەکی بۆ داگیرساندمو خستیە نێو لێوەکانمو دەستم کردە مژلێدان .. تا چوار جگەرەم کێشان .
مەت : پاشان ..
بێرب : پاشان هیچ .. دووا ئارەزوویان بەجێ گەیاندمو ئینجا سەربازەکان ئامادەبوونو یاوەری ملازم هاواری کرد : ئامادەبن .. دواجار هاواری کرد : ئاگر (دەنگی کۆمەڵێ تەقە)
مەت : پاشان
بێرب : «پێ دەکەنێ» چش .. دووبارە ژیامەوە .
«رووناکی سەر تابلۆی دەستە ڕاست نامێنێو تابلۆی لای ڕاستی سەعاتەکە رووناك دەبێتەوە ، کە وێنەی ژەنراڵ «کیش»ە وێنەکە قسە دەکا »
کیش : مافی ئەوەم هەیە قسەیەك بکەم ؟
مەت : «بەترسەوە ئاوری لێ دەداتەوە» تۆش ؟ تۆکێی ؟
کیش : خەڵکێکی کەمم کوشتوون ، ئەگینا دەبوومە پاڵەوان
مەت : خەڵکت کوشتووە ؟ دیارە تۆ پیاو کوژی ؟!
کیش : نا .. نا .. وانیە .. چەند کەسانێك بوون .. ژمارەیان زۆر کەم بوو .. مەبەستمان لە ناوبردنی بەهێزو چاونەترسەکان بوو ..
مەت : تۆ پیاو کوژی
کیش : ئەمەت لە کوێ هێنا ؟ خۆ من لەوانەکەسم نە دەناسی
مەت : نەخێر .. تۆ پیاو کوژی ..

کیش : من ژەنراڵ کیشم .. ئەوکاتەی بێربیان گوللە باران کرد ، من جاری لە دایك نەببووم .
مەت : ئەم ناوەم گوێ لێبووە .. بەڵێ .. لە قوتابخانەدا فێری ئەم ناوە بووم .
کیش : مێژوو باسی دەکا .
مەت : بەپێی تاقیکردنەوە ، تۆ چەند ساڵ دەژی ؟
کیش : دوو سەد ساڵ .. ئەمە تەمەنی منە
مەت : تۆشیان گوللە باران کردووە ؟
کیش : نەخێر ، من بەدەست دۆستو برادەرانی خۆم کوژراوم

ی‌دەگەی ؟ بەیەکەوە جەنگاوین‌و دوژمنان لە وولآتەکەماندا وەدەرناو لە پێنج شوێن زامدار بووم .. بەلآم خۆمان کەوتینە مەترسی‌و بەربەرەکانی‌و ـحەزی‌و دوژمنایەتی سەریان هەلدا .. بە دۆستەکانی خۆم گوت : کورینە بەگژ یەکتردا چوون مەترسی‌ی زیاترە لەوەی بەرەنگاری دوژمن ببینەوە .. کەچی بەم قسەیە توورە بوون .

مەت : بۆ ؟

کیش : ئەوانەی سەرکەوتن ، نەیاندەزانی بۆ شەریان کردووە ! دامەزراندن وحەوانەی سەرکەوتن ، لە سەرکەوتن بەدی هێنان خۆی زۆر زەحمەت ترە ..

مەت : پاشان ؟

کیش : شەوێك ، هەر هەمان دۆست‌و برادەرانی تەمەن‌و رۆژانی بەرگری‌و دوژمن بەزاندن .. پیلانیان بۆم نایەوە .. لەو کاتەی بەرەو مالّ دەگەرامەوە ، سیّ پیاو کوژو کریّ گرتە لە تاریکی‌دا ، هێرشیان هێناو هەژدە خەنجەریان لە دواوە لێدام .

مەت : ئیّ !

کیش : «بەزەردەخەنەوە» ئینجا مرد مو گوتیان دووسەد سالّ دەژی ..

مەت : کیّ تۆی کوشت ؟

کیش : لەبیرم نەماوە .. ناوێکی مەشوورو دیار نەبوو .. ئەوانەی وا منیان کوشت ، هەموویان مردوون ، تەنیا منم وا دەژیم .. لە بیرم نەماوە .. تەنانەت منداڵەکانیشم ناوی ئەوانیان لە بیرنەماوە «تابلۆی کیش تاریك دەبێ‌و تابلۆی «هن» کەلە دەستی چەپی سەعاتەکەیە رووناك دەبێ‌و قسەدەکا»

هن : مافی خۆتە بژی ..

مەت : تۆی ؟ !

هن : بەمن دەلّێن ، هنەی خاوەن ریش ، هنەریشە

مەت : تۆی لەبەرامبەر کۆشکی دەولّەت پەیکەرت هەیە ؟

هن : بەلّیّ .. بەلّیّ .. خۆمم .. تەمەنم پێنج سەدو هەشتا سالّ دریژ دەبیّ .

مەت : ئەم هەموو سالآنە چۆن دەژی ؟

هن : ژیانەکەم ئاسایی نیە .. هەوەلّ مردمو ماوەیەکی زۆر بەسەر مردنم تێپەربوو ئینجا جارێکی دیکە ژیام .

مەت : چۆن مردی ؟

هن : نەمردم ، بەلّکو کوژرام

مەت : کوژرای ؟

هن : بەلّیّ ، خنکاندمیان .. سیّ کەلّە دادپەروەرو یاسازان حوکمیان دام .. بەگوێرەی بریاری ئەوان دەبوایە بمرم .. لە گۆریانی گشتی‌دا ، بەرەبەری بەیان بەپەتێك هەلّیان واسیم‌و دوو سەعات بەپەتەکە مامەوە . پاشان دەستە دەستەی خەلّك دەهاتن‌و تفیان لیّ دەکردم .. ئینجا پەتێکیان لە قاچم بەست‌و بەشەقامەکاندا رایان کێشام .

مەت : ئەمە تۆ دەلّیّ‌ی چی ؟ گالّتەم لە گەلّدا دەکەی ؟ .. بەو پیّ‌یەی باست لێوە کرد ، دەبوایە نەمێنی ..

هن : ئەی نەم گوت ماوەیەکی دوورو درێژ نەژیام ؟ دووای هەشتا سالّ ئینجا ژیام‌و زیندوو بوومەوە ..

مەت : چۆن ؟

هن : دەرکەوت دادپەروەکان هەلّەیان کردبوو .. یاسازانەکانی ئەو سەردەمە بۆیان روون بۆوە کە تۆمەتی درابوە پالّ من درۆ بوون‌و قسەکان‌و بەرگری لە خۆکردنەکەی من راست دەرچوون .. دووای هەشتا سالّ ئەمە ئاشکرابوو . بۆیەش خەلّکێکی یەجگار زۆر بەزەیی‌یان بەمنەوە هات‌و بۆم گریان .

مەت : ئێستا تۆ دەژی ؟

هن : «بەزەردەخەنەوە» واخۆت دەبینی .. ئەوە نیە دەژیم ؟ گوێت لەدەنگمەو دەزانی دەلّێم چی .. کەواتە من دەژیم ..

مەت : چۆن دەژی ؟

هن : بەتامو بۆی ئەو ماچەی وا لەسەر لێومە .. ئەو تامەی کە مرۆڤ لیّ‌ی تێر نابیّ .. لەو کاتەوە تا ئێستا بەلێومەوەیە .. سبەینەی رۆژی خنکاندن ، خانمی هاوسەریان هێناو ماچێکی ئەو تۆی لیّ کردم کەهەستم دەکرد پەنجەکانی لە ئەستۆم دەچەقن .. ماچێکی درێژخایان .. تا جەللاد هاواری لیّ هەلّساو گوتی : بەسە ..

مەت : ئێستا هاتەوە یادم .. کە پەتیان لە مل شەتاندی ، زەردەخەنەت دەهات ..

هن : بەلّیّ ، وا لە کتێبەکاندا نووسراوە .. بەلآم راست نیە .. من ئەوکاتە پیّ‌کەنینم دەهات .. بەهەرحالّ نەگریام .. ئینجا تا من بژیم ئەم درۆ یەش بەلاپەرەی کتێبەکانەوە دەمێنیّ .

مەت : دووایی ؟

هن : کتێبەکان جێگەی منیان تێدا نامێنیّ ..

مەت : شتیّ ناکەی ، دووبارە بژێتەوە ؟

هن : کاتم بەسەرچوو ، تەواو ، ئەوەی بۆم کرا هەر ئەوەندەیە .. ناتوانم هیچی تر بکەم ..

«تابلۆی دەستی چەپ رووناك دەبێتەوە «ڤینا» ی کچە ناشیرین قسەدەکا» .

ڤینا : کات تەواو ..
مەت : «پەشۆکاوە ، بۆڤینا» تۆی ؟
ڤینا : ڤینام ناوە .
مەت : تۆش دەژی ؟
ڤینا : بەڵێ منیش دەژیم
مەت : تۆچیت کردووە ؟ تۆشیان گوللە باران کردووە ؟
ڤینا : نەخێر :
مەت : تۆش پیلانت لێ کراوە ؟ تۆشیان خنکاند ؟ چۆنیان کوشتی کە تا ئێستاش هەر بژی ؟
ڤینا : نەخێر .. نەخێر .. شتی وانیە .. من یەکەم کچ بووم سەرکەوتمە بان تالاّ .. سەرکەوتمو لەوێ دانیشتم .. هەژدە ڕۆژی لێ مامەوە ..
مەت : جاکەی ئەمە کردەوەی مرۆڤی ژیرو هۆشمەندە ؟ ئەمە بەکەڵکی چ دێ ؟
ڤینا : بەڵێ ڕاست دەکەی . بەلاّم هەژدە ڕۆژ بەو ئاسمانەوە گاڵتەی پێ ناکرێ ونیشانەی ئارەزووی مرۆڤایەتی یە کە هەرگیز نامرێ .. خەڵکەکە ئەمەیان بینی ، گوتیان کارێکی بە سوودی کردووەو تێ گەیشتن کەبەڵێ ژیان پێویستە .. من شتێکی وام نەکردووە شایانی ئافەرین بێ . بەلاّم بەرلەمن کەس ئەمەی بەخەیاڵدا نەهاتووە .. ئەم ڕووداوەیان پاش مردنم تۆمارکرد .. خەڵکەکەی دیکە نەژیان ، تەنیا من نەبێ ماوەی ١٥ ڕۆژ ژیام .
مەت : ڤیناخان ، بۆ سەرکەوتیە بان تالاّ ؟
ڤینا : ئەی چی بکەم ؟ هیچی ترم لەدەست نەدەهات .. حەزیشم بەژیان دەکرد .. هەر چەندەی کارەکەم بێ مانابوو . بەلاّم شتێك بوو کەس نەیکردبوو . کچێکی ناشیرین بووم ، مێردم نەکردبوو . هیچ دەرگایەکی ژیانم شك نەدەبرد ، نەدەمتوانی نە تاوانێك بکەمو نە شیعر هەڵبەستن . بەم حاڵە سەڵماندم کە منیش ئارەزووی ژیانم هەیە .
«شانۆ ڕووناك دەبێتەوە .. تابلۆکان وەکو جارانیان لێ دێتەوە .. مەت لەم لا بۆ ئەولا ڕادەکا ، وەك لە چنگ تابلۆکان ڕابکا دەستی دەخاتە بان سەری ، وەك بەرد باران بکرێ»
مەت : «هاواردەکا» کلێر .. کلێر .. «کلێر لەخەو ڕادەپەڕێ» کلێر دایکە .. باپیرە ..
کلێر : «پەشۆکاوە» مەت ئەمە چیتە ؟ من وا لێرەم ..
مەت : باوکە .. باوکەگیان
«نك‌وری بەپەشۆکاوی لە پلیکانەکان دادەبەزنو کنیاتا بەدەرگای چێشتخانەوە دێتە ژووری»
نك : ئەمە چ ڕووی داوە ؟
ری : لەسەر خۆ کورم لەسەر خۆ ..
«دەنگی سەعات وردە وردە بەرز دەبێتە وە»
مەت : «دەکەوێتە سەرکەنەپە» کۆتایی یە .. کاتی میش کۆتایی دێ ! ..
دکتور : «لە پلیکانەوە دادەبەزێ» کازێوەیە
«بەتوندی دەرگای ژوورەوە دەکرێتەوەو دادەخرێ .. دەنگی بامان گوێ لێ یە»
ری : زووکە کنیاتا ئەم دەرگایە داخە .
نك : منیش خەریکم بەدەست ئەم سیرە سیرەوە شێت دەبم .
مەت : نەخێر .. دایمەخە «هەڵدەستێتە سەرپێ» ئیدی باکم بەم سیرەیە نیە .. ئیدی ئەوەی دەنگە گوێم لێ نیە .. هەر چەندە کەرم بەلاّم ئەگەر دەژیام با هەر دەنگی دەرگام گوێ لێ ببوایە «لە دیواری ڕەنگ شین نزیك دەبێتەوە» نا.. نەدەنگ نەڕەنگ . هیچیان بوونیان نیە . هەر چەندەی نابینامە . بەلاّم ئەم تیشکە شینەم بەسە «لە پەنجەرەوە تیشکی شینی ئاسمانی بەدەردەکەوێ» . «بەدەنگی بەرز» دەمەوێ بژیم .. دەمەوێ لە گەڵ شیناتی بژیمو بەس .. دەمەوێ بژیم .
«شۆ لەپلیکانەوە دادەبەزێ . لەسەرخۆ دەستەکانی دەکوتێو لە شوێن خۆی دادەنیشێ .. دەنگی سەعات بەرزە» .
شۆ : خەریکە ڕۆژ دەبێتەوە ..
«هەراو هۆریای دەرەوە نزیك دەبێتەوە .. دەرگا دەدرێتە بەر دارو بەردو خشت .. دەمو چاوێك لە پەنجەرەوە دەردەکەوێ»
مەت : «لەسەرخۆ» سەبرکەن .. واهاتم «بەرەو دەرگا هەنگاو دەنێ .. ئەوانەی‌تر دەپەشۆکێن»
ری : «دەقیژێنێ» بۆکوێ ؟ بۆ کوێ دەچێ ؟
نك : «دەکەوێتە دووای‌مەت» ڕاوەستە مەرۆ .. ئەوەشێت بووی ؟ .
کلێر : «بازووی مەت دەگرێ» مەت .. مەت .. نایەڵم بچیتە دەرەوە دەتکوژن .
«تادێ هەرای دەرەوە زیاتر دەبێ»
مەت : «بەهێمنی ئاور لە دەرەوە دەداتەوەو بە هەمووانی‌ئی» دەبێ بڕۆمە دەرەوە ..
ری : ڕۆڵە دەتکوژن
نك : «بۆشۆ» باوکە شتێ بکە .. مەت بەگوێی تۆ دەکا ..

ـ چ قەوماوە ؟

ـ « لە بناگوێی هاوار دەکا» مەت تەمایەتی بچێتە دەرەوە !

ـ بەپەشۆکاوی هەڵدەستێتە سەرپێ» مەت واز لەو خەڵکەی دەرەوە

ـ ئەوانە تێ ناگەن .. وازیان لێ بێنە .

ـ : وەکو جاری جاران .. وانیە ؟ ئێوە خۆپەرستن .. حەز بەژیانی

ـکەکەی دەرەوە ناکەن ..

ـ ئەو کۆمەڵە رەش و رووتەی دەرەوە فام ناکەن .. لە هەوە نتە خۆت

ـسوو مەکە .

ـگێت لەدەرەوە : بێتە دەرەوە پارچە پارچەت دەکەین «مەت بەرەو

ـگ دەروا .. نك و کلێر پێشی لێ دەگرن»

ـ : بۆچی ناتانەوێ لەمانە بگەن ؟

ـ ئەمانە خۆیان نەفامن .. هیچ و پووچ و ناپیاون .: «دکتۆر لەسەری

ـدەی پیلکانەکان وەستاوەو دەستی لەسەر سنگ داناوەو

ـ نەکەنێ»

ـ بەگریانەوە خۆی دەکوتێتە سەرپێی مەت» جێم مەهێڵە مەرۆ ..

ـ مەرۆ .. من بۆ خۆم لەوێوە هاتووم و چاکیان دەناسم .. ئەوان گیان

ـ ی سەیرن .

ـگێت : لەدەرەوە پێ بنێتە دەرەوە پارچە پارچەت دەکەین

ـ کورم تۆیان ناوێ .. تۆیان گەرەك نیە ..

ـ ئەمانە مانای ژیان نازانن .. واز لە مردووەکانی دەرەوە بێنە .

ـ «بۆ دکتۆر دەچێ و دەپارێتەوە» دکتۆر گیان . توخوا ئەگەر قسەیەك

ـکەی ..

ـ : ئەو کەسەی خۆی نەزانێ چ دەکا . گوێش نادات کەس ..

ـ ناتانەوێ مەت بژێ ؟ وازی لێبێنن و بەدووای رامەکەن ..

ـکردەوەی خۆی بژێ ..

ـ و شێرە شێری دەرەوە لە ئەندازە بەدەر زیاد دەکا .. مەت هەوڵی

ـگ کردنەوە دەدا .. ئەوانەی دەرەوە پاڵ وەدەرگا دەنێن .. ئەوانەی

ـەوەیش مەت رادەکێشن .. مەت پاڵ بە ری ونك دەنێ و دەکەونە

ـ ری . دەرگا دەکرێتەوە مەت بەرەو دەرەوە بازدەدا .. ری و کلێر

نیشتوونە دەگرین منیاتا سەرسامە .. هەراو هۆریای دەرەوە پتر دەبێ ..

ـگی ناڵە ناڵ دێ .. بێدەنگی ژوورەوە تۆقێنەرە .. ماوەیەك

دەمێنێتەوە . پاشان دەرگا دەکرێتەوە . مەت دێتە ژوورەوە بەجل و بەرگی

و . قژی تێك ئاڵاوەو خوێن بەلاچاوی دەتکێ کراسی خوێناوییە

وچەقۆیەکی لە سنگ دراوە .. مەت هەر دوو دەستی لەسەر سنگییەتی .. بەم لاو بەو لادا دەچێ .. بەرەو مێزی ژەهری لەسەر دانراوە هەنگاو دەنێ .. چرکەی سەعات بەرز دەبێتەوە»

مەت : دکتۆر .. کاتم تەواو ؟

دکتۆر : بەڵێ .. «مەت پیاڵەی ژەهرەکە دەگرێتە دەست و بۆ دەمی دەبا .. هەرای دەرەوە هێورتر دەبێتەوە .. دەم و چاوێك لە پەنجەرەوە دەردەکەوێ» .

دەنگێك

لەدەرەوە : مەت .. مەت .. ئێمەقەرزاری تۆین .. تۆ ئاگرێکیت لە نێو ئێمەدا هەڵگیرساند .. دەرەوەو ژوورەوەت کردنە یەك .. لە نێوانمدا کەسانێك هەن مانای پێویستی ژیان دەزانن .. ئێستاکێ تێگەیشتن .. بەم زووانە لە دەرەوە شەر دەست پێ دەکا .. شەری خۆمان .. هەربژی مەت ..

«هەراکە دوور دەکەوێتەوە .. مەت بە دەستی لەرزۆك پیاڵەی ژەهر بۆ دەمی دەبا .. دکتۆر بە پەلە خۆی دەگەیێنێ»

دکتۆر : نەکەی .. مەت نەکەی .. هەڵسەتۆدەژی .. بەم حاڵە دەژی بەخوێناوی دەژی ..

گلێر : زۆر دەژی ؟

دکتۆر : «بە دەست ئیشارەت بۆ ئەوانەی ژوورەوەو تابلۆکانی دیوار دەدا»لەهەمووان زیاتر .. لە هەمووان زیاتر .

«دەرەوە رووناك دەبێتەوە .. رەنگی ئاسمان ئاڵە .. لق درەختێکی بەهارە لە دەرەوە سەرهەڵدەدا .. مەت دەکەوێتە سەر عارد»

دکتۆر : دەژی .. ئەمەتا دەژی

نك : «هاواردەکا» مەت .. مەت

مەت : «لەشوێنی خۆی» کلێر .. لێرەم .. لێرەم

کلێر : «بەشوێن دەنگەکە دەگەرێ» مەت لە کوێی .. مەت ؟

مەت : وا لێرەم .. کلێر .. دایکە .. «لە گەڵ خۆی» گوێی لێم نیە .. نامبینێ .. کەواتە من دەژیم «سەری دەکەوێتە سەرزەوی» .

دکتۆر : بەڵێ .. تۆ دەژی

«چرکەی سەعات .. پەردە»



# بنچینەی شانۆی رادیۆیی کوردی

لێکۆڵینەوەی : کەمال رەئووف محەمەد

● **پێشەکی**

بنچینەی شانۆو درامای هاوچەرخی کوردی ی ـ بەبروای ئێمە ـ بەسێ قۆناغ دامەزراوە : **قۆناغی شانۆی رۆژنامە ، قۆناغی شانۆی قوتابخانە ، قۆناغی شانۆی رادیۆ .**

لەرایەڵەی ئەم باسەش دا ؛ یێکەم رادیۆی کوردی ی ـ عێراق ، دەورێکی چاك و بەفەری گێرا بۆ هەڵکەوتنی (شانۆو درامـای رادیـۆیی)و کاریشی لە بیرو هۆشی جەماوەر کرد بۆ تێگەیشتنی‌و پێشکەوتنی ، هەروەها کەشێکی باشی خوڵقاند بۆ بڵاوکردنەوەی (رۆشنبیری ی نواندن)و پەروەردەکردنی هەستی ئاکتەران.. بەلام موخابن ، رادیۆی نێوبراو ـ کاتی خۆی ـ لەبەر نەبوونی ی پلانێکی زانستی ی و هۆی تەکنیکی ی ، نەی‌توانی (مـەتن)ی درامـاکان یان (تۆمار کراوەکان) بپارێزێت و باسی پیـاوانی ئەو هونـەرەش هەڵ بگـرێت . بە ئەم پێیەو بە ئەو رۆشنایی‌یەش کە شانۆی رادیۆ «بەشێك»ی شانۆی کوردی‌یە ؛ دیـارە دۆزینەوەی یان ناسینەوەی ریشەو (بنچینەی شانۆی رادیـۆیی کوردی) چەنـد کارێکی ئاسـان نی‌یە ، هێندە پتر کارێکی پێویست و بەکەڵکە.

لە ساڵی ١٩٧٨ بە دوواوە ـ لە رایەڵەی پرۆژەی نووسینی مێژووی رادیۆی کوردی ی کە تەواو نەبووە ـ بە گەرمی ی لە ئەو باسـەش وۆرد بوویـنـەوەو سەربـارەی دەست نەکـەوتنی (بـەڵگـەنامەی باوەر پێکراو) لە نێو کۆری رۆشنبیران دا بۆ هەواڵە یێکـەمەکانی سەرەتا گەراین .. سەر ئەنجام کۆمەڵێك بیرەوەری‌و چەند (مەتن)ی دراماییمان دەستگیر کرد کە باری ناسینی سنووری مێژوویی ئەو هونەرەی بۆ ئاسان کردین و بۆمـان دەرکـەوت کە لە سەرەتادا «٣» تیپی شانۆی رادیۆ . بنچینەی ئەو هونەرەیان دامەزراندووە کە ئەمەن :

**١ـ تیپی ساڵح یەحیا**
**٢ـ تیپی شەماڵ صائیب**
**٣ـ تیپی رەفیق چالاك**

ئەم تیپانـە چۆن بوون و کەی دامەزراوون و چی‌یان کردووەوە بیرەوەری ی کەسـان و دەنگی بەڵگـەنامەی نوێی ـ دەستگیربوو ـ چی روون دەکەنەوە ؟ هەروەها لووتکەی ئەم هونەرە رێکەوتی چ رۆژگارێك و کام تیپ بووە ؟

● **تیپەکان**

**یێکەم : ساڵح یەحیاو تیپەکەی**

لە ١٨/٥/١٩٧٩دا دیدەنی ی خۆی‌و چەند ئاوەڵێکی ئەندامی تیپـەکـەمان کردو گفت و گۆمان لێوەرگرتن .. ساڵح یەحیای بەرێوەبەری تیپەکە گوتی : (لە مانگی تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٤٧دا من و چەند قوتابی‌یێکی کورد لە دار المعلمین الریفی بەغـدادا ، گەیشتینـە ئەو ئیستگـەیە بۆ پێشکەش کردنی چیرۆکی تەمسیلی ی هەفتانەی کۆمەلایەتی گاڵتە جاری ی . هەتا دەورو بەری مانگی نیسانی ١٩٥٠ نێزیکەی «٤٠» تەمسیلمان پێشکەش کرد کە یێکی «٢ دینار» پاداشتی بوو .) .

حسێن جەلال ؛ ئەندامێکی تیپەکە گوتی : (لە سەرەتادا

١



★ وێنەی فۆتۆگرافی تیپی تایبەتی تەمسیل ـ رادیۆی کوردی‌ی بەغداد ،تیپی رەفیق چالاك» : فایەق چالاك ، ئەحمەد مەحموود ، رەفیق چالاك ، نووری عەنبەر ، ئەحمەد دلاوەر .

ئێمە بەناوی گێرانەوەی سروودی کوردی‌یەوە ، چووینە سەر ئیستگەو لە شیعری شاعیرانی وەك زێوەرو بێکەس سروودمان دەخوێندەوە !) .

هەردووکیان ئەوەیشیان گێرایەوە کە بەرهەمەکانیان (بەر تۆمار کردن نەدەکەوتن) و تیپەکەیشیان ـ بەقسەی خۆیان ـ لە ئەم کەسانە پێك هات بوو ، هەروەها ئەم تەمسیلانەیشیان کردووە

**ئەندامەکانی تیپەکە**

١ـ سالح یەحیا ـ بەرێوەبەری تیپەکە
٢ـ حسێن جەلال ـ ئەندام
٣ـ عەبدوول محەمەد قادر ـ ئەندام
٤ـ محەمەد سەعید بێبەش ـ ئەندام
٥ـ مەعرووف حسێن بەرزنجی ـ ئەندام
٦ـ عەبدولوەهاب ئیسماعیل ـ ئەندام
٧ـ عەبد محەمەد فەهمی ـ ئەندامی (ناو بەناو)
٨ـ بەدرە ددین ...؟ ـ ئەندام (ناو بەناو)

**تەمسیلە پێشکەشکراوەکان**

١ـ شایی یێکەی شارەزوور .
٢ـ قۆپی‌یە .
٣ـ ئەلە وورگەو دکتۆر .
٤ـ حوجرەو قوتابخانە
٥ـ لە مەیخانەدا .
٦ـ دلداری‌و پەیمان پەروەری‌ی ـ ئە . بێ . هەوری

٧ـ پیسکەی تەرپیر ـ مۆلێر .

شایانی باسە ، هونەرمەند رەفیق چالاك ، لە یادداشتی خۆی‌دا نووسیویەتی : (سالی ١٩٥٠ بەرەلا کرام .. هەموو هەفتەیێك تەمسیلی نیو سەعاتیم ئامادە کرد ـ گۆراو یان دانراو ـ ئەمدا بە ئیستگە بەرامبەر ٣ دینار .. لەوکاتەدا تیپێکی تەمسیلی لە ئیستگەی کوردی‌دا دامەزرابوو لە لایەن کاك سالح یەحیاوە ئەو چیرۆکانە بۆ ئەو بوو !) .

**دووەم : شەماڵ صائیب و تیپەکەی**

لەچەند دیدەنی‌دا ، باسی رابوردوومان لە شەماڵ صائیب پرسیوەو هەر هێندەی گوتووە گۆیا ـ شتی‌وا ـ تەمسیلیان کردووە ،تەنانەت لە ١٩٨٣/٦/١٦دا ئەوەیشی هاتەوە یاد کە سالآنی ١٩٤٨ ـ ١٩٤٩ لە تەمسیل کردن دا نازدارو ئەسمەر فەرهادی هەردوو جووتە خوشکی گۆرانیی بێژی رادیۆ ، بەشدار ببوون .

راستی‌یێکەی ئەو چەند ووشانە زۆر تروسکایی نەدەدا ، بۆییێکە لە دیدارێکی ١٩٨٣/١/١٢داو لە رایەڵەی گفت و گۆیێکی سەرزاری‌دا لەگەل د . عیززەددین مستەفا ، باسی رەوانترمان دەستگیر بوو کە گوتی : (لە دەمەدەمی دووایی هاتنی سالی ١٩٤٨داو هاتنی سالی ١٩٤٩ ـ تشرینی یێکەم بۆ کانوونی دووەمی ١٩٤٩ ـ ئێمە یێکەم تیپی تەمسیلی رادیۆمان دانا کە ئەمانە بووین :

١ـ شەمال صائیب ـ میحوەر بوو ـ بەرێوەبەری تیپ . لە سانەوی ئەعظمیەدا بوو . تەمسیلەکان زۆری شەمال دەینووسین . وەك لە یادم دا مابێت «وورگە گا» و «ژیانی قوتابی» تەمسیلمان بوون .
٢ـ عیززەددین مستەفا رەسووڵ ـ قوتابی کۆلێجی شەریعەت .
٣ـ جەمال عەبدولقادر بابان ـ قوتابی کۆلێجی حوقووق .
٤ـ محەمەد سەعید کانی‌مارانی ـ قوتابی کۆلێجی حوقووق .
٥ـ عەلی مەردان ـ گۆرانیی بێژ .
٦ـ نازدارو ئەسمەر فەرهاد ـ گۆرانیی بێژ.
٧ـ رەئووف کەریم بەگ «الخالدی» ـ مذیع .
٨ـ عەبدوللا عەززاوی ـ مخرج .

هەروەها بە هاوکاریی مۆسیقەی ؛ ئەحمەد خەلیل و غانم حەددادی کەمانجەژەن) .

د . عیززەددین پتر لەسەر بابەتی تەمسیلەکان گوتی : (تەمسیلەکان لە رووی باری تەندروستیو خوێندەواری‌یەوە ، هەروەها بەگشتی کۆمەلایەتی‌ی بوون . نیزیکەی «١٠» تەمسیلێکمان پێشکەش کرد . هەر یەکی «٢ دینار» پاداشتی بوو) .

لەمەر پاشە رۆژی تیپەکەش گوتی : (شەمال صائیب گیراو فەسڵ بوو لە خوێندن . تیپەکەش هەڵوەشایەوە . هەر پاش دوو هەفتە ساڵح یەحیا پەیدا بوو . هات بە شوێن منیش دا ، بەلام من نەچووم) .

**● هەڵوێستەیێک بۆ راستیی**

لە ئەم شوێنــەدا ـ پێش باس کردنی تیپی سێیــەم ـ پێویستە بووەستین و بڵێین ئەو باسانە ـ سەرزارییانە ـ بە ئەوە بەهــێــز دەبــن و ساغ دەبنــەوە کە بەڵگــەنــامــەی باوەرپێکراومان لە بەرامبەردا راگرتن .. بۆ ئەمەیش کۆششی سەختمــان سەری گرت و توانیمــان ئەو راستییــانە بە ئەم شێوەیە بناسینەوە :

ئە :ـ وەك حسێن جەلال ـ ئەندامی تیپی یێکەم باسی‌کرد ، راستــە ، لە سەرەتادا ئەو دەستەیە بەناوی (**صالح یحیی وفرقته ـ غناء وأناشید**)ەوە لە رادیۆی کوردی‌دا دەرکەوتوون ئەوەك بەناوی تەمسیل کردنەوە . ئەو تیپە بە ئەو جۆرە ، یێکەم جار لە ١٨ی نیســانی ١٩٤٨دا هەتــا ٩ی مایسی ١٩٤٨ لە رۆژانی یێك شەممەدا «سەعات ٣٠ر٥ ــ ٥٠ر٥ د» بۆ ماوەی «٢٠» دەققە دەرکەوتووە . جارێکی دی لە ٣/٣/١٩٤٩دا هەتا ٣٠/٦/١٩٤٩ لە رۆژانی پێنج شەممەدا «سەعات ١٥ر٥ ــ ٤٥ر٥ د» بۆ ماوەی «٣٠» دەققــە دەرکــەوتــووە ، بەلام ئەم جارەیان بە ناوی (**منهج صالح یحیی و فرقته**) .

ئەوی سەرنج رادەکێشێت ئەوەیە ـ شارەزایانی رادیۆ لە ئەم باســە پتــر تێدەگەن ـ ناونیشانی «گۆرانیی و سروود ـ أغاني و أناشید» لەگەل ناونیشانی «بەرنامە ـ منهج» جودایی هەیەو دەشێت لە ئەم «بەرنامە»یەدا کە ماوەکەی نیو سەعات بووە (تەمسیل) یان پێشکەش کردبێت .

شایــانی باســە بۆ یێکەم جار لە بەرنامەکانی رادیۆی کوردیــی‌دا رۆژانــی هەیــنــی ١٠ و ٢٤/١٢/١٩٤٨ ناوی (تــەمسیــل ـ تمثیلیــة) هاتــووە بەبێ روون کردنەوەی ناوی تیپەکەو ناونیشانی تەمسیلەکە .

بێ :ـ بۆ تیپی شەمال صائیب ، ئەوا راستیی ئەوەیە : لە ٦/١/١٩٤٩ دا بەناوی (شمال صائب و فرقته ـ أناشید)ەوە رۆژی پێنج شەممە ، سەعات «٤٠ر٥ ــ ٠ر٦ د» دەرکەوتووە.

جارێکی دی بە ناوی (منهج شمال صائب و فرقته) لە ١٠/٢/١٩٤٩ هەتــا ٢٩/٩/١٩٤٩ رۆژانی پێنج شەممە ، سەعــات «١٥ر٥ ــ ٤٥ر٥ د» بۆ ماوەی «٣٠» دەقــقــە دەرکــەوتــوون . لە ئەمــەیش گرنگتــر لە ١/٩/١٩٤٩ هەتــا ٢٩/٩/١٩٤٩ بەنــاوی (تــۆمــارکراوەکان ـ مسجلات شمال صائب وفرقته) دەرکەوتووە . لە ئەمانەیش گرنگترو ئاشکراتر : رۆژانی ٤و ١١و ١٨و ٢٥/٨/١٩٤٩ بەنــاوی (تمثیلیة الأسبوع ـ شمال صائب و فرقته) دەرکەوتوون کە یێکەم جارە ئەوها ئاشنا بکرێن .

شایانی باسە ، پاشتر ناوی (ساڵح یەحیا) و (شەماڵ صائیب) نەهاتووەو بۆ وێنەش لە یێکەم هەفتەی مانگی نیسانی ١٩٥٠دا هەتا دووا هەفتەی کە ٢٧/٤/١٩٥٠ دەگرێتەوە ، ناوی (تمثیلیة الاسبوع ـ رۆژانی پێنج شەممە :ـ ٣٠ر٥ ــ ر٥ د) هاتووە بەبێ ناو هاتنی کەسیان ، بەلام زۆر پێدەچێت هەر شەمــاڵ صائیب و ئاوەڵەکــانی بووبن ، ئەگەرچی گفتارەکەی رەفیق چالاك یان گفتارەکە د . عیززەددین گومانێ دەبەخشن لە ئەم ئاستەدا .

دووا تێبینەشمان لەئەم بارەیەوە ، ئەوەیە ، ئەگەر چی سروودو گۆرانیی‌یێکــانی شەمــاڵ صائیب و تیپــەکەی (بەر تۆمارکردن کەوتبن) ئەوا (تەمسیلەکان هەرگیز بەر تۆمار کردن نەکەوتوون و راستەوخۆ وەك (بەرنامە)ی ساڵح یەحیا بلاوبوونەتەوە ، بەلام بە پێچەوانەی گفتاری ساڵح یەحیاوە لە سروودەکانیان دا هی ئەوتۆ هەیە (بەر تۆمار کردن کەوتووە) وەك سروودی (تاج) کە لە ٤ی نیســانی ١٩٤٩دا بلاوکــراوەتــەوەو لە ٦/٦/١٩٤٩ بە تۆمارکراوی‌ی دووبارە بلاوکراوەتەوە . لەگەل ئەم راستییانەش

- وەك خۆمــان ئاگــادارین ـ لە گەنجینەی رادیۆی کوردیی‌دا (هەرگیز) یێکێ لە ٭و سروود و تۆمارکراوانەی ئەو رۆژگارانەی شەمــاڵ صائیب و تیپــەکــەی یان ساڵح یەحیــاو تیپــەکــەی نەماونەتەوە بۆ ئەم رۆژگارە .

**سێیەم :ـ رەفیق چالاك وتیپەکەی**

رەفــیق چالاك لە یادداشتی ـ ساکــاری ـ نووسراوی خۆیدا دەگێڕێتەوە کە ؛ لە سەرەتاکانی ساڵی ١٩٥٠دا هەتا ١٩٥٥ لە رادیــۆی کوردیی عێراق دا بە «مــذیع» دامەزراوەو لەگەڵ چوونە رادیۆش (تیپی تەمسیل)ی دامەزراندووە و هەتا کارگـێڕ بووە . هەروەهــا ئەو تیپــە نزیکەی «٢٠٠» تەمسیلی هەفــتــانــەی پێشکــەش کردووە، چ لە نووسینی خۆی یان وەرگێڕاوو ئامادەکراوی ، یان نووسراوی ئاوەڵەکانی .

راستیی‌یێکــەی لە پاشمــاوەکانی ئەو تیپە ، لە رادیۆی کوردیی‌دا بە تەنێ شریتی چیرۆکی تەمسیــلی (باوەژن) ماوەو ئیدی چ هەواڵ و یادگارێکی لێنەماوە .. بەڵام بە قسە وەرگرتن لە (ئەندامە زیندووەکان)ی ، ئەوا ئەوتیپە ، لە مێژووی رادیۆی ناوبراودا (یێکەم تیپی تەمسیلی رەسمی)ی بووە کە ئەمەیش بەڵگــە نامــەی رەسمیی ساغی دەکــاتــەوە . بۆ وێنــەش بەڵگەنامەی (مدیریە الدعایة العامة ـ بغداد / ژ : ٣٦٣٧ لە ١٩٥١/٩/١٨) دا بڕیاری داوە (تیپی تایبەتی تەمسیل ـ لە رادیۆی عەرەبیی‌و کوردیی‌دا پێك بێت و ئەم کەسە کوردانەش لەنێو ناوە دامەزراوەکان دان ؛ (نووری عەنبەر ـ بە ٢ دینار) و (ئەحمەد دلاوەر ـ بە ١٥٠٠ فلس)و (فایەق چالاك ـ ١٥٠٠ فلس)ی کرێی هەفتانە .

**کەی ئەم تیپە (چیرۆکی تەمسیل)ی پێشکەش کردووە ؟**

مەتنێکی چیرۆکێ ، لە ئەو چیرۆکانە بەناوی (لە رێی پارە)دا بە ژمــارە «٤»ی چیرۆکــەکــان نیــشــانــە کراوە مێــژووی ١٩٥٠/٦/٢٦ی لەسەرە .. بە ئەم نیشانەیەش ـ کە چوارەم بێت ـ پێ‌دەچێت (یێکەم چیرۆك) لە سەرەتای ئەو مانگەدا بەڵکو لە دەوروبەری ٥ـ١٩٥٠/٦/دا پێشکەش کرابێت کە لێمان ئاشکــرا نیــیــە چ چیرۆکێ بووە.. دووا مەتنی چیرۆکیش کە دەستگیرمان بووە ؛ یێکەم ئۆپەرێتی کوردیی (دڵداری کورە شوان) بووە کە لە ١٩٥٥/٣/٢٩دا پێشکەش کراوە . بە ئەم رۆشنایی‌یە ، سنووری مێژوویی تیپەکە روون دەبێتەوە .

لەگــەڵ ئەوانــەی رابــوردن ، داخۆ تەواوی ئەندامانی تیپەکە هەروەها هەواڵی بابەتەکانی تەمسیلەکان چۆن بوون؟ کۆشش بۆ ناسین و کۆکردنەوەی «٤١»ی مەتنی ئەو چیرۆکانە ـ لەگــەڵ پەیــدا کردنی چەند وێنە تۆمارکراویان ـ گەلێ وەڵامی راستمان دەخەنە دەستەوە کە ئەمەن :

**ئەندامەکانی :**

ئە : هەمیشەیی

١ـ رەفیق چالاك ـ بەڕێوەبەری تیپەکەو نووسەرو ئاکتەر .
٢ـ ئەحمەد دلاوەر ـ ئەندام و نووسەر .
٣ـ نووری عەنبەر ـ ئەندام .
٤ـ ئەحمەد مەحموود ـ ئەندام ، «هەروەها گۆرانیی بێژ»
٥ـ فایەق چالاك «دلزار» ـ ئەندام .
٦ـ عەبدوڵلا عەززاوی ـ مخرج .

بێ ـ هاریکارەکان .

١ـ قادر دیلان ـ مۆسیقە ژەن «ئاکتەر» .
٢ـ عەلی مەردان ـ گۆرانیی بێژ «ئاکتەر» .
٣ـ عەلی ئیبراهیم ـ . . . . . «ئاکتەر» .
٤ـ تایەر تۆفیق ـ گۆرانیی بێژ «ئاکتەر» .

**چیرۆکەکان**

«ناوی نووسەر و مێژووی دانانیان یان بڵاوکردنەوەیان بە رۆشنایی مەتنەکان»

١ـ لە رێی پارەدا ـ نووسینی : ئەحمەد دلاوەر ـ ١٩٥٠/٦/٢٦
٢ـ ژان بوونەك ژن ـ نووسینی : رەفیق چالاك ـ ١٩٥٠/٧/٤
٣ـ خەسوو ـ نووسینی : ئەحمەد دلاوەر ـ ١٩٥٠/٧/١٤
٤ـ تاسەی بەنگ کێشان ـ نووسینی : رەفیق چالاك ـ ١٩٥٠/٨/٢
٥ـ دراکیۆلا ـ ئامادەکراوی : رەفیق چالاك ـ ١٩٥٠/٨/٩
٦ـ خزمی خراپ ـ نووسینی : رەفیق چالاك ـ ١٩٥١/١٠/٢٩
٧ـ نەخۆشیی سەفلس ـ نووسینی : رەفیق چالاك ـ

١٩٥١/١٢/١٠

٨ـ ژن هێنان ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ١٩٥٢/١/٢

٩ـ گوڵی خوێنـاوی ـ شیعری گۆران . ئامادەکردنی : رەفیق چالاک ـ ١٩٥٢/٢/٤

١٠ـ ئامۆژگاری مایکرۆفۆن ـ نووسینی : رەفیق چالاک (٤ بەش : شەکراو خواردنـەوە، پاشتیـلانـە، ناووکە برانە، لە کۆڵان دانیشتن) ١٩٥٢/٢/١١ .

١١ـ باوەژن ـ نووسینی : ئەحمەد دلاوەر ـ ١٩٥٢/٣/٢

١٢ـ دەردی هاری ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ١٩٥٢/٣/١٦

١٣ـ إبن سینا ـ ئامادەکردنی : رەفیق چالاک ـ ١٩٥٢/٣/٢٣

١٤ـ نەخۆشیی سیل ـ نووسینی رەفیق چالاک ـ ١٩٥٢/٦/١٧

١٥ـ جێژنتان پیرۆزبێ ـ نووسینی رەفیق چالاک ـ ١٩٥٢/٦/٢٤

١٦ـ دووا رۆژ ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ١٩٥٢/٧/٦

١٧ـ هەوێ ساری ـ نووسینی ئەحمەد دلاوەر ـ ١٩٥٢/٨/٣٠

١٨ـ هاتە رێزەی خەڵقی ـ نووسینی : ئەحمەد دلاوەر ـ «؟»

١٩ـ هاوڕێ گورگەکان ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ «؟»

٢٠ـ تەلەفوون ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ١٩٥٢/١٢/١١

٢١ـ پاداشتی چاکە ـ نووسینی رەفیق چالاک ـ ١٩٥٤/٢/٢٦

٢٢ـ هامسەری ژیان ـ نووسینی : قاسم خەطاط . گۆرینی : رەفیق چالاک ـ ١٩٥٤/٣/٢٩

٢٣ـ ئامۆژگاریی مایکرۆفۆن ـ نووسینی : رەفیق چالاک (٣ بەش : کوێخاو پیرێژن . کوری گەورە . ئەجری دراوسێ) ـ ١٩٥٤/٤/٣٠

٢٤ـ کرێ گرتەیی ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ١٩٥٤/٧/١٦

٢٥ ـ هەندێ نارێکیی ـ نووسینی رەفیق چالاک ـ ١٩٥٤/٩/٢٣

٢٦ـ ئاوازی ماتەم ـ نووسینی رەفیق چالاک ـ ١٩٥٤/١٠/١٧

٢٧ـ دادی ئاسمان ـ نووسینی رەفیق چالاک ـ ١٩٥٤/١٢/٢٤

٢٨ـ گڵگۆی تازەی لەیل ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟

٢٩ـ پیاو نەبوو ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟

٣٠ـ مارەیی ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟

٣١ـ تۆبە ـ نووسینی : قاسم خەطاط . گۆرینی : رەفیق چالاک ـ ؟

٣٢ـ کچەکەم نەبووایە ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟

٣٣ـ ئامۆژگاریی مایکرۆفۆن ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟

٣٤ـ ئەنجامی زۆر خۆریی ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟

٣٥ـ مێردی هەڵ خەڵەتێنراو ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟

٣٦ـ ئامۆژگاریی مایکرۆفۆن ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟(٣ بەش : ناپاکی هێوەر ژن . حەقی کێیە ؟) .

٣٧ـ حاجی قادری کۆیی ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟

٣٨ـ ژنی لاڵ ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟

٣٩ـ ئامۆژگاریی مایکرۆفۆن ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟(٣ بەش : جلی بووک . هاورێی بێوەفا . دەروونی خەڵقی) .

٤٠ـ دایکی خراپ ـ نووسینی : رەفیق چالاک ـ ؟

٤١ـ ئۆپەرێتی دڵداریی کورە شوان ـ شیعری محەمەد ئەحمەد طەها «کامەران» دەستکاریی‌و ئاوازی : رەفیق چالاک ـ ١٩٥٥/٣/٢٩

شایـانی باسە ، ناوی ئەم (تیپە) بە زۆریی بە ناوی (تیپی تایبەتی ئیستگە)وە پێشکەش کراوە ، بەڵام جاروبار بە ناوی (تەمسیل ـ تیپی رەفیق چالاک)ەوە هاتووە کە بۆ وێنە لە ٨ی مارتی ١٩٥٤دا ئەو ناوەی لێنووسراوە .

لە لایێکی دیەوە ئەگەرچی ئەو تیپە هەتا ١٩٥٦ نەژیاوە بەڵام تۆمـارکراوەکانی هەتا پاش ساڵی ١٩٥٨ دووبارە کراوەتەوە ، بەپێی سەرنج و ووردبوونەوەشمان ـ تەمسیلی باوەژن بەڵگەیە ـ تەمسیلەکان لەسەر (سیم وایەر) تۆمارکراوون و پاش پەیدا بوونی (شریتی موگناتیس)ی خراوونەتە سەر شریت کە موخابن لە نێو ئەو تەمسیلانەدا ـ بێ لە باوەژن ـ هیچی لە رادیۆ نەماوەو هێنـدە هەیـە هێنـدێ کەس لەلای خۆیـان لە رادیۆوە چەند تەمسیلێکیـان وەرگـرتـووەو بە تۆمـارکـراوی لای خۆیـان پارستوویانە کە لە «٤» تەمسیل پتر نییە .

● **ئەنجام**

١- هیــچ گومــان نـیـە (ســاڵح یەحیــاو تیپـەکـە)ی کە لە (مەنهەج)ی باس کراودا هێندێ چیرۆکی تەمسیلیان پێشکەش کردووە ، دەست پێشکەریان کردووە بۆ ئاشنابوونی هونەری درامــای رادیــۆیــی ئەگــەرچــی بە شێــوەیــێکی ســاکــارو بڵاوکردنەوەیەکی ڕاستەوخۆ کارەکەیان ڕاپەڕاندووە ؛ بەڵام

(شەماڵ صائیب و تیپەکە)ێ چۆن بە ئاشکرا ناوی تەمسیل کردنیان هاتووە ، دیارە لە ئەم باسەدا پتر دەوری هەبووە کە شەمــاڵ خۆی گیــانێکی هونــەرپەروەریی هەبووە و بۆ یێکەم جاریش (ئافرەت) لە کاریان دا دەوری هەبووە .

بە بڕوای ئێمە ، ئەم دوو تیپە کە لە یێك ماوەدا «١٩٤٨ - ١٩٤٩»دا هەڵکەوتوون و یێك باری تەکنیکی رادیۆیان دیوەو تەمسیلەکــانیــان بەر تۆمــارکــردن نە کەوتــووەو ئەندامەکانی تیپــەکانیش خوێندکاربوون و کارمەندی رادیۆ و خوێندکاری هونــەر نەبــوون ، ئەوا هەردووکیــان (یێك قۆناغ)ی کاروانی هونەری شانۆی رادیۆیی کوردیی پێك دەهێنن ، بەڵکو زۆر ڕاستە بڵێین ؛ یێکەم بەردی بنچینەن .

٢- تیپی رەفیق چالاك کە خۆیشی خاوەنی کۆمەڵێ بەهرەی ئەدەبیی‌و هونەریی بووە - پێشتریش مذیعی رادیۆی شرق - الادنیٰ بووە لە یافادا - هەروەها پێوەندیی ئەندامەکانی دی بە جۆرێکی هونەرەوەو خۆ تەرخان کردنیشیان بۆ هونەری شانۆی رادیــۆ - وەك تیپێکی رەسمیی - ئەمانە بەڵگەی جوداییی‌یە لە بەرامبەر ئەوانی دی .

ئەگــەر پتــریش ووردببینــەوە کە - ئێرە جێگەی هەموو ووردە لێکۆڵینەوەیێك نی‌یە - بەڵگەی زۆریشمان لەبەردەستە ؛ ئەوا کردەوەی ئەم تیپە لە ڕووی ئەدەب و هونەرەوە تەواو ژیرو توونایە.. تێکرا زمان پاراوو ڕەوان بێژ بووەو پێوەندیی‌یێکی توندو تۆڵی بەزمانی خەڵکەوە هەبووە .

لە ڕووی هونــەری نوواندنیشەوە ؛ ئەوا هەر لە ئەدای ژیرو دەنگ دەربڕینی هونەرانەوە کە هەمیشە جڵەوگیر بوون و لە سڵەمینەوەو پەشۆکان و تەتەڵە کردن بە دوور بوون ، هەتا دەگــاتــە دەنــگ گۆڕینی هەنــدێکیان بۆ پڕکردنەوەی کەلێنی نەبوونی (دەنگی ئافرەت) ئەمە وێنەی ئەوپەڕی توانایە .

بێ لەئــەوانــەیش ، لە ڕووی فێڵی رادیۆیی‌یەوە ؛ دەنگی کاریگەری جۆر بەجۆری بەکار هێناوە ، هەروەها بۆ بابەتەکان و بەشــەکانیان - هەتا ڕاددەیێکی باش - مۆسیقەی جیاوازو پەسەندی . هەڵبژاردوە.

تێکــرای بابەتەکانیش - کە مەتنمان لەبەر دەستە - بە ژیــری‌یــەوە هەڵبژێراوون و لە قەوماوەکانی کۆمەڵ و مرۆڤەوە هاتــوون و لایــەنگــیری کێشــەکانیان بووە . ئەمەیش هەر لە نیشانەکردنی بارو نەریت و دەردە کۆمەڵایەتی یێکانەوە دەست پێدەکــات هەتــا دەگاتە ئاشناکردنی دەوری چاکی مرۆڤ لە بنیات نانی پێشکەوتن دا .. چیرۆکەکانی (دراکیوڵلا ، ابن سینا ، حاجی قادری کۆیی) بەڵگەی ڕاستی ئەم لافەن . هەروەها ژیــرانەش پێوەندیی جەماوەری بە کەلەپووری ڕۆشنبیریی کوردیی‌یەوە بووژاندوەتەوە ، بۆ وێنەش چیرۆکی (گڵکۆی تازەی لەیل) بەڵگەی ئەم لافەیە .

لەلایــێکی دی‌یــەوە ؛ ئەوی زۆر گرنگــە ، ئەم تیپــە توانیــویــەتی لە هونەری شانۆی رادیۆیی‌دا هونەری ئاوازو گۆرانیی دابڕێژێت کە چەند چیرۆکێ ئەم مۆرەیان پێوە هەیەو هەرە وێنەی بەرزیش - کە موخابن تۆمار کراوەکەی لە دەست چووە - ئەو کارەیە کە یێکەم ئۆپێرای کوردیی (دلداری کورە شوان)ە .

دوواجــار سەرەرای سادەیی‌و سەرەتــای (هــونــەری تۆمارکردنی رادیۆیی) ئەوا تۆمارکراوەکان کە چەند وێنەیێکمان لەبەر دەستە، پەسەندو پاکن .

کەوابــوو ، بەڕاســتی (تیپی رەفیق چالاك) نەك هەر (دووەم قۆنــاغ) پێــك دەهێنێت ، بەڵکــو (لووتکەی شانۆی رادیۆیی) کوردیی‌یــەو بە بڕوای ئێمەیش - هەتا ئێستا - هەر تیپێ یان دەستەیێکی لە پاش هاتبێت ، نەگەییشتووتە ڕێزەی ئەوو هەر چتێکیشیــان پێشکــەش کردبێت - وەك خۆیــان - بە قۆناغی سێیەمی ئەو هونەرە دادەنرێت .

هەرچۆنێ بێت ، مێژووی شانۆو درامای کوردیی - بە گشتی‌ی - قەرزاباری (شانۆی رادیۆ) و ئەو (دوو قۆناغەیە) بە تایبەتیش دووەم .

یێکەم رادیۆی کوردی ی - عێراقیش بۆی هەیە شانازی بە ئەو راستی یـەوە بکـات کە پێش گەلێ رادیـۆی نێو جیهان هونـەری شانـۆی رادیـۆیـی تێدا بنـیـات نراوە . بە ئەم رۆشنـایی یـەش ، لە هەمـان کات دا ، هەمـان رادیۆ ئەرکی مێـژوویـی لەسـەر شانـە بۆ پێش خسـتنی ئەو هونـەرەو بووژاندنەوەی ئەو دەورە بێ‌هاوتایەی کە بێ‌گومان نووسەران و ئاکتـەران هاوبـەشی ئەم ئەرکـەن و بەرامبـەر پاشـە رۆژی ئەوهونەرە بەرپرسیارن !!

## پەراوێز

«وێنەیێکی درامای رادیۆیی»

بۆ کەڵکی خوێنـنـدەوار بەپێویستمـان زانی چەنـد وێنەیێکی جۆر بە جۆری درامای رادیۆیی بخەیینە روو ، بەڵام لەبەر درێژی‌یان کە بۆ لاپەرەیی گۆڤاریێ دەست نادەن ، ناچار بووین بۆ ئێرە ، بەتەنێ (بەشێ) وەربگرین لە چوار بەشی کۆمەڵە چیرۆکی (ئـامـۆژگـاری‌ی میکرۆفۆن) کە لە رلیەڵەی باس دا نێویان براوە .

ئەم بەشـەیـەش کە بەنێـوی (پاشتێلانە)یەو دانراوی رەفیق چالاکەو لە دەست نووسینی ئیمزا کراوی خۆیەوە وەرمان گرتووە ، مێژووی ١٩٥٢/٢/١١ لەسەرە کە دیارە هەر لە ئەو رۆژانەدا لەسەر رادیۆ بڵاوکراوەمەتەوە کە موخابن تۆمارکراوەکە لەسـەر رەفـەی رادیۆدا نەماوە . شایانی باسە لەسەر مەتنە دەسـت نووسـەکـەدا قەڵەمـی رەفـیق چالاك دەروەکـانی ئاکتەرەکانی دیاریی کردووەو بە ئەم شێوەیە : دەوری (عەلی) بۆ (فـایـەق چالاك)و دەوری (ژن) بۆ (ئـەحمەد مەحموود)و دەوری (میکرۆفۆن) بۆ (رەفیق چالاك) خۆی .

ئەمـەش تەواوی ئەو بەشـەیـە کە بە دەست کاری ی رێنووسەوە دەیخەیینە روو :

عەلی : ئافرەت ئەوە کوا لیرەکەی تەوقە سەرت ؟

ژن : بۆ چیتە ؟ بۆچی ئەپرسی ؟

عەلی : چۆن بۆچی ئەپرسم ؟ ئەی نابێ بزانم بۆ لە فێستەکەشت کردۆتەوە ؟

ژن : لێم کردۆتەوەو برایەوە !

عەلی : ئاخر لە کوێ یە ، چیت لێ‌کردووە ؟

ژن : ئەوە تۆ بۆ ئەوەنـدە . درێـژە بەشت ئەدەی ؟ پەنام بە تۆ خوایە !

عەلی : کچێ دەنگم دەرمەهێنە خوا لە ناوی دەمت با ! پێم بڵێ چیت لە لیرەکە کرد ؟

ژن : ئۆ ؛ هەر خۆت بە خۆت بی ئاوا !! چاووت لەو قیژو هوورە بێت کە ئەیکا بە سەرما !

عەلی : خۆمی چی بەخۆم بم؟ چیمە؟ شەلم ، کوێرم، قۆرم چیمە؟ کچێ کوا لیرەکە ؟!

ژن : توخوا ئەم پیاوە شەر نافرۆشێ ؟ ئێستا لیرەی خۆمە یا هی تۆ ؟

عەلی : هی تۆی چی‌یە ؟ لە ماڵی باوکتەوە هێنات ؟ کچێ کە تۆم مارە کرد دایکم بۆی نەهێنای ؟

ژن : ئێ ! ئیتر بۆچی ئەڵێی ؟ دایکت بە رەحمەت نەی‌داوە بەخۆم ؟

عەلی : کچێ ئێستا خۆم و خۆتی بۆچی‌یە ئافرەت ؟ کوا لیرەکە با دات نەپلۆسم ..

ژن : ئەیهو .. ئەیهو .. ئینجا بەزمە بەزم !

عەلی : بە ناموسم پێم نەڵێی چیت لە لیرەکە کردووە تەڵاقت ئەدەم !

ژن : ئینجا لە دەستت یەت .. هەموو شتێك ئەکەی .!

عەلی : قسە ناکەی ؟

ژن : لیرەکەم برد بۆ ئافتاو ! باشە ؟

عەلی : ئافتاو کێ یە ؟ کام ئافتاو ؟

ژن : ئافتاوی بووکی میرزا رەشید !

عەلی : موناسەبەت چی‌یە ؟ بە وەعدەی چەند رۆژ لات داناوە ؟

ژن : بسم الله ! وەعدەی چی ؟ بۆچی لێی خواستووم ؟

عەلی : ئەی چۆن ؟ بۆچی بۆت بردووە ؟

ژن : ئەی دوێنێ پاشتێلانەی نەبوو ؟

عەلی : پاش تێلانە مەعە - مەعنای چی ؟

ژن : ئەوی نەچووین بۆ شایی کە شووی کرد ؟ ئەی شەکرمان

بۆ نەهات ؟ ئەی نەچووین بۆ حەمام ؟ کورە عەیبە پیاوەکە بۆ ئەوەندە لەسەر شت ئەرۆی ! ئەوە تازە وات لێهاتووە !

عەلی : چیم لێهاتووە ؟ شێت بووم وەنی‌یە ؟ ئاخر بە دەست تۆوە شێت بووم! کچێ تۆ شێتت کردم! بایی ۳۰ فلس شەکرو پەنجا فلس نان خواردنی شایی‌و پەنجا فلس حەمام کە هەمووی ئەکاتە ۱۳۰ ، لە جیاتی ئەمە تۆ ئەچیت لیرەکەی تەوقە سەرت ئەبەی بۆ بووکی میرزا رەشید ! دەك موبـارەکم نەکرد ئاوا... ئافرەت گوێبگرە! ئەمە خاتمـەی بێت : سێ بە سێ تەلاقت کەوتبێ ، بە هیـچ مەزەبێـك چاك نەبێتـەوە ئەگەر جارێکی‌تر هیچ شتێك بەری بۆ پاشتێلانەی هیچ کەسێك ..

ژن : ئافەرم، ئافەرم! دەك موبارەك نەبێ لە عومرت بۆ چ پیـاوێکیت ! بەخـوا من ئەرۆم و یەك دەقیقە لەم ماڵە کاوول بووەدا نامێنمەوە .

عەلی کچێ نامێنیتەوە چیش ! نارەسەنی بێمێشکی جزێن .. وا من ئەچم بۆ بازار ، هەتا یەمەوە لێرە نەمابیت !!

ژن : ئەگەر مام لە جێی تۆ بم .. (دەرگا بە قایم پێوە ئەدرێ) با جلەکانم بپێچمەوەو لەم کاوول بووە دەرچم . بەخوا ئیتر لە توانامدا نەماوە !!

میکرۆفۆن : (پێ ئەکەنێ) .

ژن : بسم الله الرحمن الرَّحیم . ئەوە کێ‌یە پێ‌ئەکەنێ ؟

میکرۆفۆن : منم مەترسە ! من ، میکرۆفۆنی بەشی کوردیم ، هی ئیزاعە !

ژن : چیت ئەوێ باوکم ئیشت چی‌یە لێرە ؟ نازانی پیاو لە ماڵەوە نی‌یە ؟

میکرۆفۆن: من حەقم چی‌یە بەسەر پیاوە کوڵۆڵەکەتەوە؟ هاتووم یەك دوو قسە لەگەڵ تۆ ئەکەم !

ژن : قسەی چیم لەگەڵا ئەکەی ؟ چیت ئەوێ لە من باوکم ؟

میکرۆفۆن : ئەڵێم شتومەك مەپێچەرەوەو دانیشە لە ماڵەکەی خۆتاو لانە لە خۆت تێك مەدە ! کە هاتەوە ئاشتی کەرەوە! توخوا ئەو مێردە کوڵۆڵە ناحەقیەتی توورە ببێ ! ئاخر چ موناسەبەتە : لیرەیەك بدرێ بە ۱۳۰ فلس ؛ لە وەختێکا کە خۆتان موحتاجی ئەو لیرەیەن ؟ پاشتێلانەی چی‌و کالیاری چی ؟ ئەمە پێی ئەڵێن سواڵ کردنی بە عەدەب ! ئەوا یەکێکی‌تر شووی کردووەو کابرایەکی‌تر ژنی هێنـاوە، من بۆ ئاڵتـوونی بۆ بەرم !؟ تەرکی کەن ئەم عادەتە پیسە ناشیرینە !

ژن : ئەی عەیب و شوورەیی هیچ نەبەین بۆ بووك بەرامبەر بەو هەموو حەمام شایی و شەکراو خواردنەوەیە !؟

میکرۆفۆن : نەخێر هیچ مەبەن ! با خاوەنی شایی ئەگەر لە توانایا نی‌یە ئەوەندە مەسرەف نەکا ! هەر کەسە لە ژن هێنانا بە قەدەر بەرەی خۆی پێرابکێشێ ! تۆ ئەزانی خوشکێ ؛ هەزار ژن هەن بە دزی‌ی مێردەکانیانەوە شت ئەبەن بۆ پاشتێلانە ؟ تۆ ئەزانی هەندێ ژن دزی‌ی لە مێردەکانیان ئەکەن ، شتومەکی ناو ماڵ ئەفرۆشن و ئەی‌بەن ؟ خوا هەڵ ناگرێ وا لە ماڵ و مێردی خۆتان ئەکەن !

ژن : ئاخر باوکم ، ئەمە رەسم و عادەتەو عەیب و شوورەیی‌یە ئینسان شت بۆ ناسیاو نەبات ! لە پاشا بەدەستیاویشە..

میکرۆفۆن : دەستیاوی چی ؟ تەرکی کەن ! کە تۆ بۆ خەڵقت نەبردو خەڵق بۆ تۆی نەهێنایەوە ئەوا رەسم و عادەت نەما .

شتومەك نەپێچیتەوەو نەرۆیت نەوەکو تەلاقت بدا ! ماڵ لەخۆت مەشێوێنە خوشکێ ! میکرۆفۆن ئامۆژگاریت ئەکا کە شت نەبەی ، ئەگینا تەلاقت ئەکەوێ ! بە دوعا خوشکێ .لەبەر خاتری پاشتێلانە ماڵ لە خۆت تێك مەدە؟ دزی لە ماڵ و مێردەکەت مەکە ! بەدوعا .

ژن : توخوا ئەگەر برۆی ! هەتیو باوانت شێوێ قسەکانت زۆر خۆشن !

میکرۆفۆن : ئاخر بە سەری تۆ ئیشم زۆرە ! ئەچم بە لای ناوکە برانەوە .. بە دوعا .

ژن : خوا ئاگای لێت بێ . خوا حافیزت بێ !



## گەشتێکی دیکە:

# بەنێو کتێبە چاپکراوو یارمەتی‌دراوەکانی ئەمینداریێتی گشـــتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوان لە ساڵێکدا...

نووسینی : عەزیز ڕەشید حەریری

وێنەکان : محي الدين طاهر «ابوصباح»

● بەشی یەکەم

ئەمینـداریێتی‌ی گشتی‌ی ڕۆشنبـیری‌و لاوان وەکـو دەزگـایـەکی پەیـوەنـدار بە کاروباری ڕۆشنبیری‌و وەرزش و لاوانەوە، هەر لە ڕۆژی دامەزرانی‌یەوە، یەکێ لەو ئەرکە پیرۆزانەی گرتوویەتی‌یە ئەستۆ پشتگیری کردنــی لایــەنــی ڕۆشـنـبــیری‌ی کوردی بووەو، هەوڵی ئەوەی داوەو بەردەوامیشــە بۆ زێتـر بوژانـدنـەوەی ئەدەب و ڕۆشنبـیری بەهــەموو لقەکانی‌یەوە، بۆ ئەم مەبەستەیش، لە سەرەتای ساڵی «١٩٧٨» بەسەرەوە دەستی کردووە بە یارمەتی‌دانی ئەدیب و نووسەرانی کورد، ئیتر بەپێ‌ی تواناو دەست ڕۆیشتن ئەو بابەت و بەرهەمە ئەدەبی‌و ڕۆشنبیری‌یانەی پێشکەش کراون لە ڕێگەی لیژنەیەکی تایبەتەوە نرخێندراون، جا یا ئەوەتا هەر ئەمینـداری‌یەت لەسەر ئەرکی خۆی چاپی کردوون، وەیا یارمەتی نووسەرەکانیان دراوە.

بۆ ئەنجـامدانی ئەم کارەیش هەموو ساڵێك پارەیەکی تایبەت لە بودجەی ئەم ئەمینداری‌یەتە تەرخان کراوە، هەر هەموویشی بۆ چاپکردن و یارمەتی‌دان خەرج کراوە، ئەمەیان سەرەرای چاپکردن و بڵاوکردنەوەی «گـۆڤـاری کاروان»و، پاشکـۆکـەی کە «کاروانی وەرزش»ە تایبەتە بە کاروباری وەرزش و لاوانەوە.

لەتەك هەموو ئەمانەیشدا ئەم ئەمینداری‌یەتە، بەردەوام یارمەتی هەمــوو ئەو تیپ و ئەقـابـەو کۆمــەڵە ڕۆشنبیری‌و هونەری‌و وەرزشی‌ی‌و شانۆیی‌یانەی داوە کە لە ناوچەی کوردستاندا گورج و گۆڵی‌ی هەمەجۆر دەنـوێنن.. دەبێ ئەوەیش بڵێین کە ئەم هەموو پشتگیری‌و یارمەتی‌دانە

بەندە بە هەوڵ و کۆششی لێپرسراوو کارگەرانی ئەم ئەمینداری‌یەتەوە،بۆ سەلماندنی ئەم ڕاستیەش وا ئەمساڵیش ژمارەیەکی دیکەی ئەو کتێب و چاپکـراوانـەتـان دەخەینە بەرچاو کە لە ساڵی «١٩٨٨»دا چاپکراون و یارمەتی‌دراون، لەوانەیشە ژمارەکە لەمە زیاتر بێت کە تۆمار کراون؛ بەڵام ئێمە لەم ڕووەو دوو خاڵمان ڕەچاو کردووە:

**یەکەمیان :**
تەنهـا ئەو کتێبـانـەمان باس کردووە کە تاوەکو کۆتایی ساڵی «١٩٨٨» گەیشتوونەتە دەستمان.

**دووەمیان :**
ئەوانەی ژمارەی سپاردنی ساڵی «١٩٨٨»یان بەسەرەوەیەو بەس، لەگەڵ

تاك و تەرا لەو کتێبانەی کە هی سالّی «١٩٨٧»ن و، سالّی رابردوو باس نەکراون.

بەهەر حالّ هیوادارم ئەمسالّیش توانیبێتم سوودێك بە ئەرشیفی کتێبخانەی کوردیی بگەیەنم..

ئێستاش فەرموون ئێوەو کتێبە چاپکراوو بارمەتیدراوەکانی سالّی «١٩٨٨»، کە بە هەردوو زمانی کوردیو عەرەبی بلاّوبوونەتەوە..

## ● کتێبە چاپکراوەکانی سالّی/ ١٩٨٨ ●

### «أ» ★ کتێبە کوردی‌یەکان ★

| ناوی کتێبەکان | دانەرەکانیان |
|---|---|
| ١ـ چەپکی سێیەم لە دیوانی نووری | شێخ جەلالی شێخ جەمیلی نەقشبەندی |
| ٢ـ لە گەنجینەی کوردەواری. | مولود قادر بێخالّی |
| ٣ـ چەند گوتارەکێد رەخنەیی. | أنور محمد طاهر |
| ٤ـ زاراوەسازی پێوانە. | مسعود محمد |
| ٥ـ بەشێك لە چوارینەکانی بێبەش. | مەلا مەسعود بێبەش |
| ٦ـ ئافرەت لە قورئاندا. | عبد الرحمن قادر یونس |
| ٧ـ مەولوودنامەو بروانامەی دەشتی. | مەلا خدر ئەحمەد عەبدوللا |
| ٨ـ داستانا گلگامێشی. | وە: صلاح سعد الله |
| ٩ـ وەرنە ئەڤینێ. | سلمان کوڤلی |
| ١٠ـ گولّ و رووەکە جوانەکان لەناو مالّدا | مصلح محمد سعید<br>ساماڵ جلال عمر |
| ١١ـ دیوانی بێبەش «ب ٢». | مەلا مەسعوود بێبەش |
| ١٢ـ رەخنەی شانۆیی. | محسن محمد |
| ١٣ـ بۆ کابانیا مالێ. | ماجدة محمد علی قازی |
| ١٤ـ کامەران موکریی چیرۆکنووس. | حەسەن جاف |
| ١٥ـ کەشکۆلّی گیو ـ بەرگی دووەم. | پ : ئا: کوردستانی موکریانی |
| ١٦ـ یادداشت ـ ب ـ | رفیق حلمی |
| ١٧ـ یادداشت ـ ب ٢ ـ | رفیق حلمی |

### «ب» ★ کتێبە عەرەبی‌یەکان ★

| ژ | کتێبەکان | دانەرەکانیان |
|---|---|---|
| ١ـ | من هموم الحیاة | مسعود محمد |
| ٢ـ | شخصیات تتذکر: ج[1]. | طارق ابراهیم شریف |

### «جـ» ★ بلاّوکراوەی کاروان ★

| | |
|---|---|
| ١ـ دیوانی کامەران موکری. | پ.پ: عبد الله عزیز خالد |
| ٢ـ بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی. | حسین عارف |
| ٣ـ رۆژنامەی هەولێر باسی سەرهەلّدان و کۆتایی ١٩٥٠ـ١٩٥٣ | لێکۆلّینەوەی : محمود زامدار |

### «د» ★ بلاّوکراوەی ئەمینداری‌یەت :

| | |
|---|---|
| ١ـ سەرەکی فەرماندە صدام حسین وتێروانینەکانی بۆ گەلی کوردمان | لیژنەیەك. |



## ● کتێبە چاپکراوەکان ●

### «أ» ـ کتێبە کوردی‌یەکان :

### ١ـ چەپکی سێیەم لە دیوانی نووری :

ئەم کتێبـە بەشی سێیـەمی دیـوانی شیعرەکانی مامۆستا «شێخ جەلالی شێخ جەمیلی نەقشبەندی»یە؛ تاوەکو لاپەڕە «٥٢»ی بریتی‌یە لەو شیعرانەی کە خۆی دایناون و، زۆر لایەنی هەمەجۆری گرتۆتەوە؛ وەکو بابـەتی ئایینی‌و غەزەل و پێنـج خشتـەکی، لە لاپـەڕە «٥٢»ش بەولاوە بریتی‌یە لە گۆڕینی هەندێ لە مەثنەوی‌یەکانی جەلالەدینی ڕۆمی.

ئەم بەشـەی دیـوانی نووری «٩٠» لاپـەڕەی قەبـارە ناوەنجی «٥ر٢١×٥ر١٥سـم»ەو، لە چاپخـانـەی ڕۆشنبـیری‌و لاوان لە هەولێر چاپکـراوە؛ لە کتێبخـانـەی نیشتمـانیی لەبەغدا ژمارەی«٧٩٦»ی ساڵی «١٩٨٧»ی دراوەتێ‌و ، نرخی دیناریکە ، «١٥٠٠» دانەی لێ چاپکراوە.

ئەم کتێبە کاک عبدالستار عاصم بە خەتی دەست نووسیویەتی‌یەوە.

ئەوەی ڕاستی‌بێ ئەم کتێبە ساڵی «١٩٨٧» چاپکراوە؛ بەڵام کاتی خۆی درەنـگ بە دەستمـان گەیی، بۆیـە نەمانتوانی لەگەڵ کتێبەکانی ئەوساڵەدا باسی بکەین، بەهەرحاڵ ئەم کتێبە لەسەر ساڵی ١٩٨٧ حیساب دەکرێت.

### ٢ـ لە گەنجینەی کوردەواری:

دووەم بەرهـەمی بەڕێـز مولود قادر بێخـاڵیـەو، شەش بابـەتی سەرەکی گرتۆتەوە کە ئەمانەن: «بێری‌و مەڕو ماڵات بەخێوکردن، چارشەمە سووری، کۆسە بەبە، شەربەت و شەربەت فرۆشتن، ڕاوو جۆرەکانی، ژن بە ژنی، باڵۆرە». نووسـەر بەووردی ئەم بابـەتـانـە شی دەکـاتـەوەو، لەبارەیانەوە دەدوێ.

ئەم چاپکراوە «١٩٢» لاپەڕەی قەبارە ناوەنجی «٥ر٢١×١٥سم»ەو، لە چاپخـانـەی «أشبیلیـە الحدیثة» لە بەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمـانیی لەبـەغدا ژمارەی«٥٠»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٢٥٠ر١» فلسەو، دوو هەزار دانەی لێ‌چاپکراوە.

کاک «محمـد زادە»ی هونەرمەند نەخشەی بەرگی کێشاوەو، کاک «ناظم دڵبەند»یش سەرپەرشتی‌ی چاپکرنی کردووە.

### ٣ـ چەند گوتارەکێد ڕەخنەیی :

ئەم کتێبـەی برای نووسـەر کاک «أنور محمد طاهر» بریتی‌یە لە کۆمـەڵە ووتارێکی ڕەخنەیی کە بەشێکی ووتارەکانی لە هەردوو گۆڤاری کاروان و بەیاندا بڵاوکردوونەتەوە، پاشان لە دووتوێی بەرگی کتێبێکدا بەچاپی گەیاندوون.

ئەم بەرهـەمـەی کاک ئـنـور «١١٢» لاپـەڕەی قەبـارە ناوەنجی «٥ر٢١×١٦سم»ەو، لەچاپخانەی ڕۆشنبیری‌و لاوان لە هەولێر چاپکراوە؛ لە کتێبخـانـەی نیشتمـانیی لەبەغدا ژمارەی«١٥٧»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٧٥٠» فلسەو، دوو هەزار دانەی لێ‌چاپکراوە.

کاک «خالد الدوسکی» نەخشەی بەرگی کێشاوەو، خەتەکانی نووسیونەتەوە.

### ٤ـ زاراوەسازی پێوانە :

کتێبێکی بەسوودو پڕ لە چێژی زانیاری زمانە کە مامۆستا «مسعود محمد» لە سەر ئەرکی ئەمیندارێتی گشتی‌ی ڕۆشنبیری‌و لاوانەوە بەچاپی گەیاندووە، ئەم بەرهەمەی نووسەر کە لەبەرێکی باش لە بواری زانیاری زمانەوە پڕ دەکاتەوەو، زەمینەیەکی لەبارجۆ ئەو کەسانە ساز دەکا کە لە

زانستی‌ی زمان دەکۆڵنەوە.

کتێبەکە «٤٤٨» لاپەڕەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×٥ر١٦سم»ەو، لە چاپخانەی «سۆمر» لەبەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی لەبەغدا ژمارەی«٣٨٠»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی دوو دینارو نیوەو، سێ هەزار دانـەی لێ‌چـاپکـراوە. کاك «نـاظم دڵبـەنـد»یش سەرپەرشتی‌ی لەچاپدانی کردووە.

## ٥ـ بەشێك لە چوارینەکانی بێ‌بەش :

بەشێکی دیکەی چوارینەکانی مامۆستا «مەلا مەسعود بێ‌بەش» شاعـیرە، لەم بەشەدا کاك محمود زامدار بەسێ لاپەرە «بەرایی»و، دوو لاپـەرە «کـۆتایی» خوێنەر لەگەڵ بێ‌بەشی شاعیردا ئاشنا دەکات. کاك زامدار لە لاپەرە «٥»ی بەرایی‌یەکەدا دەڵێ:

«مـایـەوە ئەوە هەڵ نەبـوێـرم و بڵێم: ئەمـەشیـان هەر هەمـوو چوارینەکانی «بێ‌بەش» نین، چونکە بەشێکی باشی ئەو چوارینانە کە لە چوارچێـوەی «داشـۆرین ـ هەجوو» دان کەوتۆتە نێو ئەرشیفی منەوەو لەرۆژی ئەمرۆدا قابیلی بڵاوکردنەوە نین».

ئەم دیـوانـەی بێ‌بـەش «١١٢» لاپـەرەی قەبـارە ناوەنـجـی «٥ر٢١×١٦سم»ەو، لەچاپخانەی رۆشنبیری‌و لاوان لەهەولێر چاپکراوە؛ لە کتێبخـانـەی نیشتمـانیی لەبـەغـدا ژمارەی«٤١٤»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٧٥٠» فلسەو، دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە

کاك «محمد زادە»ی هونەرمەند نەخشەی بەرگی کێشاوەو، کاك «سیروان بکر سامی»یش سەرپەرشتی‌ی چاپکردنی کردووە.

## ٦ـ ئافرەت لە قورئاندا :

ئەم کتێبـە ئاینی‌یەی مامۆستا «عبدالرحمن قادر یونس» هەشت باسی سەرەکی گرتۆتەوە جگە لە پێشەکی‌یەکی نووسەر کە لە سێ لاپەرەدا خەستی کردۆتەوە.

نووسەر بەووردی دەربارەی ئافرەت دەدوێ بەر لەهاتنی ئایینی ئیسلام و دوای هاتنی و، ئەو ماف و ئەرکانەی لە ئەستۆی‌دان بەرامبەر بە خۆی‌و ئایین و هاوسەرەکەی‌و، چونیەتی رەفتارکردنی لەنێو کۆمەڵدا.

ئەم کتێبە «١٢٠» لاپەرەی قەبارە ناوەنجی «٢١×١٥سم»ەو، لە چاپخانەی رۆشنبیری‌و لاوان لە هەولێر چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانی لە بەغـدا ژمارەی «٥٠٧»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٧٥٠» فلسەو، دوو هەزار دانەی لێ‌چاپکراوە.

کاك «سـیروان بکـر سامـی» نەخـشـەی بەرگـی کێشـاوەو، سەرپەرشتی‌ی چاپکردنی کردووە، «عەزیز رەشید حەیری»یش دەرهێنانە هونەری‌یەکەی ئەنجام داوە.

## ٧ـ مەولودنامەو بروانامەی دەشتی :

بەرهەمێکی تری ئایینی‌یە، لەسەر ئەرکی ئەمینداریتی گشتی‌ی رۆشنبیری‌و لاوانەوە لەچاپدراوە.

ئەم مەولوودنامەو بروا نامەیە «مەلا خدر ئەحمەد عەبدوڵلا» کە لەساڵی «١٣٦٧»ی کۆچی‌و، «١٣٧١»ی کۆچی دایناوە، کاك «موحەمەد دەشتی» رێکی داوەتەوەو پێشەکی بۆ نووسیوە. بریتی‌یە لە دوو بەش، بەشی یەکـەمی تەرخـان کراوە بۆ «مـەولود نامـە» کە، بەشی دووەمیشی بروانامەکەیەتی کە لە لاپەرە «٨١»ەوە دەست پێ‌دەکات.

ئەم چاپـکـراوە «١٠٤» لاپـەرەی قەبـارە ناوەنـجـی «٥ر٢١×٥ر١٥سم»ەوە، لە چاپخـانـەی رۆشنبـیری‌و لاوان لە هەولێر چاپکـراوە؛ لە کتێبخـانـەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارەی«٥٠٨»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٧٥٠» فلسەو، هەزار دانەی لێ‌چاپکراوە.

کاك «محمـد زادە» نەخشەی بەرگی کێشاوەو، کاك «عبدالکریم دەشتی»یش سەرپەرشتی‌ی چاپکردنی کردووە.

## ٨ـ داستانا گلگامێشی :

بەرهـەمێکی دیکـەی وەرگـێردراوی بەپێـزە مامۆستای نووسەر «سـەلاح سەعـدلا» لە زمـانی عەرەبی‌یـەوە کردوویـە بەکـوردی، بۆ وەرگـێرانـەکـەیشی کتێبـەکەی نووسەرو مێژوونووسی خوالێخۆشبوو «طه



باقرەی هەڵبژاردووەکە بە زمانی عەرەبی بڵاوی کردووەتەوە، وێڕای چەند سەرچاوەیەکی دیکەیش کە بە زمانی ئینگلیزی لەبارەی ئەم داستانەوە بڵاوبوونەتەوە.

ئەم داستانە مێژوویی‌یە کە بەزمانی کوردی‌و شێوەی کرمانجی‌ی سەروو چاپکراوە «٢٢٨» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×١٧»سم»ە‌و، لە چاپخانەی «دار الحرية» لەبەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٢٠٠»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی «١٥٠٠» فلسە‌و، «٣٠٠٠» دانەی لێ چاپکراوە.

وەرگێڕ هەر خۆی سەرپەرشتی‌ی چاپکردنی کتێبەکەی کردووە، کاک «محمد عارف»ی هونەرمەندیش نەخشەی بەرگەکەی کێشاوە.

## ٩- وەرنە ئەڤینێ :

کۆمەڵە شیعرێکی شاعیری لاو «سەلمان کوڤلی»یە، کە بە شێوە زمانی کرمانجی سەروو نووسراونەتەوە‌و، لە بەرگێکی خنجیلانەدا کۆکراونەتەوە.

وەکو بە سیمای شیعرەکانەوە دیارە، شاعیر تەنها لە بابەتێکەوە دەدوێ کە ئەویش ئەڤینداری‌یە، هەربۆیەشە بانگەوازی ئەوە رادێڵێ کە لەگەڵیا بەرەو ئەڤین و ئەڤینداری بەرێ کەوین و، ئێمەیش لەگەڵ ئەودا توێشەبەرەی ئەو سەفەرە هەڵگرین و، بەرەو ئەو دونیا پان و بەرینە بکشێین و خەمی دڵ بکەینە مووروی گەردانەی عیشق و بیکەینە کلی ئەڤیندارانەوە.

ئەم بەرهەمەی شاعیر «١٥٢» لاپەرەی قەبارە ناوەنجی «٢٢×٥ر١٥»سم»ە‌و، لە چاپخانەی رۆشنبیری‌و لاوان لە هەولێر چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی لە بەغدا ژمارەی «١٢٢٥»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی «٧٥٠» فلسە‌و، «١٥٠٠» دانەی لێ چاپکراوە.

کاک «سیروان بکر سامی» نەخشەی بەرگەکەی کێشاوە‌و، سەرپەرشتی‌ی لە چاپدانیشی کردووە.

## ١٠- گوڵ و رووەکە جوانەکان لەناو ماڵ دا :

ئەم چاپکراوەیش دوو برای بەڕێز، کاک «مصلح محمد سعید»و کاک «ساماڵ جلال عمر» دایان ناوە، بەم کارەیشیان کە لەبەرێکی دیکەی کتێبخانەی کوردی‌یان پڕکردووەتەوە .. ئەم دوو برایە لە پێشەکی‌ی کتێبەکەدا دەڵێن:

«گوڵ و رووەکە جوانەکان بەشێکی گرنگیان داگیر کردووە لە بەروبوومە کشتوکاڵی‌یەکان و بەرهەمەکەی. لەم ڕۆژانەشدا کە وڵاتە خۆشەویستەکەمان بەرەو پێشکەوتن دەڕوات و شان بەشانی وڵاتە پێشکەوتووەکان گرنگی داوە بە هەموو جۆرە زانیارییەک، خەڵک چاوی کراوەتەوە‌و لەزۆر زانستی تێگەیشتووە بەتایبەتی بێستان زانی‌و بەخێوکردنی گوڵ و رووەکە جوانەکان کە ئێستا خۆیان پێوە خەریک کردووە، ئایا بۆ سوود لێوەرگرتن بێت وەکو کاسبی یا تەنها بۆ کات بەسەربردن».

ئەم کتێبە «٥٦٢» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٥ر٢٣×٥ر١٦»سم»ە‌و، لە چاپخانەی «حسام» لە بەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٣٧٨»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێ‌و، نرخی «دوو دیناروو نیوە»و، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاک «ئازا حسیب قەرەداخی» نەخشەی بەرگەکەی کێشاوە‌و، کارە هونەری‌یەکانی ئەنجامداوە. «ناظم دلبەند»یش سەرپەرشتی‌ی چاپکردنی کردووە.

## ١١ـ ديوانی بێبەش :

بەرگی سێیەمی دیوانی «مەلا مەسعود بێبەش»ی شاعیرە، کە بەشێکی زۆری لە شعیرە ئاینیو نیشتمانیو کۆمەڵایەتی‌یەکانی شاعیری گرتۆتەوە.

لە لاپەرە «١» تا لاپەرە «٤»، کاك سەعید یەحیا بەناوی «بەرکوڵ» پێشەکی‌یەکی بۆ دیوانەکە نووسیوە تیایدا پەنجەی بۆ ئەوە درێژ کردووە کە بێبەش چەند لە شیعری «هەجو» داشۆرین دا سەرکەوتووە، هێندەیش لە شیعری کۆمەڵایەتیو نیشتمان پەروەریو ئاینی‌دا سەرکەوتووە..

ئەم دیوانەی بێبەش کە «عبدالکریم رمضان»ی خۆشنووش بەخەتی دەست رازاندوویەتی‌یەوە، «٢٠٠» لاپەرەی قەبارە ناوەنجی «٥ر٢١×٥ر١٦سم»ە، لە چاپخانەی «رۆشنبیریو لاوان» لە هەولێر چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانی بەغدادا ژمارەی «١٣٨٣»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێو، نرخی «٧٥٠» فلسەو، دوو هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاك سیروان بکر سامی نەخشەی بەرگی دیوانەکەی کێشاوەو، سەرپەرشتی‌ی چاپکردنیشی کردووە.

## ١٢ـ رەخنەی شانۆیی :

ئەم بەرهەمەی کاك «محسن محمد»، دوو ووتاری رەخنەیی گرتۆتە خۆ کە کاتی خۆی نووسەر دەربارەی شانۆگەری‌ی «سروودێکی خۆشەویستی»و، شانۆگەری‌ی «شار» نووسیونیو، بڵاوی کردوونەتەوە؛ ئەمجارەیان لەگەڵ سەرەتایەکی کورتیلە لە دوو توێی بەرگی نامیلکەیەکدا بەناوی «رەخنەی شانۆیی‌یەوە» بڵاوی کردوونەتەوە.

ئەم چاپکراوە «٤٤» لاپەرەی قەبارە ناوەنجی «٢١×٥ر١٤سم»ە، لە چاپخانەی رۆشنبیریو لاوان» لە هەولێر چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٣٨٥»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێو، نرخی «٥٠٠» فلسەو، هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاك سیروان بکر سامی سەرپەرشتی‌ی چاپکردنی کردووە، «عەزیز رەشید حەریری»ش کارە هونەری‌یەکانی ئەنجامداوە.

## ١٣ـ بۆ کابانیا ماڵێ :

دیاری‌یەکی خنجیلانەی هەمەرەنگی خوشکە «ماجدة محمد علي قازی»یەو، لایەنێکی گرینگی ژیان و هەڵس وکەوت و رەفتارو کارو پیشەی کەیبانووی ماڵی گرتۆتەوە، کاك «سگڤان عبدالحکیم» لەژێر ناوی «گوتنەك پێدڤی» پێشەکی‌یەکی دوو لاپەرەیی بۆ نووسیوەو، نووسەرو کارەکەی بەخوێنەران ئاشنا دەکات.

خوشکە «ماجدە»، ئەم بەرهەمەی خۆی پێشکەش بە دایکی خۆی دەکات و، دەڵێ:

«دیاری، بۆ دەیکا من.. ئەوا ژین و حەژیکرن و بەرمالی نیشا من دای.».

ئەم کتێبەی نووسەر «٩٢» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٣×١٧سم»ە، لە چاپخانەی «حسام» لەبەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٤٠٨»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێو، نرخی «٧٠٠» فلسەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

کاك «ئازا حسیب قەرەداخی» نەخشەی بەرگی کتێبەکەی کێشاوەو، کارە هونەری‌یەکانی ئەنجامداوە، «ناظم دڵبەند»یش سەرپەرشتی‌ی چاپکردنی کردووە.

## ١٤ـ کامەران موکریی چیرۆکنووس :

ئەم کتێبەی چیرۆکنووس «حەسەن جاف» بریتی‌یە لە لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی لایەنێکی تری گەش و بەهرەداری ژیانی شاعیری نەمر مامۆستا «کامەران موکری»، کە ئەویش چیرۆکنووسینە..

**لێکۆڵینەکە بەم جۆرە دابەش کراوە:**

- **ناوەرۆکی چیرۆکەکانی کامەران .**
- **وێنەی هونەری لە چیرۆکەکانی کامەراندا.**
- **تەکنیك لە چیرۆکەکانی کامەراندا .**
- **دەقی چیرۆکەکان؛ کە بریتی‌یە لە شەش چیرۆکی شاعیری خوالێخۆشبوو موکری.**

ئەم کتێبەی نووسەر «١٠٨» لاپەرەی قەبارە گەورەی «٢٣×١٦سم»ە، لە چاپخانەی «سومر» لە بەغدا چاپکراوە؛ لە کتێبخانەی نیشتمانیی بەغدادا ژمارەی «١٤٣٨»ی ساڵی «١٩٨٨»ی دراوەتێو، نرخی «٧٥٠» فلسەو، سێ هەزار دانەی لێ چاپکراوە.

دەرهێنانی هونەریو، نەخشەی بەرگ کاك ئازا حەسیب قەرەداغی ئەنجامی داوون.

